# کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند

## بەشێک لە مێژووی رزگاریخوازی گەلی کورد


نووسینی

**دارا ئەحمەد کەریم بەگ**



چاپی یەکەم

2001

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
كوردستان/هەولێر ت. (٢٢٢٩٩٩٢)

e.mail:mukriani@yahoo.com

■ کتێبی ژمارە: (٤٣)

■ کتێب: کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند
بەشێک لە مێژووی ڕزگاریخوازی گەلی کورد

■ نووسینی:دارا ئەحمەد کەریم بەگ

■ هونەرکاری: قاسم قادر

■ چاپی یەکەم: هەولێر - ٢٠٠١

■ ژمارەی سپاردن (١٧٦)ی ساڵی ٢٠٠١دراوەتی.

■ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە / هەولێر

پێشکەشە:

- بە گیانی پاکی کەریم بەگ
- جوامێرا اغای هەمەوەند
- فەقێ قادری شاعیر
- ئەوانەی گیانیان بە نسیب خاکی غەریبی بوو لە باکووری ئەفریقیا

# پێرست

# پێشەکی

-١-

لەدوای جەنگی چالدێران (١٥١٤)، ئەگەر کێشەی نەتەوایەتی کورد بەووردی لێک بدەینەوە لەڕووی چوارچێوە هەرە تەسکەکەی میکرۆی مەسەلە سیاسییەکە دەبینین کورد سەربەخۆ بووەو میرو خان و پاشاو سەردارو والی و ئاغای کورد فەرمانڕەواییان لەناوچە جوگرافییە جیاوازەکانی کوردستاندا کردووە، بەڵام لەڕووی چوارچێوە فراوانەکەی، واتە دەوڵەت بەمانا سیاسی و دیپلۆماسییەکەی وڵاتی کوردەواری بەشێک بووە لە دوو دەوڵەتەکەی عەجەم (سەفەوی و قاجار) و تورک (عوسمانی) تا پاش جەنگی یەکەمی گیتی (١٩١٤-١٩١٨). شاعیر و ڕۆشنبیری گەورەی کورد حاجی قادری کۆیی دەڵێ:

لەمابەینی کڵاوسوور و کڵاوڕەش
پەریشان و دیارن میسلی گای بەش

ئەو کڵاو سوور و کڵاوڕەشەی حاجی فەرموویەتی مەبەس تورک و عەجەمە، ئەمانە دەوری باڵایان بووە لەوێران کردنی کوردستان لەماوەی پێنج سەدەی رابردوودا، چونکە سنووری دەوڵەتیان لەناو جەرگەی کوردستان بوو و تا جەنگی یەکەمی گیتی کرد بووی بە دووبەش، کوردستان سنوورێک بوو بە درێژایی مێژوو هێمنی و ئارامی بەخۆیەوە نەدی بوو لەبەر چاوچنۆکی و بێ بەختی هەردوو لایان.

بەراستی هێرشی هەمیشەیی هەر لایێکیان بۆ سەر ئەوی تر لە پێناوی بەرژەوەندی و چاکەی خۆی و ماڵ وێرانی کوردی تێدابوو.

بەم پێیە خاکی کورد بوو بە مەیدانی خوێن ڕشتن و قوربانیدان، سەرکەوتن و ژێر کەوتنی هەر لایێکیان بووە مایەی زیان و غەم و پەژارەی ئادەمیزادو کاول بوونی خاک و هیچ قازانجێکی بۆ کورد نەبووە.

من نازانم تیۆریی «مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە» بەگشتی ڕاستە یا نا؟! بەڵام ئەوە دەزانم خۆی دووبارە بکاتەوە یانەکاتەوە، مەسەلەیێکە کۆنەو هەمیشە لەئاوەودیە بۆ کورد، هیچ نەبێ لەپاش چالدیرانەوە کێشەکە کەوتۆتە ناوەوە و کڵاوسوور و کڵاوڕەش تۆپ تۆپێنێی پێ دەکەن. شاوورەکە بەدەست زلهێزدوەیە، بێ گومان ئەم یارییە بێ ئەنجام دەبێ و چاکەی کوردی تێدا نابێ، چونکە بە درێژایی مێژوو کڵاوسوور و کڵاوڕەش لەجەنگدا یا لە یاری کردندا هەر کامێکیان سەرکەوت بێ یا ژێرکەوت بێ تەنیا زیانی کوردی تێدا بووە، ئەگەر تۆپ تۆپێنەکە لەنێوان تیپی کورد و کڵاوسوور، یا کڵاوڕەش بووایە و دیسانەوە شاوورەکە بەدەست زلهێزی گێتییەوە بووایە مەسەلەکە بە جۆرێکی تر دەکەوتەوە، گومانم لەودا نییە لەگەڵێ جەنگدا کورد دەیدۆڕاند بەڵام جارێک هەر دەیبردەوە و کێشەکە بەم جۆرە دوا نەدەکەوت.

-٢-

بەدرێژایی ڕۆژگارانی چوار پێنج سەدەی دوایی ناوچەکانی سەر بە ئێران یا عوسمانی میرنشینی کوردی تێدا بووە، خەڵکی کوردی ئەو ناوچانە پێوەندییان بە فەرمانڕەوای کوردەوە بووە. فەرمانڕەوا لە هەموو کاروبارێکدا بەرەوڕووی سوڵتانی تورک و شای عەجەم بۆتەوەو سەرانەی خۆی داوە و بۆ ماوەیێک ئاسوودەو بێ گێرمە و کێشە ژیاوە. لەهەندێ ناوچەی شاخاویی چڕ، یا داخراو، یا دوور لە پایتەختی ڕۆم و عەجەم، ئاغای کورد سەری شۆڕ نەکردووە بۆ هەموو

داوایێکی دەســەڵات بەدەست، ئیــتــر بە هەرشێـوەیێک بێ هەندێ ســەرداری عەشیرەت و بنەماڵەکانی کورد وا بۆیان ڕەخساوە ناوە ناوە دەسەڵات لەگەڵیاندا تەبانەبێ، بۆیە ئەمــانە بە «ڕێگر» و «جـەردە» و «چەتە» و شــتی تری لەم بابەتەوە تاوانبار کراون، ڕەنگە ئەم سیفەتانە لەڕووی زمانەوانییەوە ڕاست بێ بۆ کردەوەی ئەو کەسانە، بەڵام ئەم ڕێگرییە بەرامبەر بەکێ کراوە؟ بەرامبەر بەچ دەسەڵاتێک کراوەو بەچاوی مێژووەوە چۆن لێک دراوەتەوە؟

ئەگەر کۆمەڵە کەسێکی کورد دەست درێژییان بەرامبەر بە دەسەڵاتی عوسمانی یا قاجار کردبێ لە ئەنجامی چەوساندنەوەی کورد بووە وەکو نەتەوەیێک، کەوابێ یا دەبێ ماف هی خەڵکە هەڵساوەکە بێ یا هی دەسەڵات بێ، بێ گومان بە هیچ جۆرێ ناتوانرێ وا زەن بکرێ هەڵسانی هەر کەسێکی کورد بەرامبەر دەستدرێژی دەسەڵاتی دەوڵەت بەتاوان حسێب بکرێ، ئەگەر وابێ ئەوکاتە ماف هی دەسەڵات دەبێ.

-٣-

کۆمەڵە کەسێک، یا عەشیرەتێک، یا بنەماڵەیێک لەناوچەی چەمچەماڵ و دەشتی بازیان دەژین، ناویان بە «هەمەوەند» ڕۆیشتووە، مامۆستامان تۆفیق وەهبی دەربەندی بازیانی بە دەروازەی کــوردســتــانی ناوەڕاست داناوە، ئەم دەروازەیە سەنگەرێکی گرنگ بووە لە ستراتیجی هەموو ئەو شەڕو شۆڕانەی بەدرێژایی مێژوو لەم ناوچەیە روویان داوە.

هەمەوەندەکان لەو دووسەد ساڵەی دواییەدا لەسەر شانۆی مێژووی بەسەرهاتی کوردستانی باشوور (کوردستانی عێراق) دەورێکی بالایان بووە.

مێژوو گەلێ ڕووداومان بۆ دەگێڕێتەوە لەبارەی ئەم کۆمەڵە کەسانەوە لە ڕووی ئازایی و جەسووری و نەترسی و ڕووبەڕوو بوونیان بەرامبەر بە دوژمن و دەسەڵاتە تۆتالیتارییەکەی عوسمانی.

پێم وایە زانیاریی سەرزاری و گێڕانەوە لەبابەت هەمەوەندانەوە گەلێ زیاترە

لەو هەواڵ و دەنگوباسانەی کە بە نووسین تۆمارکراون و لەکتێب و رۆژنامە و گۆواردا بڵاو کراونەتەوە، من بەش بەحاڵی خۆم هەر لەمنداڵییەوە گەلێ گێرانەوەم لەپوورە بەتەمەنەکانم بیستووە لەبارەی هەمەوەندانەوە، ئەوانیش لەنزیکەوە شارەزای ناوچەکانی هەمەوەند بوون کە لە ئەو بەری ژیی بچووک دەژیان و باپیری من و کەس و کاریان لەئەم بەری ژیی بچووک دەژیان، دیارە پەیوەندی توندیش لەنێوان هەر دوو لادا بووەو سەرو سەربردەیان رەنگە ببێتە سەرچاوە بۆ نووسینەوەی کارێکی مێژوویی یا ئەدەبی.

-٤-

لەم دواییەدا کاک دارا هەمەوەند رێزی لێ نام و پرۆژەی نووسینەوەی ئەم کتێبە و تۆماری بەشە نووسراوەکانی خستە بەردەستم. بە پێی توانا یارمەتیم پێشکێش کرد لەبابەت سەرچاوەوە لە پێناوی سەرکەوتنی کارەکەی لەرووی زانستییەوە، تا گەیشتە ئەو پلەیەی ئێستا کتێبەکە دەکەوێتە دەست خوێنەرو خوێندەوارانی کوردەوە.

ئەوەی راستی بێ ئەوەیە ئەگەر مێژووی ژیانی تاکە کەسێک، یا هۆزێک، یا بەسەرهاتی هەرێمێک یا ناوچەیەیک خشتێک بێ لە بناغەی گشتی مێژووی نەتەوە، دەڵێم دانەر توانیویەتی ئەو خشتە بخاتە ناو بناغەکەوە بەتایبەتی کە پشتی بە سەرچاوەی تۆمارکراوەوە بەستووە، ئەگەر چی بەلای منەوە سەرچاوەی سەرزار نرخی لەهی تۆمارکراو کەمتر نییە، بەتایبەتی لای ئێمەی کورد، چونکە گەلێ کاروباری ژیانی کۆمەڵایەتی و خوێندەواری و ئەدەبی و هونەری و بەسەرهاتی نەتەوایەتیمان تۆمار نەکراوە، تۆمارکردن قازانجی هەیە و زیانی نییە. دەڵێن پێویستە ئەو رووداوانەی دەیانگێرنەوە رەسەن بن و دروست کراو نەبن، ئەمەیان راستە، لەوانەیە ئەو هەواڵانەی گومانیان تێدا هەیە بۆ مێژوو لەبار نەبن، بەڵام رووداوی دروست کراو لە لایێکی ترەوە دەبێتە سەرچاوە بۆ کاری داهێنانی ئەدەبی و هونەری.

لەبەر ئەوە ئامۆژگاریم بۆ کاک دارا و هەمەوەندانی تر ئەوەیە هێشتا ماوەی ئەوە لە بەردەست دایە تۆمارکردنی هەموو حیکایەت و رووداوو سەروسەر بردەیێک لەزاری بەتەمەنەکانی عەشیرەت وەربگیرێن، هیچ نەبێ هەندێکێ لەمانە دەبنە لایەنی مێژووی ئەفسانەیی عەشیرەتەکە، چونکە ئەوەی گومانی تێدانییە ئەوەیە هەموو نەتەوەیێک و میللەتێک و گەلێک لەتیرەو عەشیرەت و کۆمەڵە خەڵک دوو مێژوویان هەیە، یەکەمیان مێژووی رووداوی ڕاست، دووەمیان مێژووی رووداوی ئەفسانەیی دروست کراو. لەبەرئەوەیە ڕۆمانەکانی کۆن و ئیتالییەکانی ئێستا شانازی بەوەوە دەکەن کە ئەوەی کوڕ و کچێکی ئەوزادی تازە لەدایک بوون و لەدارستاندا گورگ بەخێوی کردوون، بۆیە تەندروست و بەهێز و تواناو ژیر و ئازا کەوتنەوە. نازانم هەڵوێستی کوردێکی لای ئێمە چۆن دەبێ ئەگەر یەکێک بڵێ کورد لە جنۆکە لەدایک بوون، یا لە رزگارکراوەکانی جوتە مارەکەی سەر شانی زوحاکن!

-٥-

لەم کتێبەدا رەچاوی دوو جۆرە ڕێبازی نووسینەوەی مێژوو کراوە، یەکەمیان ڕێبازی دۆکومێنتی واتە پشت بەستن بە سەرچاوەو دروست کردنی پەراوێزو پەنجە درێژکردن بۆ ئەو کەرەستانەی لەم رووەوە پێش ئەم کتێبە هاتوونەتە ناو نامەخانەوە، هەرچەندە ئەم سەرچاوانە کەمن بەڵام دانەر توانیویەتی ئەگەر بەسەر هەموویشیاندا زاڵ نەبووبێ بەشی هەرە زۆری دەور کردۆتەوە.

دووەمیان ڕێبازی گێڕانەوەی سەرزارە، ئەمەشیان هەرچەندە گومان لەهەندێ گێڕانەوە بکرێ و بەناماقووڵ لە قەڵەم بدرێ، زۆربەیان بەڕاست دەکەونە بەرچاو و لێکۆڵینەوەکە دەوڵەمەند دەکەن.

ئەمەو دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ ئەوکاتە دەمێکە بەسەرچووە بەیەک لایی و ئاسایی و سەرپێیی تەماشای هەموو بەرهەمێکی زانستی و ئەدەبی و هونەری

بکەین. واتە هەر بەرهەمێک ئەگەر کەمو کوورییێکی کەمیشی تێدابێ چاکە زۆرەکە بەدەردی خراپە کەمەکە ببەین. ئێمە تەماشای هەر شتێک بکەین بەگشتی یا هەمووی باشە یا هەمووی خراپە، ئەمە لەبیرکردنەوەی ساکارەوە هاتووە، هەندێ کەس بەزادەی ڕۆژهەڵاتی دەزانن. نابینی چەند سەیرە، ڕۆژئاواییێک، یا کوردناسێک کتێبێک لەسەر کورد بنووسێ زۆربەی هەرە زۆری پێداهەڵدان و ستایش بێ، ئەگەر بیرو ڕاییێکی دیاری کراوی ئەو ئەورووپاییە بەدڵمان نەبێ هەموو چاکەکە دەسڕینەوەو جنێوی پێ دەدەین. ئەمە خوو و ڕەوشتێکی دواکەوتووە، پێویستە شتی وا روونەداو بەجۆرێکی تری شارستانییانە بیربکەینەوە.

-٦-

لەبابەت ئازایی و جەربەزەیی و سوارچاکی هەمەوەندانەوە وەک وترا، گێرانەوەو حیکایەت زۆرن، کەمیان تۆمارکراوون و زۆریان ماوون، تۆمارکردنیان دەبێتە سەرچاوەیێکیتر بۆ دەرخستنی ڕاستی مێژووی ئەم عەشیرەتەو مێژووی گشتی سیاسی نەتەوەی کورد.

مەسەلەی ئاوارەکردنیان بۆ باکووری ئەفەریقا و بەتایبەتی بۆ لیبیا داستانێکی بێ هاوتایە، ڕەنگە لەگۆمەڵی کوردەواریدا خەڵکی زیاتر لەم داستانە بگەن چونکە ڕووداوی لەم بابەتە لەپێش ئەم مێژووە زۆرە، وەکو ئاوارەکردنی کوردی ناوچەی کوردستانی ڕۆژهەڵات بۆ خۆراسان لە دەوروبەری فەرمانڕەوای نادرشا (١٦٨٨-١٧٤٧). هەروەها لەپاش ئاوارەکردنی هەمەوەندەکان بۆ باکووری ئەفەریقیا داستانی لەم بابەتە ڕووی داوە، وەکو ئاوارەکردنی کوردی کوردستانی تورکیا لەسییەکانی ئەم سەدەیە بۆ ناوچەی قۆنیەو ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ. هەر لەم ڕووەوە پێویستە ڕێرەوی بارزانییان بۆ یەکێتیی سۆڤیەتی ئەوسەردەمە لە ساڵی ١٩٤٧یشمان لەبیر نەچێتەوە.

لەبارەی داستانی ئاوارەکردنی هەمەوەندان بۆ دەرەوەی مەڵبەند و زێدی باب و باپیرانیان کوردناسی ناودار سی.جی. ئیدمۆندز دەڵێ:

«لەدوای شکانی هەمەوەند بۆ ماوەیێکی وەختی، لەئێران ڕایان کرد و گەڕانەوە بازیان، تورکە عوسمانییەکان هەموویان گرتن، نیوەیان ئاوارەی باکووری ئەفەریقا کرد و نیوەکەی تریان بۆ (ئەدەنە)، هەر دوو جێگە بۆماوەی ٥٠٠ میل بەهێڵی ڕاست لەبازیانەوە دوورن. گەڕانەوەی جەنگاوەران بەخۆیان و خێزان و منداڵانیان لە باکووری ئەفەریقاوە بۆ بازیان لە ساڵی ١٨٩٦ واتە دوای حەوت ساڵ لە ئاوارەیی بەگەورەترین داستان دەژمێررێ لە مێژووی جموجۆڵی عەشیرەتان لە ناو کوردەواریدا. هەروەها ئاوارەبووەکانی (ئەدەنە)ش لاسایی براکانیان کردەوە، ملی ڕێگەیان گرت بەتەنیاو بەبێ ماڵ و منداڵیان، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی لە دواییدا بەوە رازی بوو ژن و منداڵیان بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان بۆ ئەوەی رزگارییان بێ لەسەریەشەی تر». (بنوارە: سی.جی. ادموندز، کرد و ترک و عرب،ترجمە جرجیس فتح الله، بغداد، ١٩٧١، ص٤٣-٤٤).

-٧-

ئەم کتێبە تۆمارێکە هەندێ لە بەسەرهاتی عەشیرەتی هەمەوەند بەگشتی و دەوری کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند بەتایبەتی ڕوون دەکاتەوە. لەوە دڵنیام کتێبەکە دەبێتە سەرچاوەیێکی تر بۆ مێژووی بەسەرهاتی نەتەوەی کورد.

سەرکەوتن بۆ دانەری ئەم تۆمارە دەخوازم.

**د. مارف خەزنەدار**
هەولێر: مەڵبەندی ڕووناکی
١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨

# پێشەکی نووسەر



ڕەحمەتی خوا لە (حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغای هەمەوەند) بێت کە لەساڵی ١٩٣٢ لەگەرمەی یادو بیرەوەرییەکانی کەریم بەگ و کێشەو میحنەتەکانی هەمەوەندا پوختەیەکی مێژووی هەمەوەند و باسی کەریم بەگی بۆ بەجێ هێشتووین. لەدوای خۆی، ئەمە سەرچاوەو دەستنووسێکی دانسقەیەو زانیاری نوێی تیایەو گەرم و گوڕی خوێندەوارانی هەمەوەند دەگەیەنێت کە چەند بەخەم نووسین و داڕشتنی مێژووی پڕ لەسەروەری باوک و باپیرانیان بوون. بەتایبەتیش ئەگەر ئەم سەرچاوەیە لە حەیدەر ئاغاوە دوو کەسی تر دووبارە نووسیویانەتەوەو دەست بەدەست پاراستوویانە، هەتا گەیشتۆتە دەست ئێمە.

کاتی خۆی لەساڵی ١٩٥٣دا کاک عەبدوڵلای کوڕی دووبارە نووسیویەتیەوە، دوا کەسیش کە ئێستا لەژیاندا ماوە (نەجمەددین فەتاح نەسرەددین)ە کە لە ساڵی ١٩٨٩دا بۆ نەوەی تازە دووبارە نووسیویەتییەوە.

دەستنووسەکەی (کاک نەجمەددین)مان لەبەردەستدا بوو کە بریتییە لە چەند زانیارییەکی ورد سەبارەت بە هەمەوەند و هاتنیان بۆ ناوچەکەو دواتر کۆچ کردنیان بۆ باکووری ئەفریقیاو بەشێک لە بەسەرهاتی کەریم بەگ و بەشداری لە شۆڕش.

گەلێک سەرچاوەی مێژوویی هەن کە باس لە عەشیرەتی هەمەوەند و کەریم بەگی هەمەوەند دەکەن، بەڵام داخی گرانم هەموو بەپەرتوبڵاوی و پچڕپچڕی باسیان کردووەو نەخراونەتە ناو چوارچێوەی کتێبێکی سەربەخۆو پوخت، کە هەر هیچ نەبێت وەفایەک بێت بۆ کەریم بەگ و خوێنەری کوردیش ئاشنا بکات بە کەسایەتی سیاسی و عەسکەری و کۆمەڵایەتیی کەریم بەگ و بنەماڵەو هۆزە

جوامێرەکەی و خەڵکی چەمچەماڵ و بازیان.

خوای گەورە کاک نەجمەددین تەمەن درێژ بکات کە لە سەرەتای دەستنووسەکەی حەیدەر ئاغا دەڵێ: (ئیمرۆ ١٥ی سەفەر ساڵی ١٤١٠ کۆچی ١٩٨٩/٩/١٥ دەستم بەنووسینەوەی کتێبەکەی خوا لێ خۆش بوو حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغا کرد کە لە مێژوو و داستانی عەشیرەتی هەمەوەند زۆر شارەزا بووەو لە کەسانی لە خۆی گەورەتر وەریگرتووە. بۆیە تکام وایە کە نەوەی داهاتوو زۆر ئاگاداری ئەم یاداشتە پیرۆزە بێت کە لە باپیرە گەورەمانەوە بەجێ ماوە، نابێ بەهیچ جۆرێک دەستکاری بکرێ و زیادو کەمی لێ بکرێ بەتایبەتی شەجەرەکە کە تایبەتە بە بەگزادەی هەمەوند لە خواگە شەلەود هاتۆتە خوارەوە. ئێوەش ئەگەر کوڕی ئەم پاڵەوانانەن نەبێ بۆ خۆتان مێژوو دروست کەن و زیادی کەن ئەم یاداشتە ئیستر ئاواتم ئەوەیە هەرکەسێ لەتوانایدا بێت و ئاگاداری داهاتوو بێت رابردوو نەفەوتێنێ).

هەر لەناو ئەو دەستنووسانەدا چەند شیعرێکی سابیر بەگ هەیە کە بە شیعر نووسراوەتەوەو زانیاری تیایە لەسەر شەڕەکان و داستانی خۆی و کەریم بەگی بەهۆنراوە هۆنیوەتەوە. زۆر هەوڵمان داوە پشت بە زانیاری تازە وبڵاونەکراوە ببەستین چ دەستنووس و چ ئەوەی نەنووسراوەتەوە.

سەبارەت بە زانیاریی بڵاونەکراوە لەسەر هەمەوەندەکان زۆرە. هەروەک عەلی سیدۆ گەورانی دەڵێ: شانازی بە پاڵەوانیەتی گەڕانەوەیان دەکەن کە لە باکووری ئەفریقیاوە گەڕاونەتەوە بەڵام ئەم گێڕانەوەیە چ لەسەر هەمەوەند بەگشتی و چ لەسەر کەریم بەگ و سابیر بەگ کە بەو تەمەنی درێژی ڕووداوەکان نزیکەی (٣) چارەکە سەدەیە بەئەستەم دەقیقی و ووردی خۆی پێوە ماوەو تا رادەیەک تێکەڵ بە چیرۆک و داستان بووە، بەڵام نیشانەی بەسوودی و بەرهەمداری هەر پێوە ماوە، بۆ کەسێک کە بەوردتر دیراسەی هەمەوەند لە هەموو رووەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سایکۆلۆژی بکات.

هەرچی دەسنووسیشە بێجگە لە دەستنووسەکەی (حەیدەر ئاغا) کە لەرێگەی

(کاک نەجمەددین)ەوە گەیشتۆتە دەستمان، چەند بەڵگەنامەیەکی حکوومەتی عوسمانی کە لەرێگەی (د.عەبدوڵلا محەمەد عەلی)ەوە دەستمان کەوت، شتی ترمان دەست نەکەوت. زۆرجار مرۆڤ ئاخ هەڵدەکێشێ بۆ دەستکەوتێکی گرنگ کە لەدەست چووە یان دەرفەتێکی گەورە کە لەدەستی داوە بەهۆی نەزانینەوە بێت یان هەر هۆکارێکی تر. بەتایبەتیش لەدەسدانی دەرفەتی زێڕین و دەستکەوتی گرانبەهای من و سەروەت و سامانی لەزێڕو زیو بەنرختری میللەتەکەم. لەلای من بەهۆی ئاڵۆزی بارودۆخی سیاسی و نالەباری گوزەران و ڕوودانی کارەساتی ماڵ سووتاندنمان خەرمانی خەزێنەی بەنرخی لەدەست داین.

لەناوەندی حەفتاکان و دوای نسکۆی شۆڕشی کورد ئەو کاتە ماڵمان لە گوندی (باینجان) بوو بەڕاستی ئەو دەرفەتەمان نەبوو کە ئەو سندووقە کۆنەی کاتی خۆی لە (کەریم بەگ)ەوە مابۆوەو چەند بەڵگەنامەیێکی گرنگی تیابوو لە شوێنێکی ئەمین هەڵی بگرین یان بیخەینە بەردەستی کەسانی پسپۆر و شارەزا. سندوقەکە پڕی بوو لە نامەو نووسراو کە کاتی خۆی بۆ کەریم بەگ هاتبوون لەلایەن حاکمی سیاسی بەریتانی و سەرکردە ناودارەکانی کورد وەکو شێخ مەحموود و سمکۆی شکاک و مەحموود خانی دزلی و ئیبراهیم خانی دەلۆو چەندانی تر. پێم وابوو ئەگەر دەستی قەدەر بەهۆی ئەو ئاگرەی کەوتە ماڵەکەمانەوە نەسووتایە ئێستا زۆر نهێنی گرنگی مێژووی تیا ئاشکرا دەکراو دەبووە سەرچاوەی گرنگ و تازە بۆ ڕۆشنبیرانی کورد.

ساڵ هاتو ساڵ ڕۆیی باسی داستان و بەسەرهاتی کەریم بەگ و بەگزادەو هەمەوەند زیاتر هاندەرو فاکتەری بەهێز بوون بۆ هەوڵ و کۆششی من لەپێناو نووسینەوەی ئەوەی هەیە لەسەر کەریم بەگ لە چوارچێوەی کتێبێکی سەربەخۆدا.

زۆر لە سەرکردەو ناودارانی جیهان ناویان بۆتە وێردی سەر زاری نەتەوەی خۆیان و لەیادیان ناکەن... کەریم بەگ و خزم و هۆزەکەشی وەکو ئەوان خاوەنی داستان و سەربوردەی مەردایەتین، بەڵام ئەوان خاوەنی دەست و قەڵەمی ڕەنگین

بوون و شوێنەوارو کەلتووریان نەفەوتاوە، هەرچی ئێمەین لەبەر کەمی ئەزموونمان لەم بوارەدا، خەریکە ناودارانی خۆمان لەیاد دەکەین.

لێرەدا ویستوومە هەرچی کتێب و گۆڤارو رۆژنامەو دەستنووس هەیە کۆی بکەمەوەو خوێنەری کوردو نەوەی تازەی میللەتەکەمان زیاتر بە (کەریم بەگ) ئاشنا بکەم.

سەرچاوەی کوردی و عەرەبی و بیانی زۆرن کە باسیان کردبێت و کەم سەرچاوەی مێژوویی هەیە لەسەر مێژووی تازەی میللەتی کورد ئاماژەی بە کەریم بەگ و هەمەوەند نەکردبێت و زۆربەی زۆری رۆژهەڵاتناس و گەڕیدەکانیش ئەمەیان فەرامۆش نەکردووە، بەڵام ئەمانە هەمووی بەسەر پێی و لە چەند لاپەڕەیەکی ئاسایی لەچوارچێوەی کتێبێکی قەبارە گەورە لەسەر هەمەوەندیان نووسیوە یان لە یاداشت و بیرەوەرییەکانیاندا، ئەگەر بە چەمچەماڵ و بازیاندا تێپەڕیوون باسیان لە هەمەوەند کردووە. بەڵام ئەمە بەتەنها بەس نییەو تینوێتی ئەو مێژووە پڕ لە سەروەرێتییەی نەشکاندووە، چونکە هەتا ئێستا لە پەراوێزەوە باسی کەریم بەگ دەکرێ و تەمەنی دوورو درێژی شۆڕشەکەی و خەباتی بێ وچان و بێ پسانەوەی و شەڕە (پارتیزانی)یەکانی لەوە گرنگترن کە بەم سەرپێیە خوێنەری پێ ئاشنا بکرێت.

کەریم بەگ پاڵەوانێکی سەرەتای ئەم سەدەیەی کوردستانی باشوورو تۆقێنەرو بێ هێزکەری دەسەڵاتی ئینگلیزەکان بوو لەکوردستاندا و لەئاستی بەرز باسی کراوە. ئەخشە بۆ لەناوبردنی دانراوەو کاریگەری بەرچاوی هەبووە لە بواری سیاسیدا.

**خوێنەری خۆشەویست**

ئەم کتێبەی بەردەستت کورتەو پوختەیەکە لەسەر کەریم بەگ و هەمەوەندەکان. بەڵام پێویستە ئەوەش بڵێم کە ئەوەی من لە پوختەی سەرچاوە نووسراو و نەنووسراوەکان کۆم کردۆتەوە بەشێکە - نەک هەمووی - لە گشت

ئەوەی رووی داوە. کـــــــەریم بەگ رۆڵـی بەرچاوی هەبوو لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی میللەتی کوردو هەتا ئێستا لە نموونەی ئەو پیاوە کەم وکەم وێنەیە لەناو سەرکردە ناودارەکانی میللەتی کورد کە بەدرێژایی شۆڕش و ململانێی دەیان ساڵەی ڕۆژێک چەکی دانەنابێت و ڕۆژێ کۆڵی نەدابێت و گفتوگۆی لەگەڵ دوژمن قبوڵ نەکردبێت و تا ئەم ناستە بەرزە دوژمنی سەغڵەت کردبێت. ئەمە جێگەی سەربەرزی‌یە بۆ ئەو پیاوە کە هەر لە منداڵیەوە هەتا شەهید بوونی بۆ تاوێکیش کۆڵی نەداوەو بەفیتی دوژمنان هەڵنەخەڵەتاوەو سەرکردەو جێی ئومێدی هۆزو نەتەوەکەی خۆی بووەو شەڕی تورک و شەڕی ڕووس و ئینگلیز و شەڕی ڕژێمی پادشایەتی عێراقی یەک لەدوایی یەک بێ پسانەوە کردووە و نەخشـەی لەناوبردن و سڵ کردنەوەی بۆ دارێژراوە. بەڵام هەمـوو نەخشـەو پیلانێک لەبەرامبەر کەریم بەگ لەباریەک چووەو بێ ئەنجام بووە.

**دارا ئەحمەد کریم فەتاح بەگ هەمەوەند**

**١٩٩٨/١/٥ هەولێر**

# هۆزی هەمەوەند

لە مێژووی پڕ لە کەند و کۆسپ و قارەمانێتی میللەتی کورد و خەبات و تێکۆشانی پڕ میحنەتی و جەربەزەیی و قالبوونەوەی مەیدانی جەنگ و پێکدادان و شەڕی ناحەزان و خۆسەپێنەران، دەیان هۆزی کورد بەدرێژایی ئەم یەک دوو سەدەی ڕابردووە، ڕۆڵی قارەمانانەیان گێڕاوەو لاپەڕەی خەباتیان و سەربوردەی ژیانیان پڕە لەسەروەری و سەربەرزی و کۆڵنەدان، پڕە لە کوشتن و برین و برسێتی و تۆماری دەیان قارەمانێتی و نەبەردی کە جێگەی دەرس و پەندن، هەم جێگەی شانازین.

بەداخەوە نێمەی کورد هەتا ئێستا بەشێوەیەکی زانستیانە ئەو مێژووە پڕ لەسەروەرێتییەمان تۆمار نەکردووە و دیراسەی ئەکادیمیانە لەو بوارانەدا کەمن بەتایبەتی مێژووی کوردو ڕۆڵی هۆزە کوردەکانی سەدەکانی هەژدەو نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەم کە بەسەرەتای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی میللەتی کورد ناسراوە.«[1]»

---

١- سەبارەت بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتی لەناو کورددا هەندێک دەمێنەوە پێش سەدەی بیستەم بەڵام لەڕاستیدا هاتنی تورکە نیتحادییەکان و چاندنی گیانی ڕەگەزپەرستی لە نێو دەوڵەتی عوسمانی دواتر کودەتای ساڵی ١٩٠٨ز بەسەر سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ئەو هەستەی لەلای نەتەوە غەیرە تورکەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی وروژاند. ڕاستە کوردو عەرەب و ئەوانی تر چەند جار بەگژ تورکاندا چوون و ئەوانیش زوڵم و زۆرداری زۆریان لەو نەتەوانە کردووە، لەپێشەوە میللەتی کورد. بەڵام زیاتر زۆرداری و بەفاکتەری خۆسەپاندن و دیکتاتۆری و سەندنی سەرانەو باج و بردنی خێری وڵات، بەڵام بەگیانی تورکچێتی و ناسیۆنالیستی، ئەوە زیاتر تایبەتە بەڕۆژگاری نیتحادییەکان لەسەرەتای ئەم سەدەیە بەم کارەی ئەوانیش نەتەوەی کوردیش هاتە پێشەوە بۆ دەرخستنی ناسنامەی نەتەوەیی خۆی لەئاستی ئەو شەپۆلە ڕەگەزپەرستییە، هەروەها عەرەب و نەتەوەکانی تریش بەهەمان شێوە.

هۆزی هەمەوەند یەکێکە لەو هۆزە کوردانەی کوردستانی باشوور کە بەشێک لەو مێژووە پڕ قارەمانێتی و جەربەزەییەی بەرکەوتووە. لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەو بەدرێژایی سەدەی ڕابردوو و سەرەتای سەدەی بیستەم، خاوەنی زۆرترین داستانی خوێناوی و سەرکەوتنە بەسەر سوڵتانەکانی عوسمانی و دەوڵەتی قاجاریدا کە دوو دەوڵەتی زلهێز بە هۆی والی و جەندرمەکانیانەوە نەیان ویستووە دادگەرانە لەگەڵ هۆزو نەتەوەکانی ژێر دەسەلاتیان بجەوێنەوەو چەوسانەوەو دووبەرەکی نانەوەو سەرکوت کردنی کیانە خۆجێییەکانی کوردستان کە لەمیرنشین و هۆزە سەربەرزەکان خۆی دەنواند، کارو پیشەیان بوو.[1] ئەگەر تێک گیران و شەڕی خوێناوی لەگەڵ هۆزە کوردەکان و بەرەنگاری و خۆڕاگری پیشەی ئەو هۆزانە بووبێت ئەوە هۆزی هەمەوەند خاسیەتی خەبات و تێکۆشانی پڕە لەسەروەری و کۆڵ نەدانی زیاترو پشوو درێژی و بەتوانایی لەشەڕداو پلانی بەهێزی بەرەنگار بوونەوەو کۆچڕەوی دوورو درێژو کۆڵ نەدان و گەڕانەوە بۆ زێدی باب و باپیران.

شوێنی حەوانەوەی هەمەوەند بازیان و چەمچەماڵ بووە. لەبەر ئەنجامی شەڕو شۆڕشی ئەوان لەدژی والییەکانی عوسمانی بەدرێژایی سەدەی ڕابردوو، (١٩) جار ناوچەکەیان بەجێ هێشتووەو چوونەتە دەوروبەری زەهاو لە کوردستانی ئێران، جارێکیش باکووری ئەفەریقیا و جارێکیش بۆ (ئەدەنە)ی تورکیا دوورخراونەتەوە.

لە ڕۆژگاری ئیتحادییەکانیش کە دەردێکی تریان خستەسەر مەینەتییەکانی میللەتە ژێر دەستەکانی دەوڵەتی عوسمانی ئەویش پیادەکردنی سیاسەتی بەتورککردن «تتریک» و هێنانە گۆڕێی ململانێی ڕەگەزپەرستی و کاردانەوەی ئەم سیاسەتە بوو لەلایەن میللەتانی ژێر دەستیان و لەناو ئەوانەدا میللەتی کورد. هۆزی هەمەوەند لەم لێشاوی سیاسەتە ڕەگەزپەرستییەش لەسەر

---

١- هێرشی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر جەزیرەی بۆتان و سۆران و بادینان و بابان لەسەرەتای هاتنیان بۆ کوردستان هەتا دواساتی حوکمیان نموونەی زەق و بەرچاون.

ریش سپی هەمەوەندەکان بووە. لەساڵی ۱۸۸۲دا لەچەمچەماڵ، لەدایک بووە و ماوەیەک کراوە بە قائیمقامی قەزای چەمچەماڵ، پاشان لەگەڵ حکوومەتی ئینگلیز تێک دەچێ، دوای شەڕێکی زۆر خۆی و هەندێ لەهۆزەکەی روودەکەنە قەزای رەواندزو پاشان لەوێشەوە دەچنە سنووری عێراق و تورکیا، سێ مانگ دەمێننەوە کە شێخ قادری برای شێخ مەحموود دەکرێتە حاکمی لیوای سلێمانی، عەفوو دەکرێت و لەگەڵ خزمەکانیدا دەگەڕێنەوە چەمچەماڵ. لە ساڵی ۱۹۲۱دا دووبارە دەکرێت بە قائیمقامی چەمچەماڵ پاشان لەبەر نیشوکاری هۆزەکەی دەست لەکار دەکێشێتەوەو حکوومەتی عێراقی مانگانەی بۆ دەبڕێتەوە هەتا کۆچی دوایی دەکات.«[1]»

۱۰- مەحموود خدر هەمەوەند ماوەیەکی زۆر لە مووسڵ دەبێت، یۆزباشی بوودو لەئیدارەی حکوومەتا و لەڕووداوی فتنەی مووسڵ کە شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموود تیاچوو، شێخ مەحموود پەنا دەباتەبەر ئەو، لەو پیلانەی کە بۆ خۆی و باوکی دانرابوو.

۱۱- مستەفا کامیل یەکێک بووە لەو سەرکردانە کە بۆ باکووری ئەفەریقیا نەفی کراون.

۱۲- حەیدەر عەزیز خەسرەو یەکێکە لە ناودارەکانی ئەم هۆزە کە بۆ باکووری ئەفەریقیا نەفی کراوە.

۱۳- حوسێن ئاغای عەزیز ئاغا لەکاتی خۆیدا سەرکردەو دەم سپی هەمەوەندەکانی کردووە.

۱٤- حەمە زاب، مەبەست (حەمە زەردە). پیاوێکی زۆر ئازاو ناوداری هۆزی هەمەوەند بووە. سەرەک تیرەی (سێتابەسەر) بووەو پشتگیری لەشۆڕشی شێخ مەحموود کردووە.«[2]» دوای ئەویش ساڵح ڕێحان سەرەک تیرەی سێتابەسەر بووە.

---

۱- عبدالمجید فهمي حسن، من تاریخ مشاهیر الالویة العراقیة، الجزء الاول، مطبعة الزمان- بغداد طبعة ۱۹٤٦م، ل۳۵۳-۳۵٤.

۲- فؤاد حمه خورشید- عشائر الکردیة، ل٦٥.

ئەم سەرکردانە هەموو کاتێ لەڕووی حکوومەتەکانی عوسمانی و قاجاری و ئینگلیزو رووسیا لەهەموو رووبەڕوو بوونەوەیەکدا زەبری کوشندەیان لە دوژمن داوەو نەیان هێشتووە هیچ دوژمنێک و داگیرکەرێک بەئاسانی و بەبێ زیان بە ناوچەی بازیان و چەمچەماڵ تێپەڕێ.

١٥- رەسوڵ چەڵەوی باوکی فەتاح بەگی هەمەوەند«١» لەکۆتایی سەدەی رابردوو دەیان جار شەڕی کردووە لە دژی حکوومەتی عوسمانی و بۆتە هۆی ئەوەی (١٩) نۆزدە جار بەخێزانەوە یاخی ببێ و بەهیچ جۆرێک ملی کەچ نەکردووە بۆ حکوومەتی عوسمانی و قاجاری و لەهەموو رووبەڕوو بوونەوەیەکدا دەستی وەشاندووەو پاش گفتوگۆ لەسەر کۆمەڵێ مەرج و داواکاری گەڕاوەتەوە. ئەمەش بۆ نموونە ئەو خاڵانەیە کە یەکەم جار لەسەریان رێککەوتن لەگەڵ عوسمانییەکاندا:

١- کورد خزمەتی سەربازی لەڕیزی سوپای تورک ناکات.

٢- بەهیچ شێوەیەک سەربازی تورک هاتووچۆی سلێمانی نەکات.«٢»

٣- هۆزی هەمەوەند خۆیان خاوەنی دەسەڵاتی بەڕێوەبردن دەبن و پارێزگاری سنووری دەسەڵاتی خۆیان دەکەن.

٤- سەرانەو باج نەدرێتە دەسەڵاتدارانی عوسمانی.

---

١- فەتاح بەگ باوکی کەریم بەگ بووە.

٢- عیزەدین مستەفا رەسووڵ لە کتێبی (سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی لەبارەی شاری سلێمانی) دەڵێ: (دووری سلێمانی لەپایتەختەوە و بەزەحمەت گەیشتنی سوپاو سەربازی عوسمانی وای کردبوو کە هیچ کاتێک لە سلێمانیدا دەسەڵاتێکی پتەوی عوسمانی دیارنەبێت) و هەر لە پەراوێزەکەیدا ئاماژە بە بۆچوونێکی مێجەرسۆن دەکات کە دەڵێ: (سەربازی عوسمانی لەترسی هەمەوەند هەرنەیتوانیوە رێگەی سلێمانی بگرێت و بەزەحمەت گەیشتۆتە ئەوێ). بڕوانە کتابی ناوبراو، ل٢٥.

دیارە هەمەوەند و گرنگی شوێنەکەی بۆ شاری سلێمانی بەتەنها لەڕووی سیاسییەوە نییە، بەڵکو هەمەوەند رۆڵی بەرچاوی هەبووە لە پاراستنی کەلەپوورو فەرهەنگ و زمانی ئەو ناوچەیەو پاراستنی لە تەئسیراتی فەرهەنگی عوسمانی.

کاربەدەستانی حکوومەتی عوسمانی بەشێوەیەکی یاسایی ئەم داواکاری و مەرجانەی هۆزی هەمەوەندیان قبوول کرد. هەردوولا ڕێککەوتننامەکەیان مۆرکردو دەسەلاتی جێ بەجێ کردن و بەڕێوەبردنی مەرجەکانیان خستە بەردەم فەرمانی قائیمقامی چەمچەماڵەوە، کە پەیڕەوی بکات.

هەر لەوکاتانەدا فەقێ قادری شاعیر کرا بە قائیمقامی چەمچەماڵ و کاکەولای عەزیزیش کرایە مدیر ناحیەی سورداش و حاجی سەعید ئاغاش کرایە لێپرسراوی ناوچەی ئاغجەلەر.

لێرەوە ئەمە روون دەبێتەوە کە بەتەنها بزووتنەوەکە بزووتنەوەیەکی هۆزایەتی ناوچەگەری نەبووە، بەڵکو بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد بووە لە ناوچەی هۆزی هەمەوەند. دەشێ سەرهەڵدانی بزووتنەوەکە لەم ناوچەیە لەبەر گرنگی شوێنی جوگرافی و ستراتیژی ناوچەکە بووبێت. بەڵگەشمان ئەوەیە کە داواکارییەکانی ڕەسووڵ چەلەوی خواستی هۆزێک نییە بەڵکو خواستی نەتەوەیی لێ بەدی دەکرێت بەتایبەتی خاڵی یەکەم و دووەم«[1]».

هەروەها لە سەرەتای ئەم سەدەیە، لەناو دەیان سەرکردەو پیاوی ناوداری هەمەوەند، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند ناسنامەی هۆزەکەی و مایەی سەربەرزی میللەتەکەیەتی، چونکە کەریم بەگ بوو دەسەلاتی ئینگلیزەکانی خستە لەرزەو بۆیانی سەلماند ئەم وڵاتە بێگانە هەڵناگرێ. ئەمەو خەباتی دەیان ساڵەی کەریم بەگ و (سابیر بەگ و عەبدوڵڵا بەگ)«[2]» بوو ناوو ناوبانگی هەمەوەندیان بردە ئاستی باڵاو خستیانە بەردەم لێکۆڵینەوەی پەرلەمانی بەریتانی کە پێشتر ناسنامەی هەمەوەندو میللەتی کوردییان سەربەرزانە دابووە

---

١- گوڤاری تایم سلێمانی ژمارە (٧) ساڵی ١٩٩٨، ل٢٥ دیدارێک لەگەڵ بەڕێز کاک کەریم ئاغای هەمەوەند.
٢- کوڕەکانی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندن.

دەست تورکە ڕەگەزپەرست و رووسیای دەست درێژکار"[1].

بۆ زیاتر ئاشنا بوون بەهۆزی هەمەوەندو بنەچەی ئەو هۆزە کوردە و شوێن و نەریتی‌یان بەگرنگی دەزانین لەم دەروازەیەدا زۆر بەکورتی بچینە سەر ناساندنی ئەم هۆزەو مێژووی پڕ لەداستان و سەروەری.

---

١- د. کمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لەمێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل١٢٢.

کارەساتی شەهید کردنی «شێخ سەعید»ی باوکی شێخ مەحموود لە مووسڵ کە بەرئەنجامی ئەو مەرامە رەگەزپەرستییە بوو، داستانی ململانێ و بەرەنگاری لە دەربەندی بازیان تۆمارکردو دووبارە ئاوارەی ناوچەی زەهاو بۆوە.«[1]»

ئەم ئاوارەیی و دەربەدەرییە لەپێناو پاراستنی سەربەرزی و سەرشۆڕ نەکردن نەریتی هەرە باوی هەمەوەند بووە لەپێناوی خاکی کوردو کوردستان لەدژی بێگانە داگیرکەرەکاندا.

لە باسی هۆزی هەمەوەند (کلیمان لە ساڵی ١٨٥٣)دا دەڵێ: (گرنگترین هۆزی کوردی نیشتەجێی ناوچەکە هەمەوەندە کە بەهێزترین و بەناوبانگترین هۆزە لە بلیمەتی و بەجەرگی و بەتواناییداو بەردەوام لە شۆڕشدایە).«[2]»

هەروەها (ئینزۆرث لە ساڵی ١٨٣٧) باسی هۆزی هەمەوەند دەکات و دەڵێ: (هەمەوەندەکان شۆڕشیان دژی تورکەکان بەرپاکرد).«[3]»

مێژوونووس محەممەد ئەمین زەکی دەربارەی هۆزی هەمەوەند دەڵێ: (ئازاترین هۆزی کوردو بەجەرگترینیانە لە جەنگدا).«[4]» ئازایەتی و بلیمەتی ئەم هۆزە گەیشتە رادەیەک کەوتە سەرزاری هەموو خەڵک و مێژوونووسە بیانییەکانیش بە سەرسوڕمانەوە بەسەرهاتەکانیان دەگێڕنەوە.

لە ئاکامی بەرگری کردن لەخاکی باب و باپیران و ڕووبەڕوو بوونەوەی ناحەزانی میللەتی کورد چەندین سەرکردەی ئازاو ناودار سەری هەڵداوەو ناویان دەرکردووە وەک:

---

١- فوئاد حەمە خورشید، العشائر الكردية، ل٦٩- ١٠٥.

٢- سي. جي. ادموندز، (كتاب التاخي) - كرد و ترك و عرب، ترجمة جرجيس فتح الله، مطبعة التايمس - بغداد ١٩٧١ ل٤٦.

٣- (ادموندز، ک.ت.ع) - ل٤٦.

٤- محمد امين زەكي، تاريخ سليمانية وانحائها، ترجمة الملا جميل احمد رۆژبياني. طبع شركة النشر والطباعة العراقية المحدودة- بغداد- ١٩٥١م .ل١٨٧-١٨٨.

١- جوامێرئاغا (جوکل هەمەوەند)، لەشوێنی خۆیدا باسی دەکەین.

٢- شەریف هەمەوەند کە شەریف چەڵەویشیان پێ وتووە (١٠٠٠) سوارەی هەمەوەندی لەگەڵ بوودو سەرلەشکری سوپای بابان بووە، لەگەڵ عەزیز بەگی عەبدولڕەحمان پاشادا هەرچی تمووری بابان بووە، هەڵیان سووڕاندووە. لەساڵی ١٢٥٢ی کۆچی سەرۆکی هۆزی هەمەوەند بووە.

٣- فەقێ قادری شاعیر: شاعیرو ناوداری هەمەوەند لەبازیان لەدایک بووە لە ساڵی ١٣٠٥ لەبنغازی لە لیبیا کۆچی دوایی کردووە«١»

٤- کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند.

٥- نادر ناسراو بە نالە پێ پانی هەمەوەند لەساڵی ١٩٠٩ لەدەربەندی بازیان تابوورێک عەسکەری تورک ڕووت دەکاتەوە. لەدواییدا گیراو لە ساڵی ١٩١٠ی زاینی لە سلێمانی ئیعدام کرا. زۆربەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان باسی ئازایەتی ئەویان کردووە.

٦- ڕەشید فەتاح لە لیبیا شەهید بوو.

٧- حەمەی مام سلێمان ناودارێکی هەمەوەند بوودو یەکێک بووە لەپیاوە بەتواناکانی ئەم هۆزە، کاتی خۆی لە لیبیا بەپێ گەڕاوەتەوە چەمچەماڵ.

٨- حەسەن بەگ ناودارێکی هەمەوەند بووە، ماوەیەک لەباکووری ئەفەریقا دەمراستی هەمەوەندەکانی کردووەو ئازایانە پێشڕەوی کردوون بۆ گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان. لەو پێناوەدا لە شەڕێکی نابەرامبەردا لەگەڵ جەندرمەکانی (ئەحمەد راسم پاشا)دا شەهید دەبێت و تەرمەکەی لەغەریبی دەنێژرێت و هەر لەم شەڕەدا کەریم بەگ بریندار دەبێت.«٢»

٩- محەمەد ئەمین ئاغا یەکێکە لە ناودارەکانی هەمەوەندو کوڕی فەقێ قادری شاعیرە. لەکۆتایی سەدەی رابردوو و سەرەتایی ئەم سەدەیەدا دەمراست و

---

١- کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند ل٢٣.

٢- د. حامد محمود عیسی علي، المشكلة الكردية في الشرق الاوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، مكتبة مدبولي ١٩٩٢ جمهورية مصر العربية ص٢٤.

ریش سپی هەمەوەندەکان بووە. لەساڵی ١٨٨٢دا لەچەمچەماڵ، لەدایک بووە و ماوەیەک کراوە بە قائیمقامی قەزای چەمچەماڵ، پاشان لەگەڵ حکوومەتی ئینگلیز تێک دەچێ، دوای شەڕێکی زۆر خۆی و هەندێ لەهۆزەکەی روودەکەنە قەزای رەواندزو پاشان لەوێشەوە دەچنە سنووری عێراق و تورکیا، سێ مانگ دەمێننەوە کە شێخ قادری برای شێخ مەحموود دەکرێتە حاکمی لیوای سلێمانی، عەفوو دەکرێت و لەگەڵ خزمەکانیدا دەگەڕێنەوە چەمچەماڵ. لە ساڵی ١٩٢١دا دووبارە دەکرێت بە قائیمقامی چەمچەماڵ پاشان لەبەر ئیشوکاری هۆزەکەی دەست لەکار دەکێشێتەوەو حکوومەتی عێراقی مانگانەی بۆ دەبڕێتەوە هەتا کۆچی دوایی دەکات.»[١]

١٠- مەحموود خدر هەمەوەند ماوەیەکی زۆر لە مووسڵ دەبێت، یوزباشی بووەو لەئیدارەی حکوومەتا و لەڕووداوی فتنەی مووسڵ کە شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموود تیاچوو، شێخ مەحموود پەنا دەباتەبەر ئەو، لەو پیلانەی کە بۆ خۆی و باوکی دانرابوو.

١١- مستەفا کامیل یەکێک بووە لەو سەرکردانە کە بۆ باکووری ئەفەریقیا نەفی کراون.

١٢- حەیدەر عەزیز خەسرەو یەکێکە لە ناودارەکانی ئەم هۆزە کە بۆ باکووری ئەفەریقیا نەفی کراوە.

١٣- حوسێن ئاغای عەزیز ئاغا لەکاتی خۆیدا سەرکردەو دەم سپی هەمەوەندەکانی کردووە.

١٤- حەمە زاب، مەبەست (حەمە زەردە). پیاوێکی زۆر ئازاو ناوداری هۆزی هەمەوەند بووە. سەرەک تیرەی (سێتابەسەر) بووەو پشتگیری لەشۆڕشی شێخ مەحموود کردووە.»[٢] دوای ئەویش ساڵح رێحان سەرەک تیرەی سێتابەسەر بووە.

---

١- عبدالمجید فهمي حسن، من تاریخ مشاهیر الالویة العراقیة، الجزء الاول، مطبعة الزمان- بغداد طبعة ١٩٤٦م، ل٣٥٣-٣٥٤.
٢- فؤاد حمه خورشید- عشائر الکردیة، ل٦٥.

ئەم سەرکردانە هەموو کاتێ لەڕووی حکوومەتەکانی عوسمانی و قاجاری و ئینگلیزو رووسیا لەهەموو رووبەڕوو بوونەوەیەکدا زەبری کوشندەیان لە دوژمن داوەو نەیان هێشتووە هیچ دوژمنێک و داگیرکەرێک بەئاسانی و بەبێ زیان بە ناوچەی بازیان و چەمچەماڵ تێ پەڕێ.

١٥- رەسوڵ چەڵەوی باوکی فەتاح بەگی هەمەوەند"[١]" لەکۆتایی سەدەی رابردوو دەیان جار شەڕی کردووە لە دژی حکوومەتی عوسمانی و بۆتە هۆی ئەوەی (١٩) نۆزدە جار بەخێزانەوە یاخی ببێ و بەهیچ جۆرێک ملی کەچ نەکردووە بۆ حکوومەتی عوسمانی و قاجاری و لەهەموو رووبەڕوو بوونەوەیەکدا دەستی وەشاندووەو پاش گفتوگۆ لەسەر کۆمەڵێ مەرج و داواکاری گەڕاوەتەوە. ئەمەش بۆ نموونە ئەو خاڵانەیە کە یەکەم جار لەسەریان رێککەوتن لەگەڵ عوسمانییەکاندا:

١- کورد خزمەتی سەربازی لەڕیزی سوپای تورک ناکات.

٢- بەهیچ شێوەیەک سەربازی تورک هاتووچۆی سلێمانی نەکات."[٢]"

٣- هۆزی هەمەوەند خۆیان خاوەنی دەسەڵاتی بەڕێوەبردن دەبن و پارێزگاری سنووری دەسەڵاتی خۆیان دەکەن.

٤- سەرانەو باج نەدرێتە دەسەڵاتدارانی عوسمانی.

---

١- فەتاح بەگ باوکی کەریم بەگ بووە.

٢- عیزەدین مستەفا رەسووڵ لە کتێبی (سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی لەبارەی شاری سلێمانی) دەڵێ: (دووری سلێمانی لەپایتەختەوە و بەزەحمەت گەیشتنی سوپاو سەربازی عوسمانی وای کردبوو کە هیچ کاتێک لە سلێمانیدا دەسەڵاتێکی پتەوی عوسمانی دیارنەبێت) و هەر لە پەراوێزەکەیدا ئاماژە بە بۆچوونێکی مێجەرسۆن دەکات کە دەڵێ: (سەربازی عوسمانی لەترسی هەمەوەند هەرنەیتوانیوە رێگەی سلێمانی بگرێت و بەزەحمەت گەیشتۆتە ئەوێ). بڕوانە کتابی ناوبراو، ل٣٥.

دیارە هەمەوەند و گرنگی شوێنەکەی بۆ شاری سلێمانی بەتەنها لەڕووی سیاسییەوە نییە، بەڵکو هەمەوەند رۆڵی بەرچاوی هەبووە لە پاراستنی کەلەپوورو فەرهەنگ و زمانی ئەو ناوچەیەو پاراستنی لە تەئسیراتی فەرهەنگی عوسمانی.

کاربەدەستانی حکومەتی عوسمانی بەشێوەیەکی یاسایی ئەم داواکاری و مەرجانەی هۆزی هەمەوەندیان قبوڵ کرد. هەردوولا ڕێککەوتننامەکەیان مۆرکردو دەسەڵاتی جێ بەجێ کردن و بەڕێوەبردنی مەرجەکانیان خستە بەردەم فەرمانی قائیمقامی چەمچەماڵەوە، کە پەیڕەوی بکات.

هەر لەوکاتانەدا فەقێ قادری شاعیر کرا بە قائیمقامی چەمچەماڵ و کاکەولای عەزیزیش کرایە مدیر ناحیەی سورداش و حاجی سەعید ئاغاش کرایە لێپرسراوی ناوچەی ئاغجەلەر.

لێرەوە ئەمە روون دەبێتەوە کە بەتەنها بزووتنەوەکە بزووتنەوەیەکی هۆزایەتی ناوچەگەری نەبووە، بەڵکو بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد بووە لە ناوچەی هۆزی هەمەوەند. دەشێ سەرهەڵدانی بزووتنەوەکە لەم ناوچەیە لەبەر گرنگی شوێنی جوگرافی و ستراتیژی ناوچەکە بووبێت. بەڵگەشمان ئەوەیە کە داواکارییەکانی ڕەسووڵ چەلەوی خواستی هۆزێک نییە بەڵکو خواستی نەتەوەیی لێ بەدی دەکرێت بەتایبەتی خاڵی یەکەم و دووەم"[1]".

هەروەها لە سەرەتای ئەم سەدەیە، لەناو دەیان سەرکردەو پیاوی ناوداری هەمەوەند، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند ناسنامەی هۆزەکەی و مایەی سەربەرزی میللەتەکەیەتی، چونکە کەریم بەگ بوو دەسەڵاتی ئینگلیزەکانی خستە لەرزەو بۆیانی سەلماند ئەم وڵاتە بێگانە هەڵناگرێ. ئەمەو خەباتی دەیان ساڵەی کەریم بەگ و (سابیر بەگ و عەبدوڵڵا بەگ)"[2]" بوو ناوو ناوبانگی هەمەوەندیان بردە ئاستی باڵاو خستیانە بەردەم لێکۆڵینەوەی پەرلەمانی بەریتانی کە پێشتر ناسنامەی هەمەوەندو میللەتی کوردییان سەربەرزانە دابووە

---

١- کوڤاری تایم سلێمانی ژمارە (٧) ساڵی ١٩٩٨، ل٢٥ دیدارێک لەگەڵ بەڕێز کاک کەریم ئاغای هەمەوەند.

٢- کوڕەکانی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندن.

دەست تورکە رەگەزپەرست و رووسیای دەست درێژکار»[1].

بۆ زیاتر ئاشنا بوون بەهۆزی هەمەوەندو بنەچەی ئەو هۆزە کوردە و شوێن و نەریتی‌یان بەگرنگی دەزانین لەم دەروازەیەدا زۆر بەکورتی بچینە سەر ناساندنی ئەم هۆزەو مێژووی پڕ لەداستان و سەروەری.

١- د. کمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لەمێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل١٢٢.

# شوێنی هەمەوەند

شوێنی ڕاستەقینەی هەمەوەندەکان کوردستانی باکوورە. بەهۆی شەڕو ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوییەکان لەدوای شەڕی (چالدێران - ١٥١٤ز)(١) ناوچەی خۆیان بەجێ هێشتووەو ناوارەی کوردستانی ئێران و لای کرماشان و سنەو شیراز بوون، هەتا سەرەتای سەدەی هەژدەهەم ئێستر لەوکاتەوە ناوارەی کوردستانی عێراق بوون.

لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمەوە هەتا ئێستا مەڵبەندی سەرەکی ئەم هۆزە بازیان و چەمچەماڵ بووە. بەڵام بەدرێژایی ئەو مێژووە بەهۆی چەند جار



١- شەڕی چالدێران، لە ساڵی ١٥١٤ز لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی سەفەوی ڕوویداوە لەنزیک شاری (ورمێ) و لەئەنجامدا عوسمانییەکان سەرکەوتن و ناوچەی کوردستانیش کەوتە بەر ئەو شاڵاوە.

دەربەدەری و ئاوارەیی، زەهاوو دەوروبەری دەبووە مـــەنزلی دووەمی هۆزی هەمـــەوەند. دواتریش بەهۆی شـەڕو شـۆڕو باری سـیـاسی و جـێگیـر نەبوونی بارودۆخی ململانێ و کـێشەی عـوسـمـانییـەکان لەگەڵ ناوچەکەو دواتر شەڕی ئینگلیزەکان و حکوومەتی پاشایەتی هەتا سەرەتای نیوەی دووەمی ئەم سەدەیە، هەمیشە هەمەوەندەکان تووشی پەرتەوازەیی بوون. سەرەڕای بازیان و چەمچەماڵ هەندێکیان لەشارەکانی (سلێمانی و کەرکووک و هەولێر و رەواندزو و ئاکرێ) و بگرە زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستان جێگیربوون و هەتا ئێستا لەئاکامی نەفی کردن و دەربەدەرکردنی هۆزی هەمـەوەند، لە هەندێ ولاتی دەرەوە خۆیان بەدیار دەخەن کە کوردن و هەمەوەندن و کوردو هەمەوەندێتی خۆیان درکاندووە بەتایبەتی ولاتی (تورکیاو ئێران و سوریا و لیبیا و جەزائیرو یەمەن).

دەتوانین سنووری هەمـەوەند لە عـێـراقـدا بەم شـێـوەیە دیاری بکەین، لە باکوورەوە: شوانی بازیان و چیای (تۆکمە)و لەباشوورەوە: رووباری تاوقسو یان (تاوغـە) و لەرۆژهەلاتەوە: زنجـیـرە شـاخی (تاسلووجـە) و (بن زەرد)ە و لەخۆرئاواوە: قەرەحەسەن و شوانی خاسەیە.[1]

هەمـەوەند لەم سنوورەدا خـاوەنی زیاتر لە (١٧٠) سـەدو حـەفـتـا گـوندن، هەندێکیـان کـاتی خـۆی ئاوەدان بوون و هەندێکی تریشـیـان دواتر ئاوەدان کراونەتەوە. گوندەکانیش بریتین لە:

(باینجان، سەرچاوە، لازیان، کووپەلە، کلاش کەران، دەرگەزێن، هەیاسی، بەگە جـانی، ئاڵی بزاوو، هەنجیـرە، خـاڵدان، بازیان، گـومـەتەگەچ، بالاجـۆ، مۆرتکە، ئاڵلایی، گۆپاڵە، کانی شەیتـان، بیجیجەک، تەیناڵ، کلاش کەرانی بچووک، تەکیێی کاکەمەند، تەکیێی حەمەبایز، تەکیێی کۆن، کانی بناوو، کانی چنار، تەژگا، خوامراد، باینجـانی لایَ چەمچـەماڵ، خاڵدان لای چەمچـەماڵ، چۆڵـمـەک، هەڕاوە، زەنان، کـانی کەوە، کـانی مـسـتـەفـا، شۆڕاوە، ژاڵە، سۆفی

١- (زکی، تاریخ سلیمانیة)، ل١٨٨-١٨٩.

حەسەن، عەلی زەنگەنە، ئەحمەدلەوەن، قوولە، چراغە رووتە، کونەکۆتر، قاسم بەگ زادە، قەڵاچۆغە، پیریایی، چەمچەماڵ، قودرەتە، کانی سارد، چاڵگە، چەشمە بەردین، گۆشت قووت، عەلی مەنسوور، کورگەیی فەتاح حەمە رەزا، کورگەیی شامار، کورگەیی چاوسوور، مووەفەر، فەیزئاوا، وەسمان غەزال، نوورەی سەروو، نوورەی خواروو، تەپەدێ، سەوسکە، تاڵەبان، قرخ، دارتوو، کورەداوی، قەرەتامۆر، مەلا حوسێن، ئۆمەرەگەدە، خاڵۆبازیانی، بنگرد، قەرەوەیس، باشبلاخ... هتد.

**تۆفیق وەهبی** دەڵێ: [دۆڵی «تەیناڵ»ی ناوچەی بازیان بنکەی سەختی هۆزی هەمەوەندی قارەمان و بەتوانای نیشتەجێی «چەمچەماڵ»ە. چیرۆک و داستانەکانی ئازایەتی ئەم هۆزە بەشێوەیەکی بەردەوام و ڕۆژانە بوو لەمردن نەترسن و پەلامارەکانیان کوتوپڕو خێرایە، کوشتن و بڕین و تاڵان کردن پیشەی ڕۆژانەیانەو ماندووبوون نازانن.. بەڵام بەهیچ جۆرێک ڕێگە بە ئافرەت ناگرن هەرچەندە پارەو خشڵ و زێڕی زۆریشیان پێ بێت.. ئەم هۆزە ناسراون بەداوێن پاکی.. کردارە تۆقێنەرەکانیان لەناوچە دوورەکانی وەکو بەغدا و مووسڵ و بەسرەش باس دەکرا تەنانەت دایکان منداڵەکانی خۆیان بەناوهێنانی ئەوان کپ دەکردەوە، منیش لەترسە بێ بەش نەبووم- هەرچەندە منداڵیش نەبووم- لەوکاتەدا کە قوتابیی ئامادەیی سەربازی بووم و لەگەڵ دوو هاوەڵمدا دەگەڕاینەوە بۆ سلێمانی بۆ پشووی جەژنی ڕەمەزان.. چەند ڕۆژێک لەکەرکووک بەتەمای هێزێکی سەربازی بووین کە لەگەڵ کاروانەکەدا بێت بۆ پارێزگاری کردنی، کەچی فەرماندەی سەربازی کەرکووک داوای دوو سوارەی هەمەوەندی لەیەکێک لە سەرەک خێڵەکانی هەمەوەند کردو ئەو دوو سوارە هەمەوەندە کاروانەکەمانیان بە ئارامی گەیاندە سلێمانی]. [١٠]

---

١٠- توفيق وهبي- سفرة من دربندي بازيان الى مله ي تاسلوجه. ص (١٩الى٢٥).

# خوادی باوکە گەورەی هەمەوەند

خوادی یا (خوا مراد شێر) خۆی و کەسوکاری ناوچەی سنەو دەوروبەری زەهاو بەجێ دەهێلن و لەرێگەی پێنجوێن و ناڵپارێزەوە دێن و لە ساڵی (١٧٠٠ی)ز لە گوندی (هەنگلمژاڵ) نیشتەجێ دەبن.

دەگێرنەوە زیاتر هۆی توورە بوون بووە کە ئەو ناوچانەیان بەجێ هێشتووەو لەگوندی (هەنگلمژاڵ)"[١]" لەلای (شێخ رەزا) نیشتەجێ بوون. (شێخ رەزا) زۆر رێز لە (خوادی) دەگرێ و دەیکاتە زاوای خۆی."[٢]" پاشان (خوادی) لەگەڵ کەس و کارەکەی و کورەکانی دێنە ناوچەی چەمچەماڵ لە دۆڵی بازیان نیشتەجێ



شاری پێنجوێن

---

١- هەنگەژاڵ: گوندێکە لەناوچەی پێنجوێن.

٢- نەجمەدین فەتاح نەسرەدین هەمەوەندی- خاوەنی دەستنووسێکی مێژوویی هۆزی هەمەوەندە لەکاتی خۆی بەئەمانەتەوە لە خوالێ خۆشبوان (حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغا) و (کاکە عەبدوڵلا حەیدەر عەزیز ئاغا) و (سابیر بەگ کوری کەریم بەگی

دەبن.«[1]»

ئایا (خوادی) کە هاتۆتە ناوچەکە بێجگە لەکەس و کاری خۆی کێ ی تری لەودیو بەجێ ماوەو هەمەوەند کە لەو پیاوەوە کەوتۆتەوە وەکو هۆزێکی سەردکی ناسراوە؟ یان لەنەسلّدا هۆزێکی سەربەخۆ بوون لەئێراناو دوایی پەرتەوازە بوون؟

ئەمانە هەموو پرسیارن و لێکۆلینەوەیەکی وردتری دەوێت کە هەتا ئێستا سەرچاوە بۆ وەلامی ئەو پرسیارانە لەبەردەستدا نییە. ئێرەش لەمەزیاتر درێژە پێ دان و بەدوادا چوون هەلناگرێ«[2]» (خوادی) لەدوای هاتنی بۆ کوردستانی عێراق چوار کوری دەبێت، هەریەک بەناوەکانی (یادگار، رەمەزان، رەشید، سەفەر). لەدوای خۆی نەوەی هەریەک لەم کورانە چوار تیرە سەرەکییەکەی هەمەوەندیان پێک هێنا بەم جۆرە:

١- بەگزادە: کە (چەلەبی)یشیان پێ دەلێن لەنەوەی (یادگار)ی کوری (خوادی)ین. ئەم تیرەیە گەورەترین و ناودارترین تیرەی هەمەوەندن.«[3]»

٢- رەمەوەن: یان (رەماوەند) ئەم تیرەیە لەنەوەی (رەمەزان)ی کوری (خوادی)ین.

٣- رەشەوەند: ئەم تیرەیەش لەنەوەی (رەشید)ی کوری (خوادی)ین.

٤- سەفەرەوەند: ئەم تیرەیەش لەنەوەی (سەفەر)ی کوری (خوادی)ین.

هەریەک لەم چوار تیرە سەرەکییە، لەسەرەتای سەدەی بیستەم سەرەک تیرەی

---

هەمەوەند) و پیاوە ناودارەکانی هەمەوەند بۆی ماوەتەوەو کۆی کردۆتەوە.

کاک نەجمەددین فەتاح ئێستا لەژیاندا ماوە بیشەی ئەمیدی خانەنیشی جەیشی عێراقە لەشاری کەرکووک دادەنیشێ، دەستنووسەکەی لای ئێمەیە.

تێبینی: لەکاتی دووبارەبوونەوەی ئەم سەرچاوەیە نیشانەی (ن.ف.هەمەوەند) بەکاردەهێنرێت.

١- (ادموندز، ك.ت.ع)، ل٤٤.

٢- (زکی، تاريخ سليمانية)، ل١٨٩ دەلێ [نزحت هذه العشيرة - كما يخمن - حوالي سنة (١٧٠٠م) من اطراف (سنة - سندج) الى منطقة بازيان].

٣- فؤاد حمه خورشيد، العشائر الكردية، ل٦٥-٦٦

خۆی هەبووە. (کەریم فەتاح بەگ) سەرەک تیرەی بەگزادەو (ئەمین رەشید ئاغا) سەرۆکی رەماوەندو (فەقێ محەممەدی مۆرتکە) سەرۆکی رەشەوەندو (فاتیحە رەقە) مەبەستی (فەتاح حەمە رەزا)یە سەرۆکی سەفەرەوەند بووە»[1].

هەندێک تیرەی تری هەمەوەند هەن وەک (سێتە بەسەر، سۆفی وەند، قورکەوەند، بابلەوەند، هەمەیل، میتمەوەند، بێ تۆیی، بێتیارەوەند، قاسمە وەند) چەند تیرەیەکی بچووکی تریش کە گوایە گومان هەیە لەسەر هەمەوەندێتییان، بەتایبەتی تیرەی (سێتەبەسەر) کە ئەدمۆندز بەهەمەوەندیان دانانێ»[2].

لە راستیدا ئەوەی گومانی تێ دەخا بۆ دابڕینی ئەم تیرانە لەهۆزی هەمەوەند دیار نەبوونی باوکە گەورەیانە کە لە کتێب و سەرچاوەکاندا باس نەکراوە»[3]. وەک چوارتیرەکەی تری هەمەوەند (بەگزادە، رەماوەند، رەشەوەند، سەفەرەوەند) کە هەرچواریان دەچنەوە سەر خوادی. ئەمەش پشتی پێ نابەسترێ بۆ دابڕینی ئەو تیرانە لە هۆزی هەمەوەند، چونکە مەرج نییە خوادی بەتەنها هاتبێتە بازیانو چەمچەماڵ، کەس و کاری لە براو ئامۆزاو خزمی لەگەڵ نەبووبێت. دەشگونجێ ئەم تیرانە بچنەوە سەر ئەوان دیارە سەرچاوەش لەبەر دەستدایە کە بەکەس و کارەوە کاتی خۆی (خوادی) هاتۆتە کوردستانی عێراق.

کەسیش تەنهایی (خوادی) لەو سەفەرە باس نەکردووە. جگە لەوەش داکۆکی کردنی هەریەک لەو تیرانەی هۆزی هەمەوەند لە هەمەوەندێتی خۆیان خۆی لەخۆیدا نیشانەی هەمەوەندێتییە. چونکە هەستکردن بە لەگەڵ بوون و یەک پارچەیی و یەک گیانی و هەستی پابەندی، خۆی لەخۆیدا یەکێکە لەمەرجە سەرەکییەکانی پێکهاتەی هەر هۆزو نەتەوەیەک. ئەگەر بەتەنها رەچەڵەک و

---

١- فۆاد حمە خورشید، العشائر الکردیة، ل٦٥ .

٢- ادموندز، کرد وترک وعەرەب، ل٤٤.

٣- (ن.ف.هەمەوەند) دەڵێ: ئەو تیرانە لە ئەوەی براو ئامۆزاو خزمو کەس و کارەکەی (خوادی)ین.

بنەچە مەرج بێ دەبێت بەشێکی زۆر لە بنەماڵەو کەسایەتییەکانی کورد لە کوردستان دابڕین، لەپێشەوەیان بنەماڵەی شێخ مەحموودی قارەمان کە لەساداتن‌و ئەوانیش دەچنەوە سەر ئیمامی عەلی‌و لە کوردێتی دەشورێن، کە ئەمە هەموو بنەماڵەی سەیدەکان دەگرێتەوە کە لە راستیدا رۆڵی گرنگیان هەبووە لەبەرەوپێش بردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کوردو کەسیش گومانی لە کوردێتی ئەوان نییە"[1]. هەمەوەندەکان لەسەرەتای هاتنیان بۆ کوردستانی عێراق چ ئەو ماوەی لە دەڤەری پێنجوێن بوون چ لەسەرەتای نیشتەجێ بوونیان لە بازیان کۆچەرایەتییان کردووەو بەدوای مەڕوماڵات بەخێو کردندا گەرمیان‌و کوێستانیان کردووە، بەڵام دوایی وازیان لێ هێناوە و نیشتەجێ بوون. لەسەر گوندو زەوی خۆیان خەریکی کشتوکاڵ‌و مەڕو ماڵات بەخێوکردن بوون. لەسەرەتادا لە گوندەکانی بازیان‌و دەوروبەری جێگیربوون‌و پاشان چوونە بۆ ناوچەکانی تر وەک چەمچەماڵ‌و دەوروبەری و ئاوەدانیان کردۆتەوە.

هەمەوەندەکان گەرچی بەژمارە کەم بوون بەڵام ئازاو بەدەسەڵات بوون. چەندجار بەگژ تورکەکان چوونەتەوەو هاوکارو بەهێزکەری دەسەڵاتی میرنشینی بابانەکان بوون لەسەردەمی عەبدولڕەحمان پاشای باباندا. دەسەڵاتی هەمەوەندکان وێرای بازیان‌و چەمچەماڵ گەیشتۆتە قەرەداغ و لەلای باکووردەوە گەیشتبووە دەڤەری قەڵاسێوکە"[2].

تورکەکان بەفراوان بوونی دەسەڵاتی هەمەوەندەکان پەست دەبن و بەدرێژایی دوروسەدە ملمىلانێ لەنێوان والییە یەک لەدوای یەکەکانی عوسمانی‌و هەمەوەندەکان نابڕێتەوە. هەموو کاتێک دوژمنان هەوڵ‌و تەقەلای لاوازکردنی

---

١- (زکی، تاریخ سلیمانیة)، ل١٨٩، لە باسی ئەسڵی و بنەڕەتی هەمەوەند دەکات دەڵێ: (نزحت هذه العشیرة) واتە هۆزی هەمەوەند هاتنە ناوچەی بازیان ئەمە خۆی لەخۆیدا باشترین روونکردنەوەیە بۆ ئەوەی (خوادی) لەسەرەتاوە وەکو هۆزێک و بنەماڵەیەکی گەورە هاتۆتە ناوچەی بازیان‌و کەس‌و کارو خزمی خۆی لەگەڵ بووە.

٢- (ن.ف.هەمەوەند).

ئەم هۆزەیان داوە یا تۆوی دووبەرەکییان تیا چاندووە بۆ ئەوەی لەیەکتر دابڕێنو لاوازبن، کە ئەم سیاسەتەش بۆتە هۆی جیاوازی (تفرقة) لەنێو تیرەکانی ئەم هۆزەدا"[1]. ئەم جۆرە سیاسەتەش ناوی (فرق تسد)ە، بەمانای ئەوەی جیاوازیو دووبەرەکیو ناکۆکی نانەوە لەنێو هەر کۆمەڵێک سوودی بۆ دوژمنان دەگەڕێتەوە.

١- هەوڵو تەقەلای دوژمنان بەتایبەتیش داگیرکەری بەریتانی کە ڕۆڵی گرنگیان گێڕا لە کۆکردنەوەو نووسینو زانیاری لەسەر هۆزە کوردەکان بەلام بۆ مەبەستی خۆیان دیارە دروست کردنی ناکۆکی و دووبەرەکی یەکێک بووە لە مەبەستەکانیان، هەر بۆ نموونە (بۆند) حاکمی سیاسی چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٢٠ز لە یاداشتەکانیدا راپۆرتێکی داوەتە سەرەوەی خۆی دەڵێ: (باشترین شت ئەوەیە هەوڵ بدرێت عەشیرەتی بەگزادە لە کەریم بەگ دوور بخرێتەوەو تەقەلای ئەوە بدرێت عەشیرەتەکە لەناوخۆیاندا ناکۆک بنو دووبەرەکییان تێ بکەوێ). هەر ئەم راسپاردەیە بوو کە ئینگلیزەکان کاریان پێ دەکرد.

# هەمەوەند و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ عوسمانی و قاجارییەکاندا

لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا هەمەوەندەکان زیاتر بەململانێی فراوان کردنی دەسەلآت لەو دەڤەرە لەلایەکو پشتیوانی لە دەسەلآتدارانی میرنشینی بابانو ململانێ لەگەڵ والییەکانی عوسمانی لەلایەکی ترەوە خەریک بوون و دەسەلآتی خۆیان دەپاراست، جاری واش بووە لەگەڵ والییەکانی عوسمانی ڕێککەوتوون. لەساڵی ۱۸۲۹دا لە ئەنجامی بەهێز بوونی بابانەکان، هەمەوەندەکانیش دەسەلآتیان گەشەی کردووەو پشتگیرییان لە (بابان)ەکان کردووەو بوونەتە پاڵپشتێکی گرنگو بەتوانا بۆیان و، حوکمڕانی ناوچەیەکی بەرفراوانیان کردووە تا نزیک کەرکوکیان لەژێر دەسەلآتدا بووە.

لەنیوەی یەکەمی سەدەی ڕابردوودا دەسەلآتی هەمەوەندەکان لە ناوچەکە زیادی کردووە، چەندەها گوندیان ئاوەدان کردۆتەوەو سنووری دەسەلآتیان لەخۆرهەلآتەوە، قەرەداغ و لەباشوورەوە، قەرە حەسەنو لە باکوورەوە دەڤەری قەلآسیوکە بووە"[1].

ئەم تواناو سنوورەی دەسەلآتی هەمەوەندەکان، والیی عوسمانی لە بەغدا پەست دەکاتو شەڕو شۆڕو پێکدادان دەکەوێتە نێوان هەمەوەندو عوسمانییەکانەوە. هەمەوەندەکان مل کەچ ناکەن. لەدوای زنجیرەیەک شەڕو کوشتاری خوێناوی لەساڵی ۱۸۵۵دا بازیانو چەمچەماڵ بەجێ دەهێڵن ئاوارەی زەهاوو قەسری شیرین دەبن.

بەلآم هەمەوەندەکان بێ دەنگ نەبوون بەرامبەر عوسمانییەکان، بەڵکو ڕۆژانە هێرشیان دەکردە سەر سنووری عوسمانییەکان، هەتا (شاخی حەمرین) هەرچ

---

۱- (ن. ف.هەمەوەند).

قافڵەیەکی عوسمانییان تووش بهاتایە دەستیان لێ دەکردەوەو زەبری گورچک بڕیان لێ دەداو پاشان دەگەڕانەوە زەهاو. بەم جۆرە حەوت ساڵان بەردەوام (دەستەی سوارەی) هەمەوەندەکان لە هاتووچۆی ئەم دیو و ئەودیوی زەهاوو سنووری کەرکووک بوون بۆ لێدانی عوسمانییەکان. لەساڵی ۱۸٦۲دا حکومەتی عوسمانی بەناچاری رێی دایە هۆزی هەمەوەند بگەڕێنەوە ناوچەکەی خۆیانو گەڕانەوە بۆ بازیانو چەمچەماڵ.

بەدرێژایی نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوو پەیوەندی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و هۆزی هەمەوەند لە هەڵکشان و داکشاندا بوو. هەمەوەندەکان ئاوارەی زەهاو بوون و دووبارە گەڕانەوە بازیان. لەبەر ئەنجامی ڕێککەوتن لەماوەی زیاتر لە (٥٠) پەنجا ساڵدا (١٩) نۆزدە جار ئاوارە بوون و لە دژی عوسمانییەکان یاخی بوون. لەدوای (٧) حەوت ساڵ مانەوە لەزەهاو دەگەڕێنەوە بازیانو چەمچەماڵ و لەدوای (٥) پێنج ساڵ لەسەردەمی (نامیق پاشا) والی بەغدا دەکەونە شەڕەوە، دووبارە ئاوارەی زەهاو دەبنەوەو پاش ماوەیەک دەگەڕێنەوە بازیانو چەمچەماڵ.

لەسەردەمی (مەدحەت پاشا)ی والیی بەغدا (١٨٦٩-١٨٧٢) لەگەڵ عوسمانییەکان تێک دەگیرێن و دووبارە لەلای (دوانزە ئیمام)ی نزیک شارۆچکەی کفری لەگەڵ هێزێکی گەورەی پێکهاتوو لە(چەرکەس) دەکەونە شەڕەوەو هێزی حکومەت تێک دەشکێنن و پاش تێک شکاندنی هێزەکەی عوسمانی ناوچەکە بەجێ دەهێڵن و بۆ زەهاو دەچن»[١].

پاشان (ڕەئووف پاشا) دەبێتە والیی بەغداو بانگی سەرۆکەکانی هۆزی هەمەوەند دەکا بێنەوە بەغدا. لەئەنجامی گفتوگۆ هەردوولا ڕێک دەکەون. هۆزی هەمەوەند دەگەڕێتەوە بازیانو چەمچەماڵ. هەمەوەندەکان لە پاش تۆمارکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیە تا ساڵی (١٨٧٥ز) بەئاسوودەیی دەژیان.

---

١- (زكي، تاريخ سليمانية)، ل١٩٠.

لەوکاتانەدا کە ئاگری شەڕ لەنێوان دەوڵەتی عوسمانیو رووسیا هەڵگیرسا، هەمەوەندەکان لەو شەڕەدا بەناوی «جیهاد» پاڵپشتی عوسمانییەکانیان کردو رووبەڕووی لەشکری بێ شوماری رووسەکان وەستان هەتا بەرەی شەڕ لە «قەوقاز» سەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێناو دەستکەوتی زۆریان لەچەک و تەقەمەنی هێنایەوە بازیانو چەمچەماڵ»[1].

ئەم بەشداری‌یەی هەمەوەند لەم شەڕە لەپاڵ دەوڵەتی عوسمانی زیاتر بە فاکتەری جیهادەوە بووە، چونکە زۆرجار ئەمارەتو کیانەکانی ناکۆک بەدەوڵەتی عوسمانی لە حاڵەتی جەنگو کوشتارو مەترسی بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی کێشەی خۆیان خستۆتە لاوەو پارێزگاریان لە سوڵتانی عوسمانی کردووە لەدژی ناحەزەکانیو لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ دووبارە ناکۆکی لەنێوان ئەوانو عوسمانییەکان دەستی پێکردۆتەوە.

هەمەوەند ماوەیەکی زۆر لە هێمنی و ئارامیدا ژیان، دەسەڵاتیان بەسەر ئەو هەرێمەدا فراوان بوو، لەسەر موڵکو ماڵی خۆیان حوکمیان دەکردو سەربەرزانە دەژیان. لەدوای حەمەی کوڕی جوامێری یەکەم و کوێخا رەسوڵ دەسەڵاتی هەمەوەند دەکەوێتە دەستی - مام سلێمان -ی کوڕی کوێخا رەسوڵ، ئەمیش پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی عوسمانی بەهێز دەکاتو هەندێ لە پیاوانی هەمەوەند لەدامو دەزگای حکومەتی دەکاتە خاوەن پلەوپایە، خۆشی دەچێتە سلێمانی پایەی سەربازی وەردەگرێ. فەقێ قادری هەمەوەند شاعیری رۆشنبیری ناوداری کورد برای بوو، هاوکارو تەواوکەری ئیشوکارەکانی بوو.

بەڵام ساڵی ١٨٧٨ز شەڕی (خان ئیبراهیم خانچی) لەنێوان هۆزی هەمەوەندو زەنگەنە دەستی پێ کرد بەهۆی کوشتنی یەکێ لە سەرەک تیرەی هۆزی هەمەوەند بەدەستی زەنگنە لەئەنجامی ئەم شەڕە هۆزی زەنگنە دەشکێن و بۆ (شێخ لەنگر) دەچن، لەوێ داوای هاوکاری و هێز لە حکومەتی عوسمانی

---

١- (زکی، تاریخ سلیمانیة)، ل١٩١.

دەکەن. والیی بەغداش هێزێکی گەورە بۆ پاڵپشتی زەنگنە دەنێرێ لەدژی هەمەوەندەکان. هێزەکەی عوسمانی بەسەرۆکایەتی «عەبدوڵلا ئەفەندی خانەقینی»و «قائیمقامی کفری»و بەبەشداری چەند هۆزێکی تر وەک (زەندو پالانی‌و باجەلانی‌و تالەبانی)، بەفەرمانی قائیمقامی کفری بەشداری شەڕەکە دەکەن لەدژی هەمەوەند. هەموو ئەو هێزانە بەسەرۆکایەتی (عەبدوڵلا ئەفەندی خانەقینی) یەک دەگرن و پاڵپشتی هۆزی زەنگنە دەکەن و دوو تۆپی قورس لەم شەڕەدا لەدژی هەمەوەندەکان بەکار دەهێنن.

لە (شێخ لەنگر) شەڕ دادەمەزرێت، هەمەوەندەکان سەردەکەون و هەردوو تۆپەکە دەست هەمەوەندەکان دەکەوێت، لەگەڵ چەندین پارچە چەکی ترو چەندین کەسیش بەدیل دەگرن.

لەکاتی گەڕانەوەی هەمەوەندەکان بەرەو شاری کەرکووک، لەڕێگا، دووبارە لەگەڵ دوو فەوجی عوسمانی تووشی شەڕ دێن و توانییان ئەو دوو فەوجەش تێکوپێک بدەن. هێزێکی تری والیی بەغدا بەسەرۆکایەتی (ئەدهەم پاشا) لەقۆڵی کەرکووکەوە هێرش دەهێنن بۆ سەر هۆزی هەمەوەند لەلای «گۆێتەپە» لەگەڵ سوارەکانی هەمەوەند دەکەونە شەڕەوە. سەرۆکی هێزەکەی عوسمانی (ئەدهەم پاشا) بەدیلی دەکەوێتە دەستی هەمەوەندەکان و هێزەکەش تێک دەشکێنن. لە گەرمەی شەڕو بەرەنگاری، هەمەوەندەکان ژنو منداڵەکانیان دەگوازنەوە بۆ زەهاوو پاشان خۆشیان دەکشێنەوەو ناوچەکە بەجێ دەهێڵن‌و (ئەدهەم پاشا)یش ئازاد دەکەن»[1].

---

١- (زکی، تاریخ سلیمانیة)، ل١٩١-١٩٢.

# شەڕی ڕەزا قوڵی خان[1]

بەهۆی ڕوویەڕوو بوونەوەی هەمەوەندەکان و مل کەچ نەکردنیان بەرامبەر فەرمانەکانی حکومەتی قاجارییەکان و داکۆکی کردنیان لەسەر مافی ڕەوای خۆیان، قاجاریو عوسمانی ڕێککەوتن کە هۆزی هەمەوەند لەناو بەرن و بەهێزی سەربازی سەرکوتی ئەم هۆزە بکەن.

هەمەوەندەکان لە قۆرەتوو مەیدانی ئەو بەری سیروان بەیاخی بوون مابوونەوە. حکومەتی عوسمانی بەسەرکردایەتی (محەمەد پاشا)ی والیی بەغدا لەشکرێکی گەورەی کۆکردەوەو بەرەو ڕووی هۆزی هەمەوەند کەوتنە ڕێ.

حکوومەتی قاجاریش بەسەرپەرشتی (ڕەزا قوڵی خان) لەشکرێکی بێ شوماری لە هەمەوەندەکان نزیک کردەوە، بەپێی ڕێکەوتننامەکە بڕیار بوو هەردوولا لەیەک کاتدا لە هەمەوەندەکان بدەن و لەناویان بەرن، بۆ ئەوەی هەتاهەتایە سەرهەڵنەدەنەوەو نەتوانن ململانێی حکومەتەکان بکەن.

هەمەوەندەکان خێزانەکانیان ئاگادار کردەوە، کە لەکاتی سەرنەکەوتن یا تێشکان هانا بۆ (محەمەد پاشای چەوتان) بەرن بۆ ئەوەی داڵدەیان بدات و لەدەست درێژی پارێزراو بن.

هەمەوەندەکان دڵنیابوون لەوەی کە سوپای عوسمانی بەدوو هەفتەی تر ناگاتە سەریان و لەشکری قاجاری بەسەرکردایەتی ماریاس خان نزیکیان ببوو و لە ئانوساتی هێرشکردن بوون.

هەمەوەندەکان بەپێی نەخشەیەکی سەربازی بەدرێژایی ماوەی نێوانیان ٤٠٠ چوارسەد سواریان لە کەمینا دامەزراندو لە (سیانادێر)ی زەهاو ١٠٠ سەد سوارەی هەمەوەندیش لەنزیکەوە ڕووبەڕووی هێرشی لەشکری دوژمن بوونەوە.

---

١- (زکی، تاریخ سلیمانیة)، ل١٩٢.
أ- گۆڤاری تایم، هەمان ڕوون کردنەوەو هەمان ژمارە.
ب- (ن.ف.هەمەوەند).

شەڕ دەستی پێکردو بەدەم شەڕەوە بەرەو دواوە دەکشانەوە. لەشکری ماریاس خانیش دوایان دەکەوتن و وایان دەزانی تێک شکاون، بەڵام کاتێکیان زانی کەوتوونەتە ناو قووڵایی کەمینەکەوە ئەوسا هەموو سوارەکانی هەمەوەند لەهەموو لایەکەوە پەلاماری لەشکری ماریاس خانیان داو داستانێکی خوێناویی گەورە تۆمار کرا. ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژراو ئەوانی تر بەرەو بارەگاکانی خۆیان هەڵهاتن. لەم شەڕەدا وەک مامۆستا محەممەد ئەمین زەکی دەڵێ چەندین هەزار هێستری بارکراوی دوژمن کەوتە دەستی هەمەوەندەکان»[1]. شەڕ هەر بەردەوام بوو، هەمەوەندەکان بەدوای لەشکرە هەڵاتووەکەی ماریاس خان چوون، لەرێگا زیاتر لە (١٥٠) سوارەی تری دوژمنیان کوشت و، بەرەو بارەگای ماریاس خان رۆیشتن. لەشکری بەرامبەر شپرزەبوون لەو شەڕەدا. (ماریاس خان)یان سەربڕی و بەرەو بارەگای رەزاقولی خان بەدەم شەڕەوە رۆیشتن، بۆیە پێش گەیشتنی هەمەوەندەکان بارەگاکانیان چۆڵ کردو هەڵهاتن. ئەم داستانە ١٧ حەڤدە رۆژی خایاند. لەم سەرکەوتنە گەورەیە ئافرەتی هەمەوەندیش، شان بەشانی پیاوەکانیان لەدژی لەشکری قاجاری شەڕیان دەکردو ئەم بەیتە شیعرەیان بەدەنگێکی زوڵاڵ دەوتەوە:

سوارەی ترتان بۆ هات بە پۆڵاوە
بەتیر دەسمێ مەل بەحەواوە

سوارە ئازاکانی هەمەوەند بەدیلو دەسکەوتەوە لە قووڵایی شەرگەکەوە گەڕانەوە. لەنێوان دەستکەوتەکاندا سێ تۆپیان گرتبوو لەسەر عارەبانە دامەزرابوون. بەدارو پەڕۆ لەشێوەی جەستەی ماریاس خان پەیکەرێکیان

---

١- تاريخ سليمانية وانحائها، ل١٩٢.

دروست کردوو پاشان سەری ماریاس خانیان لەسەر دامەزراندو لەگەڵ ژمارەیەک لاشەی کوژراوی تردا بەدیاری ناردیانەوە بۆ (محەمەد پاشا)و سوپاکەی کە نزیک هەمەوەندەکان ببوونەوەو خۆیان بۆ هێرش ئامادە کردبوو. (محەمەد پاشا) کە چاوی بەو دیمەنە دەکەوێ ترس‌و گومان سەراپا هۆشی داگیر دەکاو ورەی لەشکرەکەیشی دادەبەزێ و هەموو دەستەوەسان دەمێنن. (محەمەد پاشا) وەڵام بۆ هەمەوەندەکان دەنێرێت و ئاگاداریان دەکاتەوە کە (هێزەکانیان لەشوێنی خۆیاندا بمێننەوە)، بە خێرایی سوڵتانی عوسمانی لەئەنجامی شەڕەکە ئاگادار دەکاتەوەو دەڵێ: گەر ئێمەش شەڕ بکەین لەگەڵ هۆزی هەمەوەند چارەنوسمان باشتر نابێت، سوڵتان لە وەڵام دا داوای ئاشتی‌و گەڕانەوەی هەمەوەندەکانی کرد بۆ چەمچەماڵ‌و بازیان. دووبارە بەناسوودەیی و بە سەربەرزی لەسەر زەوی و ماڵ و حاڵی خۆیان دادەنیشن.

لەساڵی (١٨٨٠ز-١٢٩٨ک) بەرەی کەرەم وەیس کە هۆزێ بوون لە عەشیرەتی شاتری جاف لە (برایم سەمین) لەکاتی ڕاودا دایان بەسەر (حەمەد پاشا)ی جاف داو کوشتیان، بەهۆی ئەوەی پێش ئەو کاتە (حەمەد پاشا) سەرۆکەکەیان بەند کردبوو کە ناوی (شاوەیس کەرەم وەیس) بوو لە بەندەکەدا دەمرێت.

دوای خۆی (عەزیزی) کوڕی بووبوو بە سەرۆکی عەشیرەتەکەو لە تۆڵەی باوکیدا (حەمەد پاشا)ی کوشت.

لەدوای کوشتنی (حەمەد پاشا) هیچ بەرەو هۆزێک لەو وڵاتەدا داڵدەی (کەرەم وەیس)ەکانی نەدا، تەنها جوامێر ئاغای هەمەوەند نەبێت، کاتێک پەنای بۆ دەبەن ئەویش داڵدەیان دەدا.

(مەحموود پاشا)ی کوڕی (حەمەد پاشا) لەشکری جافی ئامادەکردو (٥٠٠) ئێستر سواری سەربازیشی لە حکومەتی عوسمانی وەرگرت. نامەیەکی بۆ جوامێر ئاغا نوسی کە داڵدەی (کەرەم وەیس)ەکان نەدات. جوامێر ئاغا بەپێچەوانەی نیازەکەی (مەحموود پاشا) جوابی نامەکەی دایەوە وتی:

سەروماڵم لەسەر ئەم هۆزوبەرە دائەنێم. (مەحموود پاشا) هێرشی کردە سەر هۆزی هەمەوەند. لەنزیک «گل» شەڕ دەستی پێ کردو لەئاکامدا عەشیرەتی (جاف) شکان، پاشان (تەقی پاشا) والیی بەغدا هێزێکی سەربازی نارد کە پشتگیری لە هۆزی جاف بکات. شەڕو ملململانێی سەخت روویدا لەنێوانیان، هەمەوەندەکان خێزانەکانیان ناردە زەهاو، خۆشیان لەدیوی عێراق مانەوە. دوو مانگ شەڕو کوشتاری بێ وچان بەردەوام بوو کە هەر لەوشەڕەدا (دەروێش)ی برای جوامێر ئاغا دەکوژرێت.

لەئاکامدا شەر دەبێتە شەڕی هەمەوەند بەرامبەر تورک و جاف، بۆیە جوامێر ئاغا هێزەکەی دەکێشێتەوە بۆ زەهاو، ئەم شەڕە شەڕی هەمەوەند نەبوو، بەڵام قاپی هەمەوەندی گرت لەبەر پابەندی بە دابو نەریتی کوردەواری.

بەگەیشتنی جوامێر ئاغاو سوارەکانی بۆ ناو ئێران لەلایەن کاربەدەستانی ئێرانییەوە پێشوازی گەرمیان لێ دەکرێ"[1].

(ظل سولتان) والیی ئەوکاتەی (ئەسفەهان) پەیوەندی پتەوی لەگەڵ (جوامێر ئاغا) دەبێت. لە ساڵی ۱۸۸۰ز (جوامێر ئاغا) (قەسری شیرین)ی کرد بە مەڵبەندی خۆیو هۆزەکەی. والیی (ئەسفەهان) جوامێر ئاغای کرد بە حاکمی زەهاوو مانگێ (۱۰۰۰)هەزار تومەنی بۆ بڕیەوە. توانی هەموو خزمو کەسو کارەکانی لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو پلەو پایەی بەرزیان بداتێ. هەروەها قەڵایەکی بەرزی لە (قەسری شیرین) دروست کرد ناوی نا (قەڵای جوامێر ئاغا) کە تائێستا شوێنەوارەکەی هەرماوە. هەمەوەندەکانیش سەربەرزانە لەزەهاوو قەسری شیرین دەژیان. بەلابردنی (ظل سولتان) لەلایەن حکومەتی ئەو کاتەی ئێران لەرێگەی والیی تازەوە پەرچ و گیروگرفت دەخرێتە رێی

---

۱- سوودمان لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:
ا- (ن. ف. هەمەوەند).
ب- (زکی، تاريخ سليمانية)، ل۱۹۳-۱۹٤.

(جوامێر ئاغا)و هۆزەکەی"[١]"، ئەوانیش قبوولی ناکەنو دەکەونە شەڕەوە.

دەوڵەتی قاجاری سوپایەکی گەورە ڕێک دەخات بەسەرکردایەتیی (حسام الملک)و لەم لاشەوە حکوومەتی عوسمانی لەشکرێ دەنێرێت بۆ سەر هەمەوەندەکان بەسەرکردایەتی (قودرەت ئیسماعیل پاشا).

(حسام الملک) کە سوپاکەی نزیک (قەسری شیرین) دەبێتەوە، دەنێرێت بەدوای جوامێر ئاغا کە بەناوی ڕێککەوتن بچێت بۆ سەربازگاکەی. (حسام الملک) هەندێ لە سەربازەکانی خۆی لەپشتی دەوار (خێمە)کەیدا دەشارێتەوە، لەو کاتەی جوامێر ئاغا دەچێ بۆ لای، لە ناکاو پەلاماری دەدەن و دەیکوژن. پاشان هەمەوەندەکان دەگەڕێنەوە بۆ سنووری قەرەداغ"[٢]". ئەم هۆنراوەیەش بوێژان بەسەر جوامێر ئاغا هەڵیان داوە کە دەڵێن:

قەلاکەی قەسر بوو بەزەمزەمە

جوامێر بەخەنجەر تورکان بەقەمە

بۆچوونی تر زۆرن لەسەر شێوەی کوشتنی جوامێر ئاغا بەدەستی حسام

---

١- (زکی، تاریخ سلیمانیة)، ل١٩٤.

٢- مامۆستا محەمەد سەعید سەلیم جاف لەباسێکدا بەناونیشانی چوکلّ هەمەوەند کێیە؟» دەڵێ: خوشکی (شای ئێران) لە ئێرانەوە دەچێت بۆ شاری بەغدا بۆ زیارەتی شوێنەوارە پیرۆزەکان لەکاتی گەڕانەوە ڕێگای پێ دەگرن یەکێ لە سوارەکان بەدرەوشتیی لەگەڵ دەکاتو پێی دەڵێت: من جوامێر ئاغای هەمەوەندم.

خوشکی شا دەگەڕێتەوە ئەلها لەدەستی جوامێر ئاغا دەکات. کارەسانەکەی ڕێگا بۆ شا دەگێڕێتەوە. شای ئێران بەبێ لێکۆڵینەوە سوپایەکی گەورە ئامادە دەکات بۆ هێرش بردنە سەر جوامێر ئاغا. هەروەها لەگەڵ حکوومەتی عوسمانی ڕێک دەکەوێت بەهێزی سەرباز هەردوو لایان لە هۆزی هەمەوەند بدەن و لەناوی بەرن.

(جوامێر ئاغا) بێ ئاگابوو لەو مەسەلەیە زۆر بەسادەیی مەسەلەکەی وەرگرتبوو، نەی ئەزانی هۆی سەرەکی ناکۆکی ئێران چییە لەگەڵیدا. بڕوانە ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (٧١).

الملک"[1]*.

هەمەوەندەکان لەمێژ بوو لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە پیلانی نینۆککردن ولاوازکردنیان بۆ دارێژرابوو، چونکە هێزی هەمەوەند لەساڵی ١٧٨٧ز هەتا ساڵی ١٨٣٨ بەبەردەوامی پشتگیری لەپاشا یەک لە دوای یەکەکانی بابان کردووە لە دژی والییەکانی بەغدا و ڕێگەی کەرکووک- سلێمانی لەژێر کۆنترۆلی ئەواندا بووە.

---

١- کاک محەمەد فاتیح حاجی قارەمان کە لە باپیرو ریش سپیی هەمەوەندەکانی بیستوە کە ئێستا لەژیاندا ماوە دەڵێ: (کاتێک سوپای ئێرانی دێنە نزیک (قەسری شیرین) (حوسام الملک) دەعوەتی جوامێر ئاغا دەکەن بۆ سەربازگاکەی خۆی.

(جوامێر ئاغا)ش هیچ لەخۆیدا شک نابات، بڕیار دەدات کە بچێت. بەڵام هەندێ لەخزم و کەسەکەی رازی نابن کە بچێت. لەوانە (خەلیفە) بە (جوامێر ئاغا) دەڵێت مەچۆ ئەم لەشکرە بۆ سەر ئێمەیە بەڵام بێ سوود بووە.

(جوامێر ئاغا) دەکەوێتە ڕێ و چەند پیاوێکی تری هەمەوەند لەگەڵی دەڕۆن بۆ سەربازگاکە.

کە دەگەنە سەربازگاکە (حوسام الملک) پێشوازییان لێ دەکات. لەکاتی نان خواردن لەهەموولایەکەوە تەقە لە (جوامێر ئاغا) و خزمەکانی دەکەن و هەموویان لەوشوێنەدا دەکوژن. تەنها یەکێ لەبراکانی خەلیفە رزگاری دەبێت کە ناوی (عەبدوڵلای شاکەرەم) دەبێت و بە بریندراری خۆی دەرباز دەکا.

(حسام الملک) سەری جوامێر ئاغا لێ دەکاتەوەو دەیبات بۆ شای ئێران. سەری (جوامێر ئاغا) دەبرێتە بەردەستی خوشکی شاو ئەویش دەڵێت ئەمە نییە و هیچ شێوەی بەوەی ڕێگا ناکات کەکاری بەدڕەوشتی لەگەڵدا کردم.

شا بۆی دەردەکەوێت کە جوامێر ئاغا بێ گوناح بووە زۆر لەکارەکەی پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام کار لەکار ترازاوە. (جوامێر ئاغا) کوژرا و هۆزەکەشی بەدەم شەڕەوە پاشەکشەیان کرد بۆ عیراق و بڕبڕبوونە. چونکە وەک دەڵێن (لەدەمی گورگ رزگاریان بوو کەوتنە دەمی شێرەوە)، هەردوو حکوومەت ناحەزی گورد بوون.

پاش ئەو شەڕو بارودۆخە شای ئێران (ئەحمەد کوڕی جوامێر ئاغا) دەباتەلای خۆی پلەی بەرزی لەزەهاو بۆدیاری دەکات و برازایەکی خۆی لێ مارە دەکات بە ناوی (قەمەر). پاش گوازستنەوەی (قەمەر) دووکوڕیان دەبێ بەڵام ئەحمەد کوڕی جوامێر زۆر دڵ تەنگ دەبێت و دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی لە (عەلی مەنسوور) جێ نشین دەبێت.

هەر هۆزو تیرەیەکی دراوسێی هەمەوەندەکان ناخۆشییان بکەوتایەتە نێوانیان بێ سێ‌و دوو والیی بەغدا پشتیوانی لێ دەکردن لەدژی هۆزی هەمەوەندەکان. شتێکی غەریب نییە نەخشەی مەرکەزی دابڕێژێ بۆ نەفی کردن«[1]» و دوور خستەوەیان لەزێدی باب و باپیرانیان و ئەو دەردو میحنەتەیان تووش بکات کە لەورێگەیە تووشی بوون لە ئاوارەیی و برسیەتی و دەربەدەری لەپاش کوشتنی جوامێر ئاغا و گەڕانەوەی هەمەوەندەکان بۆ عێراق.

شەڕی هەمەوەند لەگەڵ قاجارییەکان دەست پێ دەکا، لەئەنجامدا هەمەوەندەکان پاشەکشە دەکەن بۆ سنوورەکانی عێراق، بەڵام لەوکاتانەدا دەکەونە ناو بۆسەی لەشکری عوسمانی. پاش شەڕو بەرگری لە نێوان ئەودوو ئاگرە، دەرباز دەبن و دەستە دەستە هەریەک بەلایەکدا رێ دەگرن و روونەکەنە شوێنێک. حکوومەتی عوسمانی «فەرمانی گرتن»ی هەمەوەند دەردەکا نە چ شوێنێک بن بە ماڵ و منداڵەوە بەند بکرێن.

ئەو هەمەوەندانەی وەک لە بازیان و لە چیاکانی (سورێن«[2]»، قەرەداغ) و ناوچەی خانەقین دەبن ماوەی سێ مانگ بەوجۆرە دەمێننەوە، بەرگری لەخۆیان دەکەن، بەڵام کەسیان ئاگایان لەکەسیان نابێت و هەواڵی یەکتر نازانن.

حکوومەتی عوسمانی بۆئەوەی سنوورێک بۆ جموجۆڵی هەمەوەند دابنێ و بەپێی نەخشەی تایبەتی خۆی لەگەڵ حکوومەتی قاجاری بڕیاری نەفی کردنی ئەم هۆزە دەدەن«[3]». لەوکاتە ناسکەدا کە جوامێر ئاغا لەزەهاو بەفێڵ دەکوژرێ هۆزەکەی پەرتەوازە دەبێت، بەڵام هەمەوەندەکانی سنووری بازیان و چەمچەماڵ لە بڕیاری نەفی کردن بێ بەش نابن. بۆیە لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانی بانگهێشتیان دەکەن بۆ فرقەی کۆنی کەرکووک، زۆربەی پیاوە ناودارەکانی هەمەوەند لەو کۆبوونەوەیە ئامادەدەبن، بەناوی سوڵتانەوە پێیان ڕادەگەیەنن کە

---

١- د. حامد محمود عيسى - المشكلة الكردية)، ل٢٢-٢٥.

٢- چیایەکە نزیک شاری هەڵەبجەیە دەکەوێتە نێوان سنووری عێراق و ئێران.

٣- (ن.ف. هەمەوەند).

هێرشە ناڕەواکانتان ساڵەهای ساڵە زەرەرو زیانی زۆری لێ داوین و بۆتە هۆی دواخستنی دەسەڵاتی عوسمانی، بۆیە بڕیارمان داوە بگوێزرێنەوە بۆ شاری (رومادی)، حکومەت ئۆردوگاتان بۆ دەکاتەوەو مەسرەفتان دەکێشێ پاش ئەوەی کە دەستان لە ئاژاوەو هێرش کردن هەڵگرت، ئەوە سوڵتان بەزەیی پێتان دێتەوەو دەتانگەڕێنێتەوە شوێنەکانی خۆتان.

بارودۆخی هەمەوەند زۆر سەخت و ناخۆشبوو. کوشتنی جوامێر ئاغا زۆر کاریگەر بوو بۆ سەر هەمەوەند، بۆیە لەژێر ئەو فشارە رازی بوون بەوەی راگوێزکرێن بۆ (رومادی). بەڵام لەکاتی بردنیان دەرکەوت کە ئەمە نەخشەو پیلان بوو بۆ گرتنیان، چونکە لەگەڵ دیلەکانی ئێران یەک خران و دوورخرانەوە بۆ تورکیا و شوێنەکانیتر. فەقێ قادری هەمەوەند سەبارەت بەم فێڵو تەڵەکەبازییەی تورکەکان لەم هۆنراوەیەدا دەڵێ:

«بەدام و تەزویر بە حیلەو بەفەن؛
هاکەفتی ئەدام تورک ئەهرەمەن
هەرکەس بەتورکان بکەرۆ باوەڕ؛
ئەحمەق ئەو کەسەن جەمن ئەحمەق تەر»[1]

فەقێ قادر خۆیشی نەفی دەکرێت بۆ لیبیاو ساڵی (١٣٠٥)ی. ک. کۆچی دوایی دەکات، لە «درنە»ی بەنغازی بەخاکی غەریبیی دەسپێرن، تا ئێستاش ئارامگاکەی هەر لە لیبیایە.

بۆ مەبەستی گرتنی هەمەوەندە (یاخی بووەکان) حکومەتی عوسمانی (مەفرەزەی) تەعقیبات دروست دەکات بۆ گرتنیان بەهەر جۆرێک بێت. ئەوەی دەگیرێ یاخۆی دەدا بەدەستەوە باڵبەست دەکرێتو بەبەندکراوی دەینێرن بۆ پێگای سەربازی لە کەرکوک، لەوێ کۆمەڵ دەکرێن. لەم بارودۆخە ناهەموارەدا کەس نابێت داڵدەی هەمەوەندەکان بدات لەترسی حکومەتی عوسمانی.

---

١- کۆمەڵەی شیعری فەقێ قادری هەمەوەند- بەغدا- ساڵی ١٩٨٠، ل٢٣.

تەنانەت کەس نەیدەوێرا بەئاشکرا لە گوندەکاندا نانیان بداتێ. زۆربەیان لەکاتی گەڕانیان بۆ نان پەیداکردن تووشیان دەبوو بە تووشی مەفرەزەکانی تەعقیبی عوسمانی یا دەگیران یا دەکوژران.

لەنێوان ئەو هەمەوەندانەی کە لەچیاکان مابوونەوە حوسێن خان خۆی و چەند کەسێ لە خانەقین دەگیرێن. مستەفا ئەحمەد گوڵاوی لەنزیک خانەقین تووشی مەفرەزەی تەعقیبی عوسمانی دەبێ پاش شەڕێکی سەخت مستەفا دەکوژرێ‌و حەمەرەش هەمەوەندیش خۆی و کوڕەکانی خۆیان دەرباز دەکەن و دەچنە ناو سنجاوییەکان کە لەگەڵیاندا خاڵوخوارزان. عەزیز خەسرەو و ئەفەندی کاکە عەبدوڵڵا سوور و مەحموود حاجی خانەو فەتاح ساڵح و سلێمان ساڵح سێتەبەسەرو قادرە گێژو هەندێ لە سۆفیوەندەکان هەر لەسنووری خانەقین پاش شەڕێکی سەخت تەقەمەنییان پێ نامێنێ‌و دەگیرێن.

هەندێ لە بەگزادەکان‌و سێتەبەسەرەکان لەنزیک هەڵەبجە تووشی مەفرەزەکانی عوسمانی دەبن، پاش شەڕێکی گەرم دەگیرێن. هەندێکی تریشیان دەچنە ماڵی شێخ سلێمان حەفیدزادەو پەنا بۆ ئەو دەبەن، بەڵام لە ماڵی ئەو زاتە پیرۆزەدا لەلایەن حکوومەتی عوسمانییەوە دەگیرێن و دەیانبەن بۆ زیندانی کەرکووک. مەحموود خدریش لە مووسڵ خۆی دەدا بەدەستەوە.

بەم جۆرە زۆربەی هەمەوەند لە کەرکووکەوە دەگیرێن و بەبەندی دەیانبەن بۆ شاری مووسڵ و پاشان حکوومەتی قاجاری هەمەوەندە دیل‌و گیراوەکانی«[1]» لای خۆی دەنێرێ بۆ کەرکووک. لەوێشەوە بەبەندی دەیانبەنە شاری مووسڵ، ئینجا هەموویان بە خاووخێزانەکانیانەوە بەپیادە دەبرێن بۆ (ئەدەنە) لە تورکیاو لە ئۆردووگایان دەکەن. هەرچەندە لەرێگا هەندێکیان بەهۆی نەخۆشی و برسێتی

---

١- ئەو (هەمەوەند)انەن کە لەکاتی کوشتنی جوامێر ئاغا لە نەلای جوامێر و لەو شەڕانەی کە لەگەڵ قاجارییەکاندا کردیان لەوکاتەدا، هەندێکیان لەئێران بەدیل دەگیرێن. ئەمەش بەڵگەیە کە حکوومەتی عوسمانی‌و قاجاری بەپێی بەرنامەیەکی دارێژراو دەیانویست بەربنە گیانی ئەم هۆزە کوردە.

دەمرن. لەو راگواستنەدا چەندەها سەرگوزشتەی تاڵو ناخۆشی لێ دەگێردرێتەوە"[1]. هەمەوەندە نەفی کراوەکان لە ئۆردوگای (ئەدەنە) لەنێو خێوەتو رەشماڵدا بەدەست بەسەری دادەنێن. سوڵتان عەبدولحەمیدو دایکی سەردانێکیان دەکەنو بەناویاندا دەگەڕێنو دیمەنی یاخی بوونو ململانێیەکانیان بیردەکەوێتەوەو دەڵێ: «هەموویان فرێ بدەنە دەریای ناوەڕاستەوە»، بەڵام دایکی هەڵدەداتێو دەڵێ: «گەر ئەمانە تاوانیشیان کردبێ ژنو منالەکانیان گوناهیان چییە؟» تۆ لە مەغریبەوە تا سعوودییەت لەبن دەستدایە. چاکتر وایە دابەشیان بکەی بەسەر ئەو ویلایەتانەدا. چەند ساڵێکی تر ئەمانە دەمرنو وەچەکانیان زمانو کەلتوورو دابو نەریتیان لەبیر دەکەن"[2].

سوڵتان عەبدولحەمید پێشنیارەکەی دایکی پەسند کرد، هەروەها کاربەدەستانی عوسمانی چەندین مەزیەتەیان بەرزکردەوە بۆ سوڵتان بۆ ئەوەی دابەش بکرێن بەسەر دورگەکاندا. یەکێک لەو مەزیەتانە لە بەرواری (٢٢)ی تەمووزی ساڵی ١٨٨٦ز کەوتە بەردەستی سوڵتانی عوسمانی. رۆژی ١٣ی (ذي الحجة) ساڵی ١٣٠٤ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨٨٧ی زایینی (سەدرولئەعزەم) لەگەڵ وەزیرەکانیدا، بڕیاری دابەشکردنی هەمەوەندەکانیان ئیمزا کرد.

لە چەند بەڵگەنامەیەکی تورکیدا هاتووە"[3" کەچۆن هەمەوەندەکان لە ئاسیای بچووک بەسەر ناوچەکانی مووسڵ و ماردین و هەکاریدا دابەش کران و دواتر بۆ لیبیا دوورخرانەوە. لەبەر گرنگیی ئەو بەڵگەنامانە لێرەدا هەندێکیان دەخەینەڕوو.

---

١- ن.ف. هەمەوەند.

٢- گۆڤاری تایم، ژمارە ٧ ساڵی ١٩٩٨، ل٢٤-٢٧.

٣- د. عەبدوڵلا عەلیاوەیی (کوردستان في عهد الدولة العثمانية (١٨٥١-١٩١٤) رسالة دكتوراه غير منشورة.

**Musul-Kerkuk: iieigili, Ars,iv Belgeeieri (1525-1919) Ankara 1993**

## بەڵگەنامەی ژمارە ٢٦

لە (٧)ی جەمادی یەکەم لەساڵی ١٣٠٤ ژمارە ٤٨٨ پەسەندکردنی هەمەوەندە یاخییەکان و گەڕانەوەیان لە ئێران و جێنشین کردنیان:

«هەڵاتنی یەکێک لە سەرۆکە هەمەوەندە یاخییەکان بەناوی (تاقی قادر) بە خۆی و(٢٠٠) سوارەوە بەپێی ئەو زانیارییانە کە لەو برووسکانەی کە لە مووسڵەوە گەیشتوون، هۆی داواکردنی یاخییە هەمەوەندەکان لەلایەن حکوومەتی عوسمانییەوەو دەخاڵەت کردنیان بەدەوڵەت زانراوە.. ئەمە لەو برووسکەیەدا زانراوە کە نێرراوی (موشیری)یە لە سوپای شەشەمی عوسمانی، لە (٧)ی جەمادی یەکەمی ساڵی (١٣٠٤)دا هاتووە».

## بڕیار

لەژێر رۆشنایی برووسکەی پێشوو مەرقوم (تاقی قادر) لەگەڵ (٢٠٠) سوارەکە داوای تەدەخولی دەوڵەتی کردووە، داواکەی پەسند کرا بۆ پەناهێنانی هەمەوەندەکان. لە سنوورەوە هەموو ئیشەکانی جێبەجێ کرا. ئەو جێیانە دیاری کران کەیاخییە هەمەوەندەکانی تیا نیشتەجێ دەبن، پاشان ویلایەتی مووسڵ ئاگادار کرایەوە لەگەڵ چاودێری ناوخۆیی و (سر عسکر) بۆ هەمان مەبەست.

ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوە، چاپخانەی ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (٦/٧٣) بەپێی بروسکەی (ئیسماعیل حەقی) کارمەندی (ئیسلاحات) بۆ (مەقامی صدارة العظمی). نیشتەجێ کردنی ٤٤ خێزانی هەمەوەند لە مووسڵ و ٣٣ لە ماردین ٤٤ خێزان لە هەکاری. بەڵام هەر لە دوای نیشتەجێ کردنیان کەوتنە نانەوەی ئاژاوە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە، لەبەرئەوە خەڵکی شاری مووسڵ کەوتنە بەرزکردنەوەی سکاڵا بۆ (سەدرولئەعزەم) لەهەمان ساڵی ١٨٨٦زدا.

- هەروەها لەبەڵگەنامەیەکیتردا بە ژمارە (٣١) کە لە ساڵی ١٨٨٦دا دراوە بە (سەدرولئەعزەم) بەم شێوەیە هاتووە:

بەڵگەنامەی ژمارە (٣١) بۆ خاوەن دادیاری (سەدرولئەعزەم)

مووسڵ لەبەر سۆزو خۆشەویستیی ئێوە هەمەوەندەکانی گرت باوەش، بەڵام بەم کارەی زیانی زۆری بە دانیشتوانی خۆی گەیاندو زوڵمی زۆری لەوانە کرد کە جێی متمانەی (ئیسماعیل پاشا) بوون. بۆیە سزادانی ئەم ئەشقیانە و سەپاندنی پارە پێویستە. بەشێکی ئەو یاخییانە لە ویلایەتەکەمان و هەتا دەگاتە ماردین و هەندێکی تریش کە لە مەڵبەندی ویلایەت نیشتەجێ کران بەهۆی تێکەڵاویی منداڵەکانیان بە منداڵەکانمان زیانی زۆری گەیاندووە پێمان و بەدرێژایی هەشت رۆژە رێ زیانی زۆری بە گوندو خەڵکە هەژارەکە گەیاندووە. ئەمرۆ خەڵکی چاویان لە دڵۆڤانیی ئێوەیە تا دووریان بخەنەوە بۆ تەرابلوسی رۆژاوا یان شوێنێکی تری ئاوا، ئێمە چاوەڕوانی فەرمانی سوڵتانین.

١٩ی شەوالی ١٣٠٤ک، ١٣٠٣/٦/٢٧ رۆمی، ساڵی ١٨٨٦ز

**ئیمزا/ نوێنەرانی مووسڵ و وتارخوێن و کوێخاکان.**

بەپێی سکاڵانامەی دانیشتوانی مووسڵ، ئەم هەمەوەندانە جارێکیتر نیشتەجێ دەکرێنەوە، وەکو لەم بەڵگە نامەیەدا دەرکەوتووە:

**الباب العالی**

**ئەنجومەنی خصوصی**

لەژێر رۆشنایی برووسکەکەی (یاوەر نەکرەم) و کارمەندی ئیسلاحاتی بەناوبانگ (ئیسماعیل حەقی) ئەوەی کە روونی کردبۆوە لەسەر هەمەوەندەکان کە ٤٦ خێزان لە مووسڵ نیشتەجێن و ٣٣ خێزان لە ماردین و ٤٦ لەهەکاری فەرمانی سوڵتان جارێکیتر دەرچوو بۆ نیشتەجێ کردنیان لە ویلایەتی (ئەنادۆڵ) بەهۆی کێشەکانیان لەگەڵ دانیشتوان و دوور خستەوەیان لەسەر سنوورەکان. بۆ مەبەستی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان لەقوتابخانەو رێکخستنی جێگا بۆیان بەم شێوەیە نیشتەجێ دەکرێن؛ ١٠٠ خێزان لە سیواس و ٢٣ خێزان لە قۆنیەو ٥٠ خێزان لە ئەدەنەو (٥٠خێزان) لە ویلایەتی ئەنقەرە. فەرمانگاکان تێ بگەیەنن و ئیجراناتی پێویست پێشکەش بکەن لە ئەم فەرمانەدا.

١٣ذي ئەلقەعدە ١٣٠٤ك ١٨٨٦ز

ئیمزا

| | | |
|---|---|---|
| سەدری ئەعزەم | شێخولئیسلام | سەرۆکی شوورای دەوڵەت |
| محمد کامل | ئەسعەد ئەحمەد ئەفەندی | عارف پاشا |

سەر عسکر

| | | |
|---|---|---|
| **(سەرۆکی بالای سوپا)** | **چاودێری دەریایی** | **چاودێری ناوخۆ** |
| عەلی سائب | حەسەن حەسەن | مونیر محەممەد |
| **چاودێری دەرەوە** | **چاودێری دادگەری** | **چاودێری ئەوقاف** |
| محەممەد سەعید | ئەحمەد جەوودەت | هرمایۆنی |
| **چاودێری بازرگانی** | **چاودێری مەعاریف** | **چاودێری دارایی** |
| مستەفا پاشا | مونیر | محەممەد زوهدی |

راوێژکار

مۆر




ئەم بەڵگەنامەیەش کە تەئکید لەسەر جێبەجێ کردنی فەرمانی سوڵتان دەکات

باب العالی/ فەرمانگەی سەدارە/ فەرمانگەی دیوان

[جەنابی خاوەن شکۆ، هەمەوەندە نێراوەکان بە ۱۰۰ خێزان لە سیواس و ۳۳ خێزان لە قۆنیەو ۵۰ خێزان لە ئەدەنەو ۵۰ خێزان لە ویلایەتی (ئەنقەرە)، بەپێی بروسکەکەی کارمەندی ئیسلاحیە موشیر (ئیسماعیل حەقی پاشا)و بەپێی مەزبەتەی ئەنجومەنی تایبەتی، بڕیاردرا بە جێبەجێ کردنی ئەم فرمانە لە ۱۳ ذی ئەلقعدە ۱۳۰٤ک.

سەدری ئەعزەم/ محەممەد کامل.

بەرنامەی دابەشکردن بەم جۆرە دەست پێ دەکات:

۱- مەحموود خدرو هەندێ لە سەفەرەوەندەکانو کاوێزو حەیدەر محەممەد هەمەوەندی و بەشێک لە سێتابەسەرەکانو قادر گێژو سلێمان عەزیز بۆ رۆدس.

۲- کاکە عەبدوڵلا ئاغاو عەزیز خاڵەو شەریف خاتوونو رەحیم ئاغا بۆ ئەسینا.

۳- کەریم بەگی فەتاح بەگ و فەقێ قادری شاعیرو حەمەئەمین ئاغاو کاکی بۆ درنەو بەنغازی.

٤- حەمەی مام سلێمانو حوسێن خان و بەشێک لە سێتابەسەرەکان بۆ تەرابلوسو بەنغازی.

٥- حاجی مەحموود ئەحمەد تورشیو ئەفەندی کاکەولاو عەبدوڵلا سوورە بۆ تونس.

٦- کاکە رەش گوڵەو عەزیز خەسرەو ئاغاو دەوڵەتیارو میتمەوەنەکان بۆ قوبرس.

٧- شەریف فەڕەنگێزو عەزیز ئاغای برای لە بەگزادەکانو حەمەی رەزای خاترو سەفەرەوەندەکان بۆ یەمەن.

٨- حەمەی ئیمامو قایتەوەندییەکان بۆ (حومس و حەما) لە سوریا.

٩- فەتاح خەسرەو هەمەیلو عەلی گوڵە خاتوونو حەمەی فەتاح پەریخان بۆ جەزائیر.

ئەوانەی هەڵدەهاتنو دەگیرانەوە رەوانەی ئەم دوورگانە دەکران: (قوبرس. کرید، رۆدس، سەلانیک، مالتا، ئەلبانیا)«[۱]». (ئەحمەد راسم پاشا)

---

۱- (ن.ف. هەمەوەند).

بەسولتانی ڕاگەیاند کە هەمەوەندەکان کوردن. خەڵکی ناوچەیەکی شاخاوین، ئەستەمە لە بیابانەکاندا بژین، ئەویش فەرمانی دا بیانبەنە (جبل الاخضر)«[١]». پاشان هەوڵ درا بە دابەش کردنی دانەویڵە بەسەریاندا بۆ ئەوەی سەرقاڵی کاری کشتوکاڵیان بکەن، بەڵام ئەوەش سەری نەگرتو ڕەت کرایەوە«[٢]». پاش حەوت ساڵ ئاوارەیی و دووره وڵاتی، هەمەوەندەکان توانییان بەهەوڵو تەقەلایەکی زۆر بەپیادەو بەهۆی (ئەستێرە) ناسینەوە بگەڕێنەوە سنووری ناوچەی بازیانو چەمچەماڵ کە چەندین کەسیان لێ کوژراو هەندێکی تریش خنکان و بەشێکی تریشیان لەبرسانا مردن. ماوەی گەڕانەوەیان بۆ زێدی باب و باپیرانیان شەش مانگی خایاند.

## ئاخاوتنی هۆزی هەمەوەند

نێستا هەمەوەندەکان بەزاری کرمانجی خواروو دەدوێن، بەشێوە ئاخاوتنێک کە نزیک لە شێوە ئاخاوتنی کەرکووک و گەرمیان. بەڵام دەڵێن کاتی خۆی لەسەرەتای هاتنی هەمەوەند بۆ ئەو ناوچەیە زیاتر بەشێوە ئاخاوتنی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو بەتایبەتی بە گۆرانی دەدوانو وردە وردە دیالێکتەکەیان ون کردو شێوەزاری ناوچەکەیان بەکارهێنا. بەڵام هەتا نێستاش ئەو کاریگەرێتییە لەسەر قسەکردنیان دیارە«[٣]». زاڵ بوونی دیالێکتی (گۆران) بەر لەدوو سەدە کاریگەریی خۆی هەبووە بەسەر زۆربەی دیالێکتەکانی دەوروبەری خۆی لەناو ئەوانەش هۆزی هەمەوەند کە خۆیان لە کوردستانی ئێرانەوە هاتبوون.

دەربارەی پێناسەی هەمەوەند ڕاوبۆچوونی جیا هەن، هەندێ کەس لایان وایەکە هەمەوەندەکان لە (وان)ـەوە هاتبن، کە دەگونجێ شوێنی نەسڵی ئەوان بێت. هەندێکی تریش لەو بیروباوەڕەدان کە هەمەوەند لەبنەڕەتا (هاماوەند) بێت کە (هاما) یان (هوما) ناوی مەلێکی سەنگین بێت. (وەند) یا (وەن) لە پەهلەوی کۆنا بەمانای (خاوەن) دێت، کە دەکاتە خاوەن باڵندەی (هوما)«[٤]».

پاشگری (وەند) یان (وەن) بەسەر تیرەکانی هەمەوەندەوە ماوە، وەک

---

١- (جبل الاخضر) لە لیبیایە.

٢- د. حامد محمود عیسى المشكلة الكوردية في شرق الاوسط، ص٢٥.

٣- (ادموندز. ک. ت. ع)، ل٤٢.

٤- عەلائەدین سوجادی مێژووی ئەدەبی کوردی ل٥٤٧-٥٤٨ لەگەڵ هەندێ زانیاریی خۆمان.

(قاسمەوەن، بابلەوەن، سۆفی وەن، سەفەرەوەن..هتد). (ئەدمۆندز)یش دەڵێ (وەند) زیاتر بەزاراوەی لەک و لوڕ مانای (لێدان = الرمی) یان (لێدانی = قذف) دەگەیەنێت"[1].

## نەریتو پابەندی ئیسلامەتی لەناو هەمەوەند-دا

سەرەڕای هەندێک خوو نەریتی ناپەسند کە سیمای گشتیی زۆربەی زۆری هۆزە کوردەکانی سەدەکانی رابردوو بووە، لەوانەش خەریک بوون بەناوخۆو ناکۆکی لەنێوان یەکتر، گەرچی ئەم سیفەتە لەناو هەمەوەندو هەمەوەند لەگەڵ غەیری خۆی زۆر باشتر بووە بەبەراورد لەگەڵ هۆزەکانی ترو پەیوەندیی دراوسێیەتی.

هەمەوەند زۆر خەسڵەتی بەرزیان هەبووەو چاکەخواز بوونو داڵدەی هەژارو لێ قەوماویان زۆر داوەو داوێن پاک و بەڕەوشت بوونو لەناوخۆیانا تەباو براو هاوکار بوون، لەگەڵ دراوسێ چاکو بەئەمەک. لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەریاندا، ئەگەر دەست تێوەردانی بێگانە لێ گەڕابێ هەمیشە هاوکارو دۆست بوون.

یەکێک لە خاسیەتە هەرە گرنگەکانی هەمەوەند ئەوەبوو کە لەگەڵ بەرژەوەندی باڵای میللەتی خۆیاندا بوون. میرنشینیی بابان کاتی خۆی ڕەمزی کیانێکی میللەتی کورد بوون لەناوچەکە، هەمەوەند بەهەموو شێوەیەک لەدەست درێژیی بێگانە پاراستوویانە. هەروەکو دواتریش ڕۆڵی گرنگیان گێڕا لەپاراستنی دەوڵەتەکەی کوردستانی باشوور بەسەرۆکایەتیی شێخ مەحموودی نەمر.

هۆزی هەمەوەند بەعیزەت ژیاون و ژیانی سەرشۆڕییان قبووڵ نەکردووەو لەو پێناوەش دەربەدەرو ئاوارە بوونو کۆڵیان نەداوە. هەرگیز پشتیوانییان لەتورک و عەجەم نەکردووە لەسەر حیسابی هۆزەکانی دەوروبەریان و بگرە بەپێچەوانەوە هەمیشە زیانیان لێ کەوتووە لەبەر ئەنجامی دەستکێشی هۆزێک لەهۆزە دەروون بەزبوەکان کە بوونەتە پیاوی بێگانەو زیانیان بەهۆزی هەمەوەند گەیاندووە.

هەقی خۆیان بەسەر کەسەوە نەهێشتۆتەوەو بەقەرز نەترساون. زۆریو گەلەکۆمەکیی دوژمن لەشەڕ خاوی نەکردوونەتەوە. پشوو درێژو بەئارام بوونو

---

[1]- (ادموندز. ک. ت. ع)، ل٤٤.

ئەفس نزمیو سەرشۆڕیو خزمەتکاریی دوژمنو قبووڵ کردنی بێ غیرەتیو ترسان لەمردن کارو پیشەی ئەمان نەبووەو شتی وایان قبووڵ نەکردووە. بەهەر ڕێگەیەکدا گوزەریان کردبێت بەو ڕێگەیەدا نەگەڕاونەتەوە، لەکاتی شەڕدا ئەگەر ماینیان کوژرابێ یان مردار بووبێتەوە بەزینەکەیەوە بەجێیان نەهێشتووە، هەتا نەکەوێتە دەستی بێگانەو بۆ ئەوەی بەسووکایەتی نەڵێ ئەمە زینی ولاغی فلانە کەسە، کە ئەمەش لەکاتی خۆیدا نیشانەی سووکایەتی بوو. هەروەها جەنازەی کوژراویان لەمەیدانی شەڕ بەجێ نەهێشتووە هەتا نەکەوێتە دەست دوژمن. دوژمنی خۆیان قەت بەنامەردیو زەلیلی نەکوشتووە.

شەڕیان بەکوێنەقین نەکردووە، دوژمنایەتییان دوژمنایەتی بوودو دۆستایەتیشیان بەهەمان شێوە دۆستایەتی بووەو لەپەنای دۆستایەتی زەبریان نەوەشاندووە»[1].

ئافرەتی هەمەوەند هەروەکو پیاو بەشداری شەڕی کردووەو لەشەڕ کردنیشا ئازاو بەجەرگ بووە. مامۆستا محەمەد ئەمین زەکی بەگ ئاماژە بەوە دەکات کە ئافرەتەکانیشیان وەکو پیاوان سوارەو ئازاو شەڕکەر بوون. ئافرەتی ناودارو ئازای لێ هەڵکەوتووە ئەمە سەرەڕای بەشدارییان لەشەڕو جەنگ، هەمیشە ئافرەتی هەمەوەند لەهەموو میحنەتەکانی هۆزەکەیدا بەشداریی کردووە. ئەمە لەکاتی ئاوارەییو کۆچو کۆچ باریدا، یان لە نەبوونیو هەژاریو دەربەدەریدا بووبێت. ئەمە سەرەڕای ڕێزگرتنی پیاوانیان لە ئافرەت کە هەمیشە پیاوی هەمەوەند بەچاوی ڕێزو ئیحتیرامەوە سەیری ئافرەتی کردووە.

دەگێڕنەوە هەر کاروانێک ئافرەتی لەگەڵ بووبێت رایان نەگرتووەو دەست بەجێ بەرێزەوە بەڕێیان کردوون. ئەگەر دوژمنیشیان لەگەڵدا بووبێت.

(لە رووی دینەوە هەمەوەند موسڵمانو پابەند بەئەهلی سوننەنو زۆر دەمارگیرییان بۆ سوننەیی هەبووە»[2]. نوێژکەرو ڕۆژووگربوونە، تەنانەت لە کاتی شەڕیشدا بە سواری لە ولاغەوە دابەزیون بۆ ئەوەی نوێژی خۆیان بەجێ بگەیەنن. هەروەها بە راستگۆیی و سەرڕاستی ناسرابوون.

---

١- (ن.ف.هەمەوەند).

٢- (زکی، تاریخ السلیمانیة)، ل١٨٨.

# کەریم بەگی کوڕی فەتاح بەگی هەمەوەند لەقوتابخانەی ئازایەتی و ناودارانی هۆزەکەیدا . .



## کەریم بەگ کێیە؟

کەریم بەگ کوڕی فەتاح بەگ کوڕی کوێخا رەسوولّی کوڕی جوامێری کوڕی یادگاری کوڕی خوادی باوکە گەورەی هەمەوەندەکانە. کەریم بەگ لەتیرەی بەگزادەیە کە نەوەی یادگاری کوڕی خوادین و هەر ئەم تیرەیە (چەڵەوی)یان (چەلەبی)یشیان پێ دەڵێن. فەتاح بەگی باوکی کەریم بەگ بەتەنیا دووکوڕی هەبووە «ڕەحیم» و «کەریم بەگ».

دیارە «ڕەحیم» نەوەی لێ نەکەوتۆتەوە بەڵام کەریم بەگ (سابیر بەگ و

عەبدوڵڵا بەگ و وەهاب بەگ و عەزیز بەگ و ئەحمەد بەگ)ی لێ کەوتۆتەوە. خۆی و نەوەکانی، ناو و ناوبانگ و کاریگەریی هۆزی هەمەوەندیان لەناوەوەو دەرەوە بردە ئاستێکی بالاتر.

کەریم بەگ سالی ١٨٧٠ز لەدایک بووە، سێ ساڵ بەر لەدایک بوونی کەریم بەگ، هەمەوەندەکان لەسەردەمی (نامیق پاشا)ی والیی بەغدای ئەو کاتە لە حکومەتی عوسمانی هەڵدەگەڕێنەوە. لەدوای شەڕو پێکدادانێکی زۆر دەچنەوە زەهاو پاش دوو ساڵ دەگەڕێنەوە بازیان. لە ماوەی سالانی (١٨٦٩ز تا ١٨٧٤ز) لە سەردەمی (مەدحەت پاشا)، هەم دیسان ئاوارەی ئێران دەبنەوەو دووبارە لە دوای ماوەیەک (رەئووف پاشا) لەگەڵیان رێک دەکەوێت و دەگەڕێنەوە بازیان[١]. سالانی هاتنە دونیای کەریم بەگ و سالانی منداڵی (١٨٧٠ز-١٨٧٥ز) سالانێکی پڕ لە کوێرەوەری و شەڕو ئاوارەیی بووە، منداڵێکی لەدایک بووی زەمان و شوێنێکی پڕ لە شۆڕش و راپەڕین و ململانێی دەسەلاتدارانی زل هێزو واقیعێکی پڕ لە بەرەنگاری و ئاوارەیی، حەتمەن کاریگەری خۆی لەسەر بەجێ دێلێ. دیارە ئەم حاڵەتە بەوەندەوە نەوەستاوە، نەک هەر سالانی دواتر بەڵکو وەکو زنجیرەیەک شۆڕش و بەرەنگاری درێژەی هەبوو، هەتا کەریم بەگ گەورە بووە و چاوی کراوەتەوەو دەستی جڵەوی سواری گرتووە و هاتۆتە مەیدان و لەتەک هۆزەکەیدا بەشداری گیانبازی و مەیدانی شەڕ بووە.

بەشداریی هەمەوەند لەشەڕی رووس و دواتر بەهۆی ئەو ئاژاوەی کەوتە نێوان هەمەوەندو هۆزی زەنگنە، بەهۆی کوشتنی سەرەک تیرەیەکی هۆزەکەی بەدەستی یەکێ لەزەنگنەکان لە سالی ١٨٧٨، هۆزی هەمەوەند بەرامبەر ئەم دەست درێژییە خۆیان پێ راناگیرێ، بۆیە لەشکر ئامادە دەکەن بۆ تۆڵە سەندنەوە لە

---

١- فوئاد حەمە خورشید، گۆڤاری رەنگین ژمارە ٨٤ سالی ١٩٩٥، ل٦.

هۆزی زەنگنە، هەر چەندە دەوڵەتی عوسمانی پشتگیری لەهۆزی زەنگنە دەکات بەڵام لەئەنجامدا هۆزی زەنگنە تێک دەشکێن و هۆزی هەمەوەند دەکشێنەوە بۆ زەهاو، ئەمەش بەهۆی پشتگیریی حکوومەتی عوسمانی لەهۆزی زەنگنە»[1].

ئاوارەیی هەمەوەند و سەرکردایەتی کردنی هۆزەکە لەلایەن سەرکردەیەکی ناودارو ئازای وەکو (جوامێر ئاغا) و رۆژگاری هەرە بەدەسەڵاتی هەمەوەند لەزەهاو و قەسری شیرین زۆر دەرسی بەکەڵک و عیبرەتی چاکی فێری کەریم بەگ کرد.

کەریم بەگ رۆژانی منداڵی و مێردمنداڵیی تەمەنی خۆی لە سەردەمی بەتواناترین سەرۆکی هۆزەکەی بەسەربردووە کە جوامێر ئاغایە و زۆرترین شەڕ و میحنەتی بینیوەو بەڕوونی دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە کەریم بەگ شاگردو قوتابی قوتابخانەی هۆزەکەی بووە بە رابەرایەتیی جوامێر ئاغاو لەو مەدرەسەیە فێری وانەی سەرکردایەتی و شۆڕشگێڕی و خەمخۆری و ئازایەتی و چاونەترسی بووە.

زیادەڕەویمان نەکردووە ئەگەر بڵێین بۆ هەرکەسایەتییەکی بەتواناو کارزان قوتابخانەیەک هەبوبێت کەلێی دەرچووبێت، ئەوا کەریم بەگیش وەکو هەموو مرۆڤێکی ناودار دەرچووی قوتابخانەیەکە ئەویش قوتابخانەی سەرکردەی نوداری هەمەوەند جوامێر ئاغایە. هەڵبەت هۆزی هەمەوەندو سەرکردایەتیی جوامێر ئاغا لەباوەشی نەتەوەیەکی ستەمدیدەی کورد دروست بووە. بۆ نموونە جوامێر ئاغا ئەو کەڵەپیاوەبوو کە زۆربەی رۆشنبیرانی کورد باسی ئازایەتی و لێهاتوویيان کردووە، وەک مامۆستای پایە بەرزی کورد پیرەمێردی شاعیر کە دەڵێ:

---

[1]- فوئاد حەمە خورشید، سەرچاوەی پێشوو ل٦-٧.

**کوێخا جوامێری هەمەوەند ئەیگوت**
**ها جوامێرا ڕۆم و عەجەم وا لەدووت**
**سەرێ کە شاهان بەقەمەی ئەبن**
**بۆ ئەوە دەشێ هەڵکەندرێ لەبن**
**ئەوسا کە جوامێر دەنگی دلێربوو**
**تیپی هەمەوەند ژنیشیان شێربوو»[١]**

کەریم بەگ لە قوتابخانەی جوامێردا فێری بنەماکانی سوارچاکی و تیر ئەندازی و نەخشەو پیلانەکانی جەنگ بوو، کە ڕۆژانە لەسەر زەمینەی واقیع جێ بەجێی دەکرد، کە هەر لەسەرەتاوە بوو بە مایەی سەرنج ڕاکێشانی دۆست و دوژمن. لەگەڵ گەورەبوون و نشوونماکردنی کەریم بەگدا لێهاتوویی و توانای سەرکردایەتیشی گەورە دەبوو. هەتا بوو بەو سەرکردەو فەرماندە سەربازییەی ناوی کەوتە سەر زاری هەموو شۆڕشگێڕێکی کوردی سەردەمەکەی و چووە ناو لاپەڕە گەشەکانی مێژووی کوردەوە.

١— پەندەکانی پیرەمێرد، بەرگی یەکەم، کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی کاکەی فەللاح، ل٩٩.

# لە ڕەوشتە بەرزەکانی کەریم بەگ

کەریم بەگ نموونەی خەسڵەتی بەرزو زیندوو و بەرچاو بوو لەمیوانداری و موسڵمانێتی و سوار چاکی و ئازایەتی و زیرەکی و بیرتیژی و بەوەفایی و ئەمەکداری، خۆشەویستیی زۆری بۆ زێدو وڵاتەکەی هەبوو و نموونەی خەباتگێڕی و تەباو هاوکار بوو، لەگەڵ سەرۆک هۆزەکانی تری مەیدانی بزووتنەوەی رزگاری خوازی میللەتی کورد (کە هەمووی لەجێگای خۆی باس دەکرێن). هەمیشە سەربەرزانە ژیاوە و نرخی بۆ دوژمنانی میللەتەکەی دانەناوە قینی لەنۆکەرایەتی و دژی نەرمی نواندن بووە لە بەرامبەر کێشەی رەوای گەلەکەی و لەم مەیدانەشدا نموونەی پشوو درێژی و ئارام گری بووە. جۆرەها شەڕی دەستەویەخەو پارتیزانی و رووبەڕووی لەدژی دوژمنانی گەلەکەی ئەنجام داوە، لەهەموویان چالاکانە بەخۆی و سوارەی هەمەوەندەوە رۆڵی بەرچاویان هەبووە.

بۆ زیاتر ئاشنابوون و سەلماندنی ئەوەی لەوەسفی ئەو پیاوە ئازاو بەجەرگە نووسیومانە، دەچینە خزمەت چەند بیرەوەری و سەربوردەیەکی ژیانی پڕ لە جەربەزدیی و میحنەت و ئازایەتی و خاسیەتی مەردایەتیی ئەو پیاوە.

* دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ دەربارەی کەریم بەگ-دوە دەڵێ هەر لەکاتی خۆیانەوە تا ئێستا کێ دیمەنی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندی کرد بە کەرەسەی داستانێک یا تەنانەت لە دوو دێڕی هەڵبەستێکدا باسی کردبێت، کەریم بەگ ئەو قارەمانەیە کە سەرەتایەکی بلیمەتانەی بۆ شەڕی پارتیزانی (پێشمەرگایەتی)ی کورد دانا، داستانی هۆنراوە نەبێت چی تابلۆی ئەو قارەمانە دەکێشێت کە بە شەوی بەفر یا مانگە شەو خۆی و جەنگاوەرەکانی سواری ئەسپی سپی دەبوون و شەوی تاریک سواری ئەسپی ڕەش دەبوون تا دەگەیشتنە سەر کامپی سوپای ئینگلیزو ئینگلیزەکان لەناکاو هەستیان بەوە دەکرد کە گریان لێ هەڵدە ستێت «[1]!!.

---

١ - دکتۆرعیزەدینمستەفا، ڕۆژنامەی برایەتی، ژمارە (٣٩)، چوارشەممە ١٩٧٣/٢/٢١.

بە راستی وەسف و دیمەنێکی جوان دەردەبڕێت کەتەعبیر لە شەوڕۆیی و ئازایەتی و سوارچاکیی کەریم بەگ دەکات و ئەوە دەردەخا کە کەریم بەگ شایستەی سازدانی دەیان شانۆگەری و چیرۆک و ڕۆمانی پڕ لە دەست و پەندو ئامۆژگارییە.

* لە بارەی دینداری و رەوشتەوە کەریم بەگ زۆر خاوەنی رەوشتی بەرزو پیرۆز بووە، خاوەنی ڕێزی تایبەت بوو لەناو میللەت، دەگێڕنەوە کەریم بەگ سەرەڕای بەهێزی و ئازایەتیی زۆر بەدین بووە لەکاتی شەڕدا لەسەنگەر نوێژی نەچووەو شەڕی ئینگلیزی بەجیهاد داناوەو بۆ تاوێکیش لەجیهاد کۆڵی نەداوە"[1]".

کەریم بەگ زۆر دڵی وابەستە نەبوو بەماڵی دونیاو هەمیشە لەشەڕو بەربەرەکانیدا بووە لەدژی داگیرکەراندا. دەگێڕنەوە جارێک گوندی (کوپەلە)ی بازیان دەفرۆشێ لەبەرامبەر ئەسپێک و (تفەنگێک) کە پێویستی پێی بووە لەکاتی جەنگ بۆ یەکێک لەپیاوەکانی خۆی کەناوی (ئامیق حوسێن ئاغا)یە کە جەنگاوەرو سوارەی پشت و هێزی بووە"[2]".

کەریم بەگ لەبارەی (وەفا)و سەر ڕاستی و لەکاتی دەس ڕۆیشتندا خاوەنی بەڵێن و پەیمانەکانی بووە، وەک مامۆستا (نووری عەلی ئەمین) لەبارەی کەریم بەگەوە دەڵێ:

١- (کەریم بەگ) یەکەم سەرۆک هۆز بووە کەپشتگیریی لەشۆڕشی شێخ

---

١- شاکر خەسباک لەبارەی دینداری و بەرەوشتی هۆزی هەمەوەند-ەوە دەڵێ. [هۆزی هەمەوەند خاوەنی رەوشتی بەرزو پیرۆزە، باری سروشتی جوگرافیا پاڵی بە خەڵکی ناوچەکە دەنا بۆ دروست کردنی ژیانێکی جەردەیی و رووت کردنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ژیانە هەستی ئاین پەروەریی ئەم هۆزەی کەم نەکردۆتەوە، لەلایەن دینەوە هەمیشە بەدوور بوونە لەژیانی خراپەکاری]، الاکراد، دراسة .جغرافیة اتنوغرافیة ص٤٠٥.

- خوالێ خۆشبوو (حەیدر عەزیز ئاغا)، دەستنووسەکانی.

٢- نووسەر.

مەحموود کردووە لە دەرەوەی سلێمانی و توانیویەتی چەمچەماڵ لەساڵی ١٩١٩دا رزگار بکات.

٢- لە ساڵی ١٩٢٣دا بەر لەگەڕانەوەی شێخ مەحموود لە سەردەشت بۆ سلێمانی بۆ ماوەی سێ هەفتە توانی بەناوی شێخ مەحموودەوە حوکمی سلێمانی بکات، دوای ئەوەی بەخۆی و لەشکرەکەی (سلێمانی)یان رێکخست.

٣- توانی لەم ماوەیەدا سلێمانی رێکخات لە رووی ئابووری و کارگێڕییەوە.

٤- لەکاتی هاتنەوەی شێخ، پێشوازییەکی گەرمی لێ کردو دڵسۆزیی خۆی نیشاندا. ئەمەش لەڕاستیدا لەکاتی دیارنەبوونی شێخ مەحموودا دەرکەوت. کەریم بەگ خاوەنی هەڵوێست بووە بەرامبەر شێخ و دڵسۆزانە ئیش و کاری شۆڕشی بەڕێوە بردووە»[١].

هەروەها کەریم بەگ و هۆزەکەی لەناوچەکەی خۆیاندا بە هیچ شێوەیەک ماوەی کەسیان نەداوە و تا توانیبێتیان یارمەتیی خەڵکی ماف خوراویان داوە و مافیان بۆ وەرگرتوونەتەوە»[٢].

---

١- نووری عەلی ئەمین، شۆڕشی شێخ مەحموود - لە دکتۆر ئیسماعیل شوکر وەرمان گرتووە.

٢- لە ساڵی ١٩٧٢ لەوکاتەی ماڵمان لە باینجانی بازیان بوو رۆژێک کابرایەکی کۆیی بەناوی (دیوانە محەمەد) بوو بە میوانمان و شەو لەماڵمان مایەوە، ریش سپی و بەساڵاچوو و دونیا دیدەو خاوەن ئەزموون دیاربوو. پرسیاری باوکمی لێ کردم وتم ساڵێک نەبێت کۆچی دوایی کردووە. ئێمەش (٣) براین. ئەویش بەناسینمان دڵخۆش بوو. بەسەرهاتێکی کۆنی گێڕایەوە بەر لە (٥٠) ساڵ کە کاروانچی بووە لەگەڵ ژمارەیەک لە برادەرانی خۆی کە سێ کەس بوون، رێگەیان دەکەوێتە ناوچەی بازیان. کابرا وتی (ئێمە ٣ کەسی کۆیی بووین کاروانچی بووین و بەکاری بازرگانی دێ بەدێ دەگەڕاین. لەگوندی (مۆرتکە) بەرەو (دەرگەزێن) دەچووین. لەو نێوانە شەش کەسمان

لەم کـاتانەدا مـاڵ و منداڵی کـەریم بەگ دەوارنشین بوون لە چەمی نێـوان گوندی (کۆیەڵە)ی (بازیان)و گوندی (باینجان) کەسەر بە ناحیەی (تەیناڵە) لە پارێزگاری سلێمانی (کونە قەل)ی پێ دەڵێن لەوێ نیشتەجێ بوون، ئەم جێگایە پەنایەو لەکاتی بۆردومانی فرۆکەش کاریگەریی وای نەبووە.

لە خواڵیـخۆشبوو باوکی خۆم بیسـتووە کە ئینگلیـزەکـان هێـزێکی زۆریان هێنابووە دەربەندی بازیان، جـاروبار بە گـوندەکـاندا بڵاو دەبوونەوە و بەدوای کەریم بەگدا دەگەڕان کەریم بەگیش لە هاتوچۆی ئەم دیو و ئەودیوی چەمچەماڵدا بوو لەهەر جێگایەک بە ئینگلیـزەکـان بگەیشـتـایە زیرەی لێ بەرز دەکـردنەوە. شەوێک هێـزێکی زۆریان لە دەوارەکەی ماڵی کەریم بەگ نزیک بوونەوە و کەریم

---

لێ پەیدا بوو، هەرچی شت و مەکێ پێـمـان بوو لێیـان سـەندین و بەجـێـیـان هێـشـتین. بەسـەر شـاخـەکـانا سـەرکـەوتن و ئێـمـەش بە هاوار هـاوار و نارەحـەتی بەرەو گـوندی (مۆرتکە) گەڕاینەوە. زۆر بە پەریشـانی و دڵتەنگی خەڵکی گوندی مۆرتکە بەرەو پیرمان هـاتن و وتیـان (کەریم بەگ) واڵە (گوندی باڵاجۆ) دوورنییە ئەگەر بچنەلای چارەیەکتان بۆ دەدۆزێتەوە. ئێـمـەش بەپەلە چووین و (کـەریم بەگ)مـان دۆزییـەوەو حـاڵی خۆمـان تێ گەیاند. زۆر خـەمی خواردو پەرۆشـی حاڵمـان بوو. بەپەلە بەپیر پەرێشـانیی ئێمەوە هات و سوارەی نازای خستە گەڕ بەدیوی چەمچـەماڵ. ئێمەش لەوێ ماینەوە بۆ سبەینێ (٤) چوار لەو دزانەیان گرت و هێنایانن بۆ لامان. دزەکان دەست و پێی ئێمەیان ماچ دەکرد هەتا لێیـان خۆشبین بەڕاستی ئێمەش دڵنەرم بووین. هەردوولامانیان بردە لای کـەریم بەگ، ئەویش پرسـیـاری دوانەکـەی تری لێکـردن و سـوارەیـان نارد بەدوای ئەوانیش لەناکامدا شتومەکەکەمان وەرگرتەوەو دزەکانیش کەوتنە بەرلێدان و هەر لەوێ لەپێش چاوی خـۆمـان حـەوزێک هەبوو هەمـوویان خـسـتـە ناو حـەوزی ئاوەکەوەو لێیـان دان ئێمەش بەخۆشی گەڕاینەوە.

ئێستـا بۆ (٥٠) سـاڵ دەچێت بەسـەر ئەم بەسـەرهـاتەو چاکـەیەی کەریم بەگ تێپەڕیوە خوا ئاگادارە لەدوای هـەر نوێژێک فاتیحایەک بۆ کەریم بەگ رەوانە دەکەم).

بەگ خۆیشی لەوێ دەبێ. هەموو بەیانیان لەپێش نوێژدا کەریم بەگ لەگەڵ سوارەکانی سەردەکەوتنە سەرچیاکەو ئەگەر بهاتایەوە لە ڕۆژهەڵاتدا دەهاتەوە. دەوارەکە لەم وەختەدا بینییان کە سەربازەکان گەیشتبوونە(دەوارەکە) کەریم بەگیش پشتی لێیان گرت و بوو بە شەڕو ئینگلیزەکان بە ناوهێنانی کەریم بەگ یەکسەر بەرەو جادەی دەربەندی بازیان هەڵهاتن. سوارەکانیش دوایان کەوتن و هەر لەوێدا (٣) کوژراویان پێ بەجێ هێشتن. دەگێڕنەوە ناوچەکەش دڕکودالی زۆر بووە، ئەوکاتە چەند کەسێکیان لەوناوەدا کە گیریان خوارد بوو گیران. وادەرکەوت کە بۆ گرتنی ماڵ و منداڵی کەریم بەگ هاتبوون بیانبەن بۆ کەرکووک، ئەوانەی کەگیرابوون وایان دەرخست کە مەندووبی سامیی بەریتانی عەفووی بۆ کەریم بەگ و ئەوانەی لەگەڵیەتی دەرکردووە بە مەرجێک لەگوندەکەی خۆی دانیشێ و دەست لەکاری حکومەت وەرنەدات، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوان کەریم بەگ لەڕوویان وەستا.

کەریم بەگ شارەزاییەکی عەسکەری لێهاتووبووە، زۆر هەوڵی داوە شۆڕشەکە سەرکەوێت. ئەمەش لێرەدا دەخەینەڕوو، بۆ نموونە:

بیلال حوسێن کاکەخان پیاوێکی وشیاری بەساڵاچووە کوڕی مامی (عەلی مەحموود کاکەخانە)و لەگەڵ (عەلی مەحموود)یش چەکداریی کردووە و دەڵێ (من لە مەحموودی کاکەخان و لەباوکی خۆم بیستووە کە بنەماڵەی ئێمە بەتایبەتی و شاری هەولێر بەگشتی پەیوەندیمان بەشۆڕشی شێخ مەحموود-ەوە کرد لەرێگای یەکێ لە سەرۆک هۆزەکانی ناوچەی چەمچەماڵ، چونکە دۆستایەتیمان لەگەڵ هەبوو، ئەویش (کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەندە) خوالێخۆش بێ)[١].

لەم چەند وشەیەوە دەتوانین چەند ڕاستییەک بەدیار بخەین ئەوەیش ئەوەیە:

---

١- بیلال حوسێن کاکە خان لەدایک بووی ساڵی ١٩١٧ لەکاتی چاوپێکەوتنێک دەری بڕیوە کە ڕۆژی ١٩٩٧/٦/١٦ لەگەڵیداکراوە لە د. ئیسماعیل شوکور وەرمانگرتووە.

١- هەولێر رۆڵی هەبووە لەو شۆڕشەدا.
٢- کەریمی فەتاح بەگ تەنانەت وەکو لێپرسراوێکی سەربازیی لێهاتوو بووەو بیرۆکەیەکی سیاسیی بەهێزو دووربینی هەبوو، چونکە ویستوویەتی سنووری شۆڕشەکە فراوان بکات بۆ دوو مەبەست:
أ- تاوەکو شۆڕشەکە لەهەرێمایەتی رزگار بکات و بیکات بەشۆڕشێکی کوردستانی بەلایەنی کەمەوە کوردستانی خواروو.
ب- دیارە لەلایەکی ترەوە، لەرووی ستراتیجی سەربازیش هەرچەند سنوور فراوان بێت، بەرگری کردن ئاسان دەبێت و بەهاکەشی لەسەر دوژمن گران رادەوەستێ و دوژمن دەبێ سەربازی زۆر دابین بکات.
لەناو کورد و گەلانی دونیادا ئەوە باوە کە ناودارو جوامێرەکانی میللەتی خۆیان لەبیرناکەن و دەیانکەن بە پاڵەوانی داستان و چیرۆک و شیعری میللی و لەبۆنە گشتییەکاندا دەیخەنەڕوو. ئەمەش زیاتر لەوقۆناغەدا کە نەخوێندەواری باڵی بەسەر کۆمەڵگادا کێشابێ.
کوردەواری لەمێژە شۆڕشەکانی سمکۆو شێخ مەحموود و پاڵەوانی شۆڕشەکانی کوردستانی باکووری لە چوارچێوەی هۆنراوەی میللی ئاخنیوەو لەکاتی (کارکردن و مەرەزەو کاری کشتوکاڵی و مەڕداری و دروێنەو... هتد) ئەوە لەدوای ئەوە گەیاندوویەتی بەهی دوای خۆی.
کەریم بەگ یەکێکە لەو قارەمانانەی نەک لە سنووری بازیان و چەمچەماڵ بەڵکو لە دەشتی هەولێریشدا ناوبانگ دەردەکات.
بەڕێز عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی لەکتێبی (داستان و گۆرانی لەفۆلکلۆری کوردی-دا)"[١]" لەدەشتی هەولێری دوور لە ناوچەی مەڵبەندی کەریم بەگ بەستەو لاواندنەوە لەسەر کەریم بەگ کۆکردۆتەوە. ئەم بەستەو لاواندنەوانە دەیسەلمێنن کە سنووری ناودارێتی ئەو پیاوە لە چوارچێوەی ناوچەیەکی تەسک

١- عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی، داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردی-دا، ل٧٨-٧٩.

یان سنووری هۆزەکەی تێپەڕی کردووەو بۆتە موڵک و شوێنەواری هەموو کوردەواری و جێگەی شانازیی پانتاییەکی بەرفراوان لەناو دڵی ئەم میللەتە ستەمدیدەیە، دەقی نموونەکە بەم شێوەیە:

**والییە بڕۆ والییە شێخ مەحموودم والییە**
**دەڕێن غەزا غەزایە لە بنەی سولەیمانییە**
**ئەو بن چیایەی سووورداشێ خێوەت بزری کردییە**
**سبیانەکێ گەلەک زوو فەزڵی دا بەیانییە**
**تەیارە لە عاسمانی ترمبێل لە عەردییە**
**گرمەگرمی تۆپان دێ دێ دەنگی تەختەلییە**
**کەریمی فەتاح بەگی سوارەی هەمەوەندییە**
**بابی بابم شێخ مەحموود لەگەر دەزگای داتنایە**
**هەیبەت سولتان برندە تۆپخانەی لێ دانایە**
**کەریمی فەتاح بەگی عەسکەریی تەعلیم دایە**
**عەسکەری شێخ مەحموودی سنجیتاق ڕاوەستایە**
**بابی بابم شێخ مەحموود لەگەر دەزگاو دوکانی**
**تۆپەکی دادەمەزران بە ڕیەی دەخوا دەرمانی**
**گوللەی قەندی شەکری ئەو باشە لۆ نیشانی**
**ناردی بۆسەر ئنگلیزی دینی مارو خۆزانی**

حەبیب عەلی میرانی لە یادی شەهیدان و ئەدیبانی کورد دەیلاوێنێتەوە کە کورد بەهەزاران قوربانیی بەسەرو ماڵ داوە لە لاپەڕە (٨)دا دەڵێ:

**شەڕو کوشتاری بەر دەربەندم دی**
**کەریم و سابیر خۆم لە جەنگم دی(١)**

---

١- حەبیب عەلی میرانی. لەیادی شەهیدان و ئەدیبانی کوردستان ل٣-٨.

# کەریم بەگ لە باکووری ئەفەریقیا

کەریم بەگ، لەگەرمەی مشتومڕی جوامێر ئاغای سەرۆکی هەمەوەند لە زەهاوو قەسری شیرین و شەهید کردنی (جوامێر ئاغا) تەمەنی لەنێوان ١٦-١٧ ساڵان بووە«[١]». ئەوە بوو ئەم هۆزە نەفی کران بۆ (ئەدەنە) لە تورکیا و باکووری ئەفەریقیا لە ساڵی ١٨٨٧ز«[٢]».

لەکاتی بڕینی هەزاران کیلۆمەتر لەژێر فەرماندەی زەبرو زەنگی جەندرمەی تورکان و مردن و زامدار بوونی دەیان کەس لەم هۆزەو خزم و کەس و کاری کەریم بەگ و چەشتنی میحنەتی و برسێتی و غەریبی لەبازیانەوە بۆ کەرکووک و لەوێوە بۆ مووسڵ ئینجا بۆ (ئەدەنە) لە تورکیا، کەریم بەگ لەتەمەنی لاوێتیدا دەبێت لەگەڵ حەمە ئەمین ئاغا و فەقێ قادر و حەسەن بەگ و ژمارەیەک لەهەمەوەندەکان لەپاش ئەوەی دەیانبەنە (لیبیا) لە (بەنغازی) نیشتەجێ دەکرێن«[٣]».

---

١- محەمەد ئەمین زەکی، دەڵێ: (جوامێر ئاغا) لەساڵی (١٨٨٦ز) دەکوژن، تاریخ سليمانية، ل١٩٥.

هەروەها د.فوئاد حەمە خورشید، دەڵێ: [ ئەمە هەتا ساڵی ١٨٨٦ درێژەی کێشاو، جوامێر ئاغا کوژرا]، رەنگین ژمارە ٨٤، ل٧.

بەڵام ئەدمۆندز دەڵێ: لەگەڵ کەوتنی (سێبەری سوڵتان) لە ساڵی ١٨٨٨ جوامێر دیسان راپەڕی، بەڵام دوای چەند مانگێک بەهۆی مونامەرەیەکەوە کە لەلایەن قاچارییەکانەوە رێکخرابوو، کوژرا. [ئەدمۆندز، کورد، ترک، عەرەب، ل ٤٣].

بەهۆی زۆریی بۆچوونەکان، مێژوونووسان ساڵی کوشتنی (جوامێر ئاغا) بە ساڵی (١٨٨٦) دادەنێن، چونکە پاش کوشتنی (جوامێر ئاغا) هۆزی هەمەوەند پەراگەندە بوون و نەفی کران، بەپێی بەڵگەنامەی عوسمانی هەمەوەندەکان لەساڵی ١٨٨٧ز نەفی کران، بڕوانە رۆژنامەی الاتحاد، ژمارە (٢١٥)ی رۆژی شەممە رێکەوتی ٣/ ایار/ ١٩٩٧ ساڵی پێنجەم.

٢- رۆژنامەی (الاتحاد)، ژمارە (٢١٥).

٣- ن. ف هەمەوەند.

ئەو دەردەسەرییەی کە هەر لە منداڵیی کەریم بەگەوە بەسەر هۆزی هەمەوەند هات، (کەریم بەگ)ی بردە ئاستێکی بەرپرسیارێتیی گەورە بەجۆرێک پیلانی(ئەحمەد راسم پاشا) بەئاسانی سەری پێ شۆڕ ناکات و (کەریم بەگ) لەولاتی غەریبی هەڵناکات و نیشتمانی باوک و باپیرانی و شاخ و دۆڵ و دەشتەکانی بازیان و چەمچەماڵ لەبیرناکات، لەملاشەوە وابەئاسانی دەست بەرداری (زەهاوو قەسری شیرین) شوێنی دالدەی هۆزەکەی نابێت»[1].

یاخی بوون لەژێر دەسەلاتی (ئەحمەد راسم پاشا) و بەجێ هێشتنی ولاتی غەریبی و گەڕانەوە بۆ بازیان بەناخی (کەریم بەگ)دا چووبووە خوارێ و ئامادە نەبوو نیشتمانێک لەبیر بکات کە ئازایەتی و مەردایەتیی فێرکردووەو لەگەڵیدا گەورە بووەو چاوی کراوەتەوە. دیارە دەوڵەتی عوسمانیش لەباکووری ئەفریقیای باشتر دەست نەکەوتووە لەوکاتەی کە توواناترین والی خۆی (ئەحمەد راسم پاشا) حوکمی تیا کردووە، تا بیکاتە مەڵبەندی نەفی کردن و دابڕینی هەمەوەند، بێ ئاگا لەوەی کە هەمەوەندەکان لەوە بەهێزترن کە ئەم واقیعە بیانخەڵەتێنێ یان بیانترسێنێ و بێننەوەو ئاواتی عوسمانییەکان بێتە دی. دوکتۆر فوئاد حەمە خورشید دەڵێ (لەدوا دەوروبەری حەوت ساڵ، یان لە ساڵی ١٨٩٦ز ئەو بەشەی کە لەم خێڵە دوورخرابووەوە بۆ تەرابلوس، توانییان بەهەر کوێرەوەرییەک بێت بەحەوت مانگ بگەڕێنەوە بۆ بازیان لەدوای ئەوەی کەهەزاران کیلۆمەتریان بەپێ بڕی. ئەمەش بەیەکێ لە شاسوارێتی و ئەبەزیی کورد دادەنرێ لەمێژووی

---

١- رووناکی، ئۆرگانی حزبوڵلای شۆڕشگێری کورد ژمارە ٢٦ لە ١٦/٣/١٩٩٧، ل٧، وتارێک بەناوونیشانی (کێشەی کورد لەزانکۆی قاهیرە!!) لەنووسینی(ع. پ) کە دەڵێ [ئابەم شێوەیە نیشتەجێ کردنی کوردەکان، شێوەی دوورخستنەوەی بەخۆی گرت و چونکە کورد بەخۆشەویستی ولات و سروشتە شاخاوییە جوانەکەی خۆیان ناسراون، ئەم پیلانەی عوسمانیەکانیان بەستەم و تەعەدایان لەقەڵەمدا].

خێلایەتیدا)«[١]».

دەربارەی چۆنێتیی گەڕانەوەی هۆزی هەمەوەند (دکسن)یش دەڵێ (هەمەوەندەکان بەرنامەیەکی زۆر رێک و پێک و کەم وێنەیان دارشت بۆ ئەوەی بگەڕێنەوەو تورکەکان نەزانن هەمەوەندەکان جل و بەرگی عارەبیان پۆشیوە، (ئەسپ)ەکانی خۆیان فرۆشتووە، بە پارەکەیان (مایین)ی عارەبی رەسەنیان کڕیوە کە لەلای عارەبەکان زۆر پەسەندە بۆ سواری وەک باوونەریتی خۆیان، بەهیلاکی و لەسەرخۆیی و هەوڵ و تەقەلاو خۆیەختییەکی زۆر توانییان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان)«[٢]».

هەروەها رۆژنامەی رووناکی لەژێر ناونیشانی (کێشەی کورد لەزانکۆی قاهیرەدا) دەڵێ (هەرچەندە حکوومەتی ویلایەت بەڵێنی دا یارمەتییان بدات و دەغڵودان و تۆویان بداتێ و پارەو پوولیان لەسەر دابەش بکات بۆ ئەوەی ژیانێکی تازە دەست پێبکەن و هەر بۆ ئەم مەبەستە حکوومەتی ویلایەت رۆژانە یەک (قرش ساغ)ی بۆ هەریەک لەم کوردە گوێزراوانە، تەرخان کرد)«[٣]».

بۆ ئەوەی ئەم هەوڵ و تەقەلایەی تورکەکان سەرنەگرێت هەمەوەندەکان بەوجۆرەش هەڵ نەخەڵەتان، وەک خوالێ خۆش بوو (حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغا) باسی کردووە کە دەڵێ: (چەند شارو گوندیان بەزۆرەملێ پێ ئاوەدان کردینەوە، بەناچاری چووین رۆژانەیان بۆ بڕینەوەو دەغڵ و دانیسان دەداینێ بۆ

---

١- د.فوئاد حەمە خورشید، گۆڤاری رەنگین، ژمارە ٨٤ سالی ١٩٩٥، ل٧.

٢- دکسن کە دەڵێ [ان الهموند خططوا لمسيرة العودة تخطيطاً فريداً، فمن اجل ان لايكتشف الاتراك أمرهم استبدلوا ملابسهم القومية بالملابس العربية، وباعوا خيولهم واشتروا باثمانها افراساً عربية أصيلة وهي التي يفضل العرب ركوبها عادة. وبكثير من العناء والصبر والمثابرة تمكنوا من العودة الى وطنهم الام]. بڕوانە:
د.فوئاد حمة خورشيد ، عشائر الكردية الجنوب،ل٦٨.
**Dickson, Bentham, (Journeys in Kurdistan) G, J. Vol. xxx, No, 4, 1910, P:376.**

٣- رووناکی ژمارە ٢٦ بەروار ١٩٩٧/٣/١٦ ل٧.

مەبەستی خەریک کردنمان بەکاری کشتوکاڵییەوە.

بەرۆژ واخۆمان دەردەخست کە هەژارین و غەریبین و بەشەویش هەندێک، لەخزمەکانی خۆمان کۆدەکردەوەو لەدووری نۆردووگاکەمان پەلاماری بنکەو کاروانی جەندرمەکانمان دەدا. چەک و وڵاغەکانمان لێ دەسەندن. وڵاغەکان ئەگەرسپی بوونایە بە (قەرەزاخ) رەشمان دەکرد یان ئەگەر رەش بوونایە نێوچەوانیانمان لەئەژنۆ بەرەو خواریێ سپی دەکردن بەرەنگ و یاگوێ یا کلکیمان دەبرین، پاشان لەشوێنی دوورتر دەمانفرۆشتنەوە.

ئەو رۆژانەیەی کە حکومەت دەیدا پێمان و پارەی کاسبی و پارەی ئەو وڵاغانەی کە لە جەندرمەکانمان دەفراندن هەموویان کۆدەکردەوە، پاشان دەستمان کرد بەکڕینی چەک و وڵاغ بۆ ئەوەی بتوانین بگەڕێینەوە بازیان و چەمچەماڵ، بەو جۆرە لە ئاکامیشدا سەرکەوتین)«[1]».

دەربارەی بەشێکی تر لە هەمەوەندەکان کە دوورخرابوونەوە بۆ دوورگەکان و کەنارەکانی دەریای سپیی ناوەڕاست. بەڕێز کاک کەریم ئاغا دەڵێ (هەندێکیان بەپارە یاخود لەبەر هەستی مرۆیانە دەیانگواستنەوە بۆ کەنارەکانی لوبنان و سوریەو ئەسکەندرۆنە، لەوێشەوە دەگەیشتنەوە کوردستان)«[2]».

ئەمەش نموونەیەکە لەچۆنێتیی گەڕانەوەی بەشێک لەهەمەوەندەکانی لیبیا کە د.حامد دەڵێ: ( کوردەکان وڵاتی خۆیان لەیاد نەکردو رۆژ بەرۆژ سۆزیان زیاتر دەبوو تا ئەو رادەی کە هەندێکیان هەوڵی راکردنیان دا، هەندێکیشیان بەڕاستی هەڵاتن، هەروەک سەرۆکەکانی هەمەوەند (محەمەد ئاغای کوڕی سلێمان) و (رەشید کوڕی فەتاح) و (عەبدولقادر کوڕی حوسێن بەگ) و (حوسێن کوڕی عەلی) و (مستەفا کوڕی کامل) و (کەریم کوڕی فەتاح) و (حەسەن بەگ). ئەمانە روویان کردە رۆژهەڵات، بەڵام هێزەکانی دەوڵەت بەشوێنیاندا چوون و

---

١- ن.ف. هەمەوەندی.

٢- گۆڤاری تایم (TIME) ژمارە ٧ سالی ١٩٩٨ ل٢٧.

(جەندرمە) خۆی گەیاندە هەڵاتووەکان و پاش شەڕو تیرباران، کوردەکانیان دەستگیرکردو چەکەکانیان لێ سەندن، پاش ئەوەی سەرۆکەکەیان (حەسەن بەگ)، لەڕۆژی (١٩)ی ذی القعدە - ساڵی ١٣١٠ی کۆچی کوژرا،

وثائق مركز للمخطوطات التاريخية
بالجماهيرية العربية الليبية الشعبية
الاشتراكية

ملف خاص بالمنفيين الأكراد، وثائق رقم ٢٧/٩
وثيقة مؤرخة ٢٩ أكتوبر سنة ١٣٠٧
.ترجمها من التركية الحاج عبد السلام أدهم الموظف بالمركز وترجمها من الكردية
محمود جلال
بالسجل
١) محضر استجواب آغا بن سليمان الكردي ٦٠ سنة.
٢) محضر استجواب حسين بن علي الكردي، ٢٥ سنة
٣) محضر استجواب عبد القادر بن حسين بك الكردي ٢٠ سنة
٤) محضر استجواب أحمد بن محمد الكردي ٥٠ سنة
٥) محضر استجواب رشيد بن فتاح الكردي ٣٣ سنة.
٦) محضر استجواب كريم بن فتاح الكردي ١٨ سنة.
٧) محضر استجواب مصطفى بن كاكب الكردي ٤٠ سنة
٨) محضر استجواب مدير الساحل الحاج محمد الكتبي الطرابلسي ٥٢ سنة.

* سەرچاوە:
المشكلة الكردية في الشرق الاوسط تأليف د. حامد محمود عيسى- جامعة مصر العربية. ص٤٧٣ .

لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەڵاتووەکان کرا)«١».

شایانی وەبیر هێنانەوەیە کە (کەریم بەگ) لەم شەڕەدا بریندار کراوە، وەک

١- د. حامد محمود عيسى علي، المشكلة الكردية، ص٢٤، وثيقة رقم ٢٧١٩ دار الوثائق القومية طرابلس-ليبيا. وثيقة خاصة بقلاقل قبيلة الهماوند بليبيا، ترجمها من التركية الحاج عبدالسلام أدهم الموظف بالدار «ملف المنفيين الاكراد».

خوالێخۆشبوو (حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغا) لەدەس نووسەکەیدا دەڵێ: (لەم هەوڵەدا هەمەوەندەکان زیاتر لە شەو و رۆژێ رێ دوورکەوتنەوە لەنزیک گوندێک (ناوی نەزانراوە) لە لیبیا (جەندرمە)کانی تورک دەگا پێیان لەئەنجامی رووداانی شەڕو پێکدادان هەمەوەندەکان دەستگیر دەکرێن و سەرۆکەکەیان (حەسەن بەگ) دەکوژرێ و لەخاکی غەریبی دەنێژرێ و (کەریم بەگ)یش بریندار دەکرێ"[1].

حەیدەر ئاغا لەسەر باسەکەی دەڕواو دەڵێ: (حەمە ئاغای کوڕی مام سلێمان) موئەبەد حوکم دەبێ، گەنجەکانیش ۱۵ تا ۲۰ساڵ حوکم دەبن. ئەو هەمەوەندانەی لەپاش راکردووەکان دەمێننەوە حکوومەت بێ ئومێدییان لێ حاسڵ دەکات، وەکو عەزیز ئاغای خەسرەو ئاغا خۆی و هەندێ لەو هەمەوەندانە رەوانەی ئاتەکانی (بەسرەی سڤێدە) ئەکرێن. ئەو پیاوانەی کە رایان کرد هەندێکیان بەخێزانەوە هەندێکی تریشیان بەبێ خێزان هاتبوونە ناو عەشیرەتی شەممەر و شایانی باسە شێخی شەممەر زۆر رێزو ئیحترامیان دەگرێ و هەرچی کەم و کوورییان بووە بۆیانی جێبەجێ کردووە. ئەوکاتە شێخ (عەیان) رەئیسی شەممەر بووە، بەهەموو توانای خۆی هاوکارییانی کردووە لە دابینکردنی چەک و ولاّغ و کەلوپەلی تر. ئەو هەمەوەندانەی لای شێخی شەممەر بوون ۱- عەزیز حەیدەر ۲- ئۆمەر و کوڕەکانی ۳- مەحموود چێتە ٤- رەحیم ئەحمەد تورشی ٥-کاکەرەش گوڵە ٦-عەزیز رەحیم دۆینەو چەندانی تر، ئەمانە بەهاوکاریی شێخ (عەیان) دەگەنەوە بازیان.

بێینەوە سەر (حەمەی مام سلێمان) و (کەریم بەگ) و (کاکی)، ئەمانە حوکم بوون لەدوای ماوەیەک عەفوویان دەکەن و دەیانهێننەوە (ئەسینا)، عەزیز ئاغاش لەگەڵ هەمەوەندەکانی تر عەفوویان بۆ دەرئەچێت و ئەیانهێننەوە ئەسینا، هەمسوویان لەوێ یەک ئەگرنەوەو دەس ئەکەن بە پەیداکردنی چەک و ولاّغ و ئەسبابی تر، لەئاکامیشدا سەرکەوتن و بەتێکرا گەیشتنەوە بازیان و

---

۱- عومەر عەلی شریف، خبات، جریدة اسبوعیة، ژمارە ۹٤۲ رۆژی ۱۹۹۹/۹/۱۷.

چەمچەماڵ، بەهەرکوێرەوەرییەک بێت حکومەتی عوسمانی دیسان کەوتە تاقیبیان بۆ ئەوەی دەستگیریان بکەن.

لەوکاتەدا، مەحموود حوسێن و ئەحمەد ئاغا و دەوڵەتیار دەچنە ماڵی شێخ سەعیدی حەفیدزادە لە سلێمانی دەگیرێن و رەوانەی تەرابلسیان دەکەن. کەریم بەگ لەگەڵ باقی ئەوانی تر لەدەوروبەری بازیان لەچیاکان دەمێننەوەو خۆیان نادەن بەدەستەوە.

ئەو کارەساتە خوێناوی و دەربەدەری و کوشتن و برینە، وای لە هۆزی هەمەوەند کرد کە ئافرەتەکانیشیان شان بەشانی پیاوەکانیان چەک هەڵگرن و بکەونە وێزەی عوسمانییەکان کە لە باکووری ئەفەریقیاوە بەو بەسەرهاتە سەختە گەڕابوونەوە. ئەمەش یەکێکە لەو ڕووداوە مێژووییانە کە هەرگیز لەبیرناچێتەوە.

بەڕێز جەمال بابان لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا دەڵێ (جارێک (قۆشەن-تابوور)ێکی هەزار کەسی سەربازی عوسمانی هاتەسەریان هەمەوەندەکان پەلاماریان دان سێ کچی هەمەوەند (جیهان کچی جوامێر) و (ئاهوو کچی عەول قادر رێحان سێتەل بەسەر) و (فەقێ پیرۆزی کچی عەزیزی خاڵە لە بەگزادە) کەوتنە ناو سەربازەکانەوە، بە چەقۆ گوێیان بڕین و چەکەکانیان لەدەست سەندن، ئەمجا ئەو (تابوور)ە ناونرا (تابووری) گوێ بڕاو).»[1]

هەروەها سۆن دەڵێ:(بوێری و جەربەزەیی هەمەوەند و، توندوتیژی و نەبەردییان لە شەڕو کوشتاردا، لە توندو تیژی و هەڵمەتی پڵنگی کێوی دەچوو. ئافرەتەکانیشیان لەپاڵ پیاوەکانیاندا، وەک مەردی مەیدان دەجەنگان. ئەوانەی لە شەڕدا ئەم هەمەوەندانەیان دی بوو، بە دڵنیاییەوە بۆیان دەگێڕامەوە کە ئافرەتی هەمەوەند شان بەشانی پیاوەکانیان زۆر بەئازایی و توندوتیژییەک دەجەنگان، کە عەقڵ نایبڕێ و نایسەلمێنێ).

لەدوای ئەم هەموو بەڵگانەی کە هێنامانەود، دەبێت مێژوو، چی بڵێت

---

١- بروانە ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٤)ی ساڵی ١٩٨٧ ل.١١٠-١١١.

دەربارەی ئازایی و جوامێریی ئەم خێڵە؟ ئایا ئەمانە گشتی نەبەردی و جوامێری کورد پیشان نادەن دژی هێزی داگیرکردن؟ ئایا ئەم ئازایی و شاسوارییە بە نموونەیەک دانانرێ لە بەجەرگی و کۆڵ نەدەری و بوێریی ئەم گەلە؟ ئایا ئەمانە هەموو بەشێک نین لە مێژووی پڕ شانازیی ئەم میللەتە ڕەسەن و دێرینە؟..)»[١]

لەکاتی ئەم گەڕانەوەیەدا (کەریم بەگ) لەتەمەنی لاوێتی و هەرزەکاریدا بووە. بەهۆی ئازایەتی و لێهاتوویی ناوی لەگەڵ سەرۆکەکانی هەمەوەندا هاتووە وەک لەرۆژنامەی رووناکی ئاماژەی پێ داوە (کە لەپێشتر باسمان کرد). لەکاتێکدا وەک سەرۆکێکی خاوەن ئەزموون و جەربەزە کەوتۆتە پێش هۆزەکەی و هەوڵی گەڕانەوەی داوەو سەرکەوتووبووە.

د.حامد دەڵێ (سەرۆکەکانی هەمەوەند لەسەر بیروباوەڕی خۆیان مانەوەو بەهیچ شێوەیەک رازی نەبوون لەگەڵ کۆمەڵگای نوێدا بگونجێن، بۆیە نەوبەشەیان کە مابوونەوە، (ئەحمەد راسم پاشا) ناچار بوو ساڵی ١٨٩٣ حکومەتی عوسمانی رازی بکات کە ئەم کوردانە بگەڕێننەوە (ئزمیر).

بێ گومان هۆی یەکەمی سەرنەکەوتنی پیلانی نیشتەجێکردنی ئەم کوردانە دەگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستی و سۆزی کوردەکان بۆ وڵاتی کوردستان.

لەم رووەشەوە، زۆر هەوڵ و تەقەلا درا بۆ ئەوەی شۆڕشی کوردەکان کپ بکرێت و ئەم هەوڵەی راگوێستنەوەی کوردە سەرکەشەکان - کەبەردەوام لەکێشەو بەرەنگاریدا بوون لەگەڵ رژێمدا نەتوێتەوە و لەناونەچێت، ئەمە یەکەم پیلان نەبوو کە لەسەردەمی حکومەتی (ئەحمەد راسم پاشا) ئەنجامبدرێت. ئەگەر چی پیلانی نیشتەجێ کردنی کوردەکان لە (سرت) سەری نەگرت، چونکە ناوچەکە دەشت و بیابانەو کوردەکان لەگەڵ ژیانی کێوو شاخ ڕاهاتوون، کەچی هەوڵی نیشتەجێکردنیان لە (الجبل الاخضر)یش لە (بەرقە)دا دیسان سەرنەکەوت، هەرچەندە سروشتی (الجبل الاخضر) زۆر بە سروشتی کوردستان دەچێت.

---

١- د. فوئاد حەمە خورشید، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە (٨٤)، ساڵی ١٩٩٥.

کوردەکان ملکەچی هیچ زوڵم و ستەمێک نابن، بۆیەش گشت پیلانەکانی نیشتەجێکردنیان بەفیڕۆ چوو بەرامبەر بەسووربوون و داکۆکییان و بەرامبەر بە خۆشەویستیی وڵاتەکەیان و بەرگریی بێ وێنەو بەرەنگاریی دەسەڵاتدارانی عوسمانی و غەیرە عوسمانی، هەرکاتێ کە ویستوویانە سەرکوتیان بکەن)«[1]».

(ئەحمەد راسم پاشا) ناچار بوو ساڵی ١٨٩٣ز حکوومەتی عوسمانی رازی بکات کە ئەم کوردانە بگەڕێننەوە (ئزمیر). وەک د.حامد ئاماژەی پێ داوە، هەموو سەرچاوەکان دەڵێن (هەمەوەندەکان توانییان لە ساڵی ١٨٩٦ لە لیبیا بەپێ بە بیابانەکاندا بگەڕێنەوە کوردستان) وەک باسمان کرد. (ئ.دمۆندز)یش هەر هەمان بۆچوونی هەیە«[2]».

هەروەها (مێجەرسۆن)یش دەربارەی چۆنێتیی ئەم گەڕانەوەیە باس دەکات کە دەڵێ: (تورکەکان هەندێک لە ئاغاکانیان بەخۆیان و ماڵ و منداڵەوە نەفییان ئەکات بۆ «طرابلس» لە ئەفریقیاوە چۆن شەش مانگ بە ڕێگەوە بوون لەپاشا خۆیان رزگار کردووە بەچەتەیەتی هاتوونەوە)«[3]» لەگەڵ ئەوەشدا هەمەوەندەکان خۆیان بەشانازییەوە باسی (بەنغازی) و هاروهاجیی خۆیان لەوێ ئەکەن«[4]».

بەڕێز کاک کەریم ئاغا دەڵێ: (لە ٧٥٪ هەمەوەندەکان لە لیبیا و جزائیر و تونس و میسر و یەمەن و جزیرەکانی دەریای سپیی ناوەڕاست بەچەکەوە گەیشتبوونەوە کوردستانی عێراق).

هێزێکی گەورەیان پێکهێناو رێگای هاتوچۆی نێوان سلێمانی و کەرکووکیان گرت داوایان لە عوسمانییەکان کرد کەتەواوی خێزانە نەفی کراوە هەمەوەندەکان

---

١- د. حامد محمود عيسى، المشكلة الكردية، ص٢٤-٢٥.

٢- ادمۆندز، دەڵێ: گەڕانەوەی جەنگاوەرەکان بەژن و منداڵەکانیانەوە لە باکووری ئەفریقیا بۆ بازیان لە ساڵی ١٨٩٦دا بوو، واتە حەوت ساڵ دوای ئاوارەیی، ئەمەش بە گەورەترین داستان لە مێژووی خێڵەکیی کورد دەژمێردرێت. کورد وترك وعرب، ل٤٤.

٣- گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٤ ساڵی ٦، نیسان ١٩٤٤ د ل١٤-١٥.

٤- دیوانی فەقێ قادر هەمەوەند، ل٤٤.

بگەڕێنەوە بۆ کوردستان»[1].

د. فوئاد حەمە خورشید دەڵێ (کە کاتێ هەمەوەندەکان گەیشتنەوە بازیان، ئەو هەمـەوەندانەی کـە لەزەهاو مـابوونـەوەو لەجێی خـۆیان نەجوولابوون، هاتن بەپیریانەوە تێکەڵ بەیەکتر بوونەوە و تێکڕا کەوتنەوە کارکردن بۆ گەڕانەوەی ئەو بەشـەیان کـە دوورخـرابووەوە بۆ ئەدەنە، سـەرەتا (١٥٠) سـوارەی هەمـەوەند لەدوورخراوەکان توانییان لەئەدەنە هەڵبێن، بەڵام عوسمانییەکان دوایان کەوتن و ڕێیـان پێ گـرتن و پێشنیـازیان کـرد، کـە لە «حەڵەب» یان دیرزۆر بمێننەوە و نیشـتـەجێ ببن، هەمـەوەندەکـان ئەمـەیان ڕەت کـردەوەو ڕازی نەبوون و لەسـەر ڕۆیشـتنەکـەیان بەردەوام بوون، هەتا گـەیشـتنەوە بازیان. لەبازیانەوە هەمەوەندەکان چوارسەد سوارەی ئازاو نەبەردیان نارد بۆ (مووسڵ) و داوایان لە والیی (مووسڵ) کرد، کە هەمەوەندەکانی (ئەدەنە) ئازاد بکات، تا بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. هەڕەشەشیان لە والی کرد کە ئەگەر بێتو ئەمە نەکا، ناچاردەبین بەچەک تۆڵەی خۆمان بکەینەوە و بیـان هێنینەوە، لەئەنجامدا عـوسمـانییـەکان سەریان بۆ داخوازیی هەمەوەندەکان دانەواند، دوورخراوەکانیان لەسەر حسابی تایبـەتی خـۆیان گـەڕاندەوە بۆ بازیان، ئا بـەم جـۆرە خـێڵـەکـە لەبازیان یـەکی گرتەوە)»[2].

نەفـیکردن و گەڕانەوەی ئەم هۆزە بۆ کوردستان پاش بڕینی هەزاران کیلۆمەتر بەسواری و بەپێ و بەدەریادا کە ماوەی چەند مانگێکی خایاندووە پێش زیاتر لە سەد ساڵ بەر لە ئێستا ڕوویداوە. تەنانەت لەژێر مەترسیی گرتن و کوشتن و ون بوون و برسێتی و توونیەتیدا دەتوانم بڵێم کەسانێکی زۆر لەم هۆزە لەغەریبی و

١- گۆڤاری تایم، ژمارە ٧، ساڵی ١٩٩٨، ل٢٧.
- مامۆستا محەمەد ئەمین زەکی ئاماژەی بەمانەوەی نزیکەی سێ سوار کردووە کە لەزەهاو ماونەتەوە، تاریخ السلیمانیة، ل١٩٥.
٢- فوئاد حەمە خورشید، ڕەنگین، ژمارە ٨٤ ساڵی ١٩٩٥ ل٧.

لەرێگادا مردوون و هەرلەوێش نێژراون، یان پەکیان کەوتووەو بەجێ ماون یا لەهۆزەکەیان دابڕاون و چارەنووسیان دیارنییە.

هەمەوەندەکان تا ئێستاش باسی داستان و ئازایەتیی باوک و باپیرانیان لەباکووری ئەفەریقیادا دەکەن، کە چۆن گەڕاونەتەوە کوردستان لە سالی ١٨٩٦زدا.

پێویستە ڕۆلی ئەستێرەناسەکانی هەمەوەند لەم قۆناغەدا لەبیر نەکرێت کە بەڕاستی دەوری کاریگەریان بووە لەگەڕانەوەی هەمەوەندەکان لە باکووری ئەفریقیاوە بۆ کوردستان لەماوەی ئەو شەش مانگەی کە بەڕێکەوە بوون بۆ ولاتی خۆیان. دەگێڕنەوە لە ڕۆیشتنی هەمەوەندەکان بەڕۆژ زۆرجار ڕێگایان هەلەکردووەو وەستاون نەیانتوانیوە بڕۆن چاوەڕێی ئەوەیان کردووە کە شەو دابێ. بەشەو ئەو ئەستێرەناسانە یەکسەر ئاراستەی ولاتی خۆیان زانیوەو بەولایەدا ڕۆیشتوون. کەوتوونەتەوە سەر ڕێگای خۆیان، بەلام زۆرجار کە نزیک گوندێک یان شارێک بوونە ئەوە بۆتە هۆی تاخیربوونیان لەو ڕێگایەدا»[1].

پاش گەڕانەوە بۆ کوردستان قۆناغی تازە لەبەشداری هۆزی هەمەوەند لەبزووتنەوەی هەست بە نەتەوایەتی میللەتی کورد دەست پێ دەکات.

---

١- ن. ف، هەمەوەندی.

# شۆڕشی هۆزی هەمەوەند لە ۱۹۰۸

گومانی تیانییە کە لە سەدەکانی ڕابردوودا، دەوڵەتی عوسمانی و داروودەستەکەی لەوالی و جەندرمەکانی زوڵم و زۆرداربیان لەخەڵکی کوردستان کردووە، ئەویش بەوەرگرتنی باج و سەرانەی زۆر و ناکۆکی خستنە ناو هۆزە بەتواناکانی و نەزیەت و ئاستەنگ لەبەردەم خەڵکی کوردستان. لەو نێوانەشدا هۆزی هەمەوەند شوێن پەنجەی دیار بوود.

ئەوەی جێی باسەو وەرچەرخانێکی نوێیە لەمێژووی ناوچەکەو وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، هاتنی تورکە (ئیتحادییەکان)ە بۆ سەر حوکم و کوودەتاکەی ساڵی (۱۹۰۸)یە بەسەر سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم. ئەم کوودەتایە بەتەنیا گۆڕانکاری نەبوو لەبەڕێوەبردن و حوکمکردن، بەڵکو کوودەتایەکی ناسیۆنالیستەکان بوو. لە ئەنجامدا بارێکی گرانی وای هێنا بەسەر دەوڵەتی عوسمانی کە لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵیتەکاندو گیانی بەرەنگاری و ڕزگاریخوازیی لەناو هەموو نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتیدا لەکاردانەوەی تورکچێتی گەشەی کرد و پەرەی سەند.

لەسلێمانی و دەوروبەری بەتایبەتی و کوردستانی باشوور بەگشتی بنەماڵەی شێخ سەعیدی حەفیدزادە جێگەی ڕێزوقەدری بەرزبوون. کاتی خۆی سوڵتان عەبدولحەمید لەدوای شێخ سەعیدی نارد، ئەویش چووە ئەستەمبوڵ و سوڵتان زۆر ڕێزی لێ گرت و دیاری و دەسەڵاتی پێ داو ڕایسپارد بەناوی ئەوەوە بگەڕێتەوە سلێمانی و خزمەت بەگەل و وڵاتەکەی خۆی بکات»[۱].

---

۱- میجرسون، رحلة متنكرة الى بلاد مابين النهرين و كوردستان، ل۲۳۵-۲۵۰.

لەدوای هاتنە سەر حوکمی حیزبی (ئیتحادو تەرەقی"[1])، ئەو ئیتحادییانەی کە لەسەر بنەمای رەگەزپەرستی و تورکچێتی دامەزرابوون، کەوتنە سیاسەتی بەتورک کردن و دژایەتی کردنی هەموو جووڵانەوەیەکی رزگاریخوازی میللەتانی ژێردەسەڵاتیان بەگشتی و میللەتی کورد بەتایبەتی. ئەمەش کاردانەوەیەکی بەهێزی دروست کردو لەهەموولایەک شۆڕش و راپەڕین سەریهەڵدا.

پاش بەسەرچوونی رۆژگاری تاڵ و پڕ لە میحنەتی سەدەکانی رابردوو لەئازارو نەبوونی و ئاوارەیی و نەفیکردن لە سەرەتای ئەم سەدەیە، هۆزی هەمەوەند کۆڵی نەدا بەرامبەر عوسمانییەکان بەڵکو سوارە ئازاو بەهەڵمەتەکانی ئەم هۆزە لەژێر سەرکردایەتیی کەریم بەگ کۆبوونەوە، سەرقاڵی دۆزینەوەی رێگاچارەیەک بوون بۆ بەرهەڵستی کردن لەزوڵم و زۆری دەوڵەتی عوسمانی و خۆڕێکخستن و تەبایی و یەک ریزی بۆ هەڵگیرساندنی ئاڵای شۆڕش لە ئەنجامدا ساڵی ١٩٠٨ (م. س لازاریف) دەڵێ [لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨، راپەڕینی گەورەی کورد لەعێراقیش دەستی پێ کرد. خێڵی هەمەوەند کە لەنێوان بەغدادو کەرکووکدا ئەژیان، ئاڵای راپەڕینیان بەرزکردەوە. زێباری و بارزانییەکانیش پشتگیرییان کرد)"[2]". راپەڕینی هەمەوەند نەک هەر رەنگدانەوەو کاریگەرییەکەی لەلای مێژوونووسانی لای خۆمان دیارە، بەڵکو سەرنجی

---

١- ئیتحادو تەرەقی، دەستەیەکی ناسیۆنالیستی و لەژێر کاریگەریی فیکری ئەورووپی لە ساڵی١٨٨٩ دایانمەزراند لە چوارکەس پێکهاتبوون کە دووانیان کورد بوون (ئیسحاق سکوتی و عەبدوڵڵا جەودەت) بۆ دژایەتیی سوڵتان عەبدولحەمید و وردە وردە کەشەیان کرد تا لەساڵی ١٩٠٨ز بەدەستوورێک سوڵتانیان پابەندکرد بەتێروانین و بیری خۆیان. لەساڵی ١٩٠٨-١٩٠٩ سوڵتان عەبدولحەمید لەبەر زەبرو گوشاری ئەوان دەستی لە کارکێشایەوە. ئیتیحادو تەرەقی کەوتنە چاندنی تۆوی تورکچێتی و دووبەرەکی نانەوە لەناو میللەتانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی.

٢- لازاریف: کێشەی کورد ١٨٩٦-١٩١٧، بەشی یەکەم، ل ٢٣١. و: دوکتۆر کاویس قەفتان.

ڕۆژهەڵاتناسەکانیشی ڕاکێشاوەو بەگرنگییەوە باسیان کردووە، پاڵپشتێتی زێباری و بارزانی و هۆز و خێڵەکانی ترو پێشڕەوایەتی هەمەوەند خۆی لەخۆیدا گرنگیی تایبەتی هەیە.

هەروەها مێژوونووس محەممەد ئەمین زەکی"[1]" باسی ئەوەی کردووە کە هۆزی هەمەوەند لەساڵی (١٩٠٨ز-١٣٢٦ک) ڕۆژی شەهیدکردنی شێخ سەعید، ژیانی ئەو ناوچەیەیان تێکدا. چەند مانگێک ڕێگای هاتوچۆی نێوان سلێمانی و کەرکووکیان داخست و بنکەی پۆلیسی قەرەداغیان گرت.

لە هاوینی ساڵی ١٩٠٩ چەند قافڵەیەکی چەکداری و فەوجێکی (٢٥٠) نەفەری لەشاری چەمچەماڵ خۆیان ئامادەکرد کە ڕووەو سلێمانی بڕۆن کە زیاتر لە (١٠٠) سەد تفەنگی (ماوزەر) و کۆمەڵێ کەل و پەلی تریان پێ بوو.

(١٧٠) سوارەو پیادەی هەمەوەند"[2]" لەنزیک بازیان ڕێیان گرت لەو قافڵە سەربازییە. پاش شەڕێکی چارەکە سەعاتی هۆزی هەمەوەند توانییان دوو ئەفسەری پلەدارو هەندێ سەرباز بکوژن و هەموو فەوجەکە بەدیل بگرن. پاشان چەکیان کردن و هەرچی کەل و پەل و هێسترو چەکێک کەپێیان بوو لێیان سەندن، پاش ئەوە بەسەڵتی ئازادیان کردن و بەرەو کەرکووک گەڕانەوە.

هەر لەوکاتانەدا (٣٫٥٠٠) سێ هەزارو پێنج سەد سەربازی تریان لە چەمچەماڵ کۆکردەوە ئامادەکران بۆ هێرشکردن کە سێ مانگ خەریکی خۆئامادەکردن بوون. بەڵام هەمەوەندەکان شەوێک هێرش دەکەنە سەریان لە چەمچەماڵ پاش شەڕێکی سەخت هەمەوەندەکان توانییان لای ئاواییان لێ بگرن و چەندین سەربازیان لێ بەدیل بگرن و بەرەوپێش بچن تا ئەو هێزە گەڕانەوە"[3]". پاش ئەوەی ئەو شەڕە چەند مانگێک بەسەریدا تێپەڕی،

---

١- تاريخ سليمانية وانحائها، ل١٩٥-١٩٧.

٢- ئەو ساڵەش بە ساڵی (ماوزەر) ناوی دەبرێت لەناو هەمەوەند، چونکە چەکی زۆریان دەسکەوتووە کە هەمووی تفەنگی (ماوزەر) بووە.

٣- مێجەرسۆن دەڵێ: ئەو سەرکەوتنە شاعیرێک ناوی نەزانراوە وتوویەتی ئەوە ئاگرە هەر لە دوورەوە بڕوانە ڕووناکییەکەی و نزیکی نەکەوی وەکوو پەپوولە بە خۆت نەکەیت دەتبرژێنێ.

تورکـەکـان لەشـاری چەمـچـەمـاڵ دووبارە زیاتر لە (٨٠٠٠) هەشت هەزار سـەربازیان کـۆکـردەوە بۆ شـەرکـردن لەگـەڵ (٢٥٠) دووسـەدو پەنجـا کـەس لە هەمەوەند"[١]. حکومـەتی عـوسمـانی و ئێـرانی بەتەواوی ئاڵۆز بووبوون. هیچ رێیـەک نەمـابوو بیگرنەبەر بۆ لەناوبردنی هەمـەوەند کـە رێککەوتوون. سەرکردەیەکی تازە هاتە شاری چەمچەماڵ بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی ئەو هێزە گـەورەیە بکات کـە ئامـادەکـرابوو بۆ هێـرشـبـردن بۆ سـەر هەمـەوەندەکـان. هەمەوەندەکان هیچ وەڵامێکیان نەبوو تا هێزەکە دەستی کرد بە رۆیشتن. هێزەکە کە گەیشتە بازیان هەمەوەندەکان ماڵ و منداڵەکانیان نارد بۆ زەهاو. کە ئەم کارە سـەربازییـە لە ئابی سـاڵی ١٩٠٩ز دەسـتی پێکرد هێـزی تورک دەسـتی کـرد بەکـاری سـەربازی خـۆی لەناوچەکـەداو پەلامـاری عـەشـیـرەتی شـوان و چەند تیرەیەکی تریان دا کە بە (ئاژاوەچی) لەقەڵەم درابوون.

هەمـەوەندەکـان لەزەهاو مـانەوە تا سـاڵی ١٩١٠ز لەگـەڵ نازم پاشـای والیی بەغدا رێککەوتن و دووبارە گەڕانەوە بۆ بازیان.

هەمـەوەندەکان خۆیان بەدۆسـتی نزیکی بنەمـاڵەی شێخ مەحـموود دەزانی و کاتی خۆی شێخ سـەعیدی باوکی شێخ مەحمود لەگەرمەی ئاژاوەو کێشە لە سلێمـانی و لەوکاتەی سـوڵتـان عـەبدولحـەمـید شێخ سـەعیدی بەنوێنەری خۆی دانابوو، ئەویش پشتی بە هەمـەوەندەکان دەبەست و چەند جار داوای لە کـەریم بەگ سەرۆکی هەمەوەند کرد کە ئاسایشی سلێمانی لەدەست درێژیی ئەملاوئەولا بۆ بپارێزن"[٢].

---

١- بروانە: رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين و كوردستان، ترجمة: فؤاد جميل ل٢٣٠.

٢- فوئاد حەمە خورشيد الشاعر الكوردية، ل١٠٢ .

بەشەهیدکردنی شێخ سەعید و کوڕەکەی لە (مووسڵ)، هەمەوەندەکان لەهەسووان زیاتر بەم هەواڵە شڵەژان و یەکسەر ڕێگەی نێوان سلێمانی و کەرکووکیان کۆنترۆڵ کرد، مامۆستا رفیق حلمی لەم بارەوە دەڵێ (عەشیرەتی



عەشیرەتی هەمەوەند لەگەڵ نازم پاشا لە بەغدا ساڵی ١٩١٠ زایینی

ئازاو بەجەرگی (هەمەوەند) خەریکی ئەوەبوون کە شۆڕشێک بنێنەوە)[١].

هەر لەگەرمەی کێشەی مووسڵ، شێخ مەحموود لەماڵی مەحموود خدری هەمەوەند داڵدە دەدرێ کە ئەوکاتە یوزباشی بووە لەلای تورکەکان لە مووسڵ.

---

١- رفیق حلمی، یاداشت، بەرگی یەکەم، ل٤٥ .

# کەریم بەگ
# لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا

کە ئینگلیزەکان بە سەرۆکایەتیی ژەنەراڵ (مۆد) شاری بەسرەیان داگیرکرد تورکەکانی عێراق بەهەمموولایەکدا بەناوی (غەزا) و (جیهاد) کەوتنە هاندانی هۆزی عارەب و کورد دژی (ئینگلیزەکان)و توانییان بەو ڕێگایە هەستی زۆرکەس بجووڵێنن کە بەجۆشەوە دایانە پاڵ هێزە سەربازییەکەی تورک بە نیازی وەستاندنی هێرشی لەشکری ئینگلیز.

مامۆستا ڕەفیق حلمی دەڵێ: (هەزار سوارەی کورد لەژێر سەرکردایەتیی شێخ مەحمووددا لەو شەڕەدا بەشداربوون)"[1]. لەنزیک شاری (ناسرییە) بۆ کۆمەکی تورک کۆبوونەوە. لە نیسانی ١٩١٥دا لەشوعێبە لەشەڕێکی سێ ڕۆژیدا تورک شکاو لەو شەڕەدا زیاتر لە دووهەزارو پێنج سەد کەسیان لێ کوژراو بریندار کران و هەشت سەدیشیان لێ بەدیل گیران، جگە لەهەندێک چەک و جبەخانەش کە دایان بەدەستەوە. لە ئەنجامی ئەم شکاندنە سەرکردەی لەشکری تورک (سلێمان بەگی عەسکەری) خۆی کوشت. زیانی ئینگلیز لەم شەڕەدا دەگەیشتە دەوروبەری ١٢٥٠ کەسێک. هەڵوێستی پڕ لە ڕق گومانی بێ جێی نەفسەرانی تورک جەنگاوەرانی عەرەب و کوردیان ناچارکرد مەیدان بەجێ بهێڵن و بگەڕێنەوە سنوورەکانی خۆیان، هەرچەند لەشەڕی شوعێبەدا درێخییان لەگیان فیداکاری نەکرد"[2].

هەروەها د.کەمال مەزهەر دەڵێ: بەشی هەرەزۆری ئەو سێ هەزار کوردەی کە

---

١- ڕەفیق حلمی ، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩-٥٠.
٢- د. کمال مەزهەر، کوردستان لەساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، ل٦٥- ٦٦.

چوونە شەڕی ئینگلیز بریتی بوون لەلایەنگرانی شێخ مەحموود و کورگەلی داودەو دەلۆو زەنگنەو هەمەوەندو جافی دەوروبەری کەلار"[1].

لە ساڵی ١٩١٦ز رووسیای قەیسەری لەدوای داگیرکردنی بەشێکی کوردستانی ئێران بەردو ناوچەکانی شارەزوور و شارباژێڕ پێشڕەویی کرد، هێزی عەشایەری کوردستان کەوتنە خۆ بۆ بەرپەرچدانەوەی رووسەکان.

سوپای رووس لە ماوەتی شارباژێر و پێنجوێن بە تۆپ باران و کاولکردن زیانی زۆریان لەخەڵکی ناوچەکە دا، ژن و منداڵی بێ تاوانی زۆریان کوشت.

سوارەی هەمەوەند بەهێزێکی سەد و پەنجا سوارەوە بەشدارییان لەو شەڕە کردو لە سەنگەری پێشەوەی بەرەنگاریدا بوون لەدژی رووسەکان"[2].

رووسەکان زیانی زۆریان بەخەڵکی ناوچەکە گەیاند و تۆپ بارانی خەست و چڕ بۆ سەر (ماوەت)"[3]" و دەوروبەری دەستی پێ کرد. هەتا (نەریمانە کەلی) هەمەوەند پێشنیاری هێرشی سوارەی هەمەوەندی کرد بۆ گرتنی تۆپخانەی رووسەکان و لاچوونی ئەو فشارە ترسناکە. بەهێرش بردنیان توانییان دەستبگرن بەسەر تۆپخانەکەداو بە سێ شەهیدەوە ئازادانە گەڕانەوە ناوچەکە.

لەم شەڕەدا رووس لە بەرانبەر هێرشی لەشکری کوردو هەمەوەندەکان شکان و دەستکەوتی زۆر لە چەک و تەقەمەنی کەوتە دەستی هەمەوەندەکان"[4].

---

١- د.کەمال مەزهەر، گۆڤاری رۆشنبیری، ژمارە ١٢٥، ساڵی ١٩٩٠.

٢- نووسەر، لەخەڵکی ناوچەکە وەرمگرتووە.

٣- ماوەت، ناحیەیەکە دەکەوێتە رۆژهەلاتی سلێمانی.

٤- ئەم زانیارییانەمان لەکاک فاتیح حاجی قارەمان وەرگرتووە کە لە ژیاندا ماوەو ئەویش لەباوکی وەریگرتووە.

# کەریم بەگ و درێژەدان بە شۆڕش دژی ئینگلیزەکان

## باری سیاسیی سلێمانی لەکاتی هاتنی ئینگلیز

داگیرکردنی عێراق بەگشتی و کوردستانی باشوور بەتایبەتی لەکۆتایی مانگی ئابی ۱۹۱٤ز تا کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۱۸ز باری ئارامی ناوچەکەی بەتەواوی هەژاند و کۆمەڵە بەرئەنجامێکی ترسناکی لەگەڵ خۆیدا هێناو رەوتی مێژووی سیاسیی ناوچەکەی بەتەواوی بەرەو واقیعێکی ترسناک برد.

لە سەرەتای ساڵی ۱۹۱۸ز تا مانگی تشرینی یەکەم بەریتانیا سەرقاڵی ناوچە کوردنشینەکان بوو، لە ۳۰ی ئەو مانگە ئاگربەستی (موندرس) لەنێوان هێزی بەریتانیا و تورکیای ئیتیحادی راگەیەنرا. بەڵام لەبەر ئەوەی ئینگلیزەکان لەدوای ئاگر بەست مووسڵیان گرتبوو بۆیە سوپای (٦) لەسوپای عوسمانییەکان ئاگاداری سوپای ئینگلیزی کرد کە مووسڵ بەجێ بهێڵێ، گوایە لە دوای ئاگربەست سنووری بەزاندووە. بەریتانییەکان نەک مووسڵ بەڵکو بۆ ماوەیەک هەولێر و کەرکووکیشیان چۆڵ کرد، هەتا لە ۲۸ تشرینی دووەم دووبارە کەرکووکیان داگیرکردەوە.

سلێمانی و دەوروبەری لەم هێرشەی بەریتانیا، بەهۆی ئەو پەیوەندییە نهێنییەی نێوان شێخ مەحموود و ئینگلیزەکان بەشێوەی نامەگۆڕینەوە زۆر سەلامەت بوو. چونکە شێخ مەحموود لەئەنجامی بێزاری لەزوڵم و زۆرداری تورکە ئیتحادییەکان لەگەڵ ئینگلیزەکان رێککەوت کە سلێمانی داگیرنەکەن و ئەویش رازی بێت لەژێر سەرپەرشتیی حاکمی سیاسیی بەریتانی حوکمی

ناوچەکە بکات»[١].

بەڵام هەروەکو باسمان کرد ئینگلیزەکان شاری کەرکوکیان چۆڵ کردو دووبارە لەشکری تورک گەڕایەوە ناو شاری کەرکووک. مامۆستا رەفیق حلمی دەڵێ (باسی نامەکەی «شێخ مەحموود» کە بەهۆی یەکێک لەگەورەکانی خەڵکی کەرکووکەوە نێررابوو، ئەگا بەسەر لەشکری تورکەکان. لەسەرئەمە راسپێری ئەدا بە «مستەفا بەگ» قایمقامی سەربازی و سەرکردەی لەشکری تورک لەسلێمانی. مستەفا بەگ بەفێڵ و بەبیانووی هەندێ باس و تەگبیرەوە «شێخ مەحموود»ی داواکردە لای خۆی و دەس بەجێ گرتی و لەژێر چاودێریی هێزێکی گەورەدا ناردییە «کەرکووک»)»[٢].

پاشان لەدادگای عوسمانی حوکمی لەسێدارەدانی پێدرا. بەڵام (عەلی ئیحسان پاشا) کە لە تەمووزی ١٩١٨ سەرکردایەتیی سوپای شەشی وەرگرتبوو لەشوێن (خەلیل پاشا). شێخ مەحموودی هێنایە مووسڵ دڵی دایەوە هاوکاریی باشی کردو لەحوکمەکەشی عەفووی کرد و ناردییەوە سلێمانی و بەڵێنی لێ وەرگرت کە پشتگیریی عوسمانییەکان بکات لەدژی حکومەتی ئینگلیزو هەستی جەماوەری ناوچەکەش بەلای عوسمانییەکان راکێشێ، هەروەها پاشماوەی ئەو سوپایەی لە سلێمانی دەبێت دەخاتە ژێر فەرماندەی شێخ مەحموودەوە.

لەکاتی دووبارە گەڕانەوەی ئینگلیزەکان بۆ کەرکووک شێخ مەحموود پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە دەکات و ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ کە سلێمانی

---

١- عبدالمنعم غلامي، ثورتنا في شمال العراق ١٩١٩-١٩٢٠، مطبعة شفيق بغداد، سنة ١٩٦٦، ل٩١.

٢- رەفیق حلمی، یاداشت بەشی یەکەم، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان ١٩٨٨، ل٥٢.

-Loyalities Mesopotamia Volume 11 1919-1920 Apersonal Historical Record. By sir Arnold .T. Wilson,M,P.

تەسلیم بە ئینگلیزەکان بکا بەرامبەر بە هەندێ قەول و دەستکەوت. وەکو مامۆستا رەفیق حلمی، کە سکرتێری تایبەتی شێخ مەحموود بووە، ئاگاداری گفتوگۆی شێخ مەحموود و مێجەر نۆئێل بوو لەو رۆژانەدا، لە یاداشتەکانیدا باسی کردووەو دەڵێ: (بەڵام نامەی ئەمجارەی بە عیزەت تۆپچی (عیزەتی فاتە)و بە (ئەحمەد فائق= فایەقی) تایۆدا راستەو راست ناردە (کفری) بەرامبەر بەو ئیمتیازاتە کە بۆ خۆی و بۆ کورد بەشەرتی دانابوو ئینگلیزەکانی داواکردە سلێمانی، ئینگلیزەکان کەلەتەرتیباتی (عەلی ئیحسان پاشا) لەگەڵ شێخ مەحموود ئاگاداربوون ئەمەیان لێ رانەئەپەرموو و بەتەمانەبوون کە تا کاتی خۆی نەیێت بێنە سلێمانییەوە لەبەرئەوە ئەم نامەیەی «شێخ مەحموود»یان پێ خۆش بوو و ناردیان بۆ (ویلسن). خۆیشیان وەڵامی (بەڵێن)یان بۆ ناردەوەو داوایان لێکرد کە چاوەروانی ئەمری «ویلسن»ی حاکمی عام بکا)«[1]».

بەم جۆرە زۆربەی هۆز و عەشایەری سنووری ناوچەکە کە پەیوەندییان پێوە بوو لەگەڵ شێخ مەحموود لەوکاتانەدا دەستەوەستان وەستابوون و چاوەڕێی گۆرانکاریی نوێ بوون دەربارەی ناوچەکە.

پاشان ویلسن حاکمی گشتیی بەریتانیا فەرمان ئەدا بە (نۆئێل) کە ئەفسەرێکی شارەزای بارودۆخی کوردستان بوو دەست بەجێ بچێت بەرەو سلێمانی گوندی (داری کەلی)«[2]». (نۆئێل) خۆی و ئەفسەرێکی تری ئینگلیز (مێجەر دانلیس) و دوکتۆرێک و ئەندازیارێک و ئاشپەزێک و ژمارەیەکی سەربازی لەگەڵ دەبێ. وەکو مامۆستا رەفیق حلمی دەڵێ: (ئینگلیزەکان لەسەرەتادا نەیانویست بێنە ناو ئەوان، هێزێکیان لەگەڵ خۆیاندا نەهانی بوو)«[3]». پێش ئەوەی ئینگلیزەکان بگەنە ناو شاری سلێمانی، فەوجەکەی تورک ئەوەی کورد بوو و جلی کوردیی لەبەرکرد و ئەوی تریشیان کەکورد نەبوون

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت بەشی یەکەم، ل٥٧-٥٩.

٢- داری کەلی دێیەکی «شێخ مەحموود»ە لەناوچەی بازیان.

٣-رەفیق حلمی، یاداشت، ل٥٩.

خۆیان شاردەوەو شلەژان.

پاش گەیشتنی (میجەر نۆئیل) بۆ ناو شاری سلێمانی، لەبەردەم کۆبوونەوەیەکی جەماوەریدا شێوازی ئیداری و دەسەلات رادەگەیەنێت، شێخ مەحموود حوکمی ئەوەی پێ سپێردرا کە حکوومەتێکی تایبەت بە کورد لە سلێمانی بە سەرۆکایەتیی خۆی دابمەزرێنێت. ئەویش هەر زوو تەشکیلەی وەزاریی حکوومەتەکەی ڕاگەیاند.

ماوەی حکوومەتی یەکەم لە (تشرینی دووەمی ١٩١٨ تا مانگی مایسی ١٩١٩)ی خایاند، لەسەرەتاوە تا مانگی ئایاری ١٩١٩ پەیوەندیی نێوان ئینگلیزەکان و حکوومەتی شێخ مەحموود ئاسایی بوو، لەو مانگەوە و بەهاتنی (مێجەرسۆن)"[١]" بۆ سلێمانی لەجیاتی (میجەر نۆئیل) وەکو حاکمی سیاسی پەیوەندیی نێوان ئینگلیزەکان و شێخ کەوتە گرژی و ئینگلیزەکان لە شێخ کەوتنە بیانوو. ئەویش لێی قبووڵ نەکردن و شەڕ لەنێوان کورد و ئینگلیز دەستی پێ کرد.



مێجەرسۆن

١- (مێجەرسۆن) زمانی کوردیی باش دەزانی، بۆزیاتر ئاشنا بوون لەم بارەوە بڕوانە گۆڤاری نووسەری نوێ، ژمارە (٥) ئەیلوولی ١٩٩٨ ل٧١ ٧٣ لەنووسینی کاک کەمال ئەسعەد چەرمەگا، وتاری بەناونیشانی، «مێجەرسۆن کوردی زانێکی کەم وێنە بووە».

# پەیوەندیی بنەماڵەی شێخ بەهۆزی هەمەوەند-ەوە

پێشتر باسی پەیوەندیی شێخ مەحموود و کەریم بەگ و پیاوە ناودارەکانی تری هۆزی هەمەوەندمان کرد، هەر لەکاتی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموود و کاتی شەڕی شوعەیبە و شەڕی رووس-ەوە، ناودارانی ئەم هۆزە لەو رۆژە سەختانەدا هاوسەنگەری شێخ مەحموود بوون.

کەریم بەگی هەمەوەند پەیوەندی و پابەندیی بە هەڵوێستی شێخ مەحموود زۆر بەتین بووە، ئەمەش وای کردووە لەو کاتانەی شێخ مەحموود پەیوەندیی لەگەڵ ئینگلیزەکان باش بووە کە ئیلتزام بە ئاگر بەستەوە بکات.

مامۆستا رەفیق حلمی دەڵێ (بەڵام گەڕانەوەی تورکەکان بۆ کەرکووک بوو بەهۆی تێکچوونی هەموو شتێک. «شێخ مەحموود» وەکو گیرامانەوە لە سلێمانی گیراو نێررایە کەرکووک. گەلێ لەوانەی کە لە ناردنی نامەکەی پێشوودا هاوبیری بوون خرانە بەندیخانەوە یا جەریمەکران. هەندێکیشیان رایان کردو سلێمانییان بەجێهێشت. هەمەوەندەکانیش لەو رۆژەوە لە ئینگلیزەکان هەڵگەڕانەودو بوون بەدوژمنیان)»[1]. لە کاتی دیارنەبوونی شێخ مەحموود هۆزی هەمەوەند دژایەتیی ئینگلیزەکانی کردووەو لەکاتی پەیوەندیی شێخ مەحمود بۆ دووەم جار بەئینگلیزەوە بەپێی ئەو جۆرە رێکەوتنە کەریم بەگ و هۆزەکەی چاوەڕێی بەرەوبوومێک بوونە بۆگەلی کورد، لەناکامی ئەو گفتوگۆ و پەیوەندییانەی شێخ و ئینگلیز.

قایمکاریی کەریم بەگ لەدەربەندی بازیان لەوەدا نەبوو بهێڵێ ئینگلیزەکان وا

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت، بەشی یەکەم، ل٥٥.

بەسەلامەتی تێپەڕن بۆ سلێمانی و شارەزوور. کە مێجەر (نۆئێل) خۆی و چەند نەفسەرو سەربازێک بەناو ولاتی هەمەوەندا چوونەتە سلێمانی مامۆستا ڕەفیق حلمی باسی ئەوەشی کردووە کەدەڵێ (یەکەم نوێنەری ئینگلیز لە کوردستان لە (کفری) و چەمچەماڵ-دا هاتە داری کەلی)»[1].

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ (کە مێجەر هاتە سلێمانی بارگەکەی تەنها دەستێک پێخەف بوو. ڕۆژی دوایی لەبەر دەرگای سەرای حکوومەتدا لەپێش چاوی چەند هەزاران دانیشتوانی شارو عەشایەرەکانی- وەکوو جاف و هەمەوەند و پشدەر، مەنگوڕ، ئاکۆ، بلباس، جەباری، زەنگنە، داودە، تاڵەبانی و عەشایەرەکانی تری سلێمانی چووە سەرکورسییەک، بەزمانی فارسی گوتی:

بەناوی حکوومەتی بەریتانیاو حاکمی عامی عێراقەوە قسەتان لەگەڵ ئەکەم:

(ئەوا لە یەخسیری ڕزگار بوون. ئیتر سەربەست و ئازادن. شێخ مەحموود حوکمداری کوردستانە. لەسەرفەرمایشی حاکمی عام لە بەغدا ئەم مژدەیەتان ئەدەمێ)»[2]. بەم جۆرە فەرمانی حوکمداریی شێخ مەحموود لەلایەن بەریتانیاوە دەرچوو و مێجەر (نۆئێل) خۆی ناوی (حاکمی سیاسی) لێنرا. دەربارەی تەشکیلاتی وەزارەتەکەی شێخ مەحموود مامۆستا ڕەفیق حلمی دەڵێ: (مانگی (١٥,٠٠٠) ڕوپیە بۆ حوکمدار بڕایەوە. لە سلێمانیدا تەشکیلاتێکی وەکو تەشکیلاتەکەی پێشوو لیوا دامەزرا. «سەیید عومەر»ی مامی شێخ مەحموود کرا بە موتەسەریف و حاجی سەیید حەسەن مامی دووەمی بوو بە (حاکم) یا (ڕەئیسی شەرع). شێخ قادری براشی بوو بە (سەرداری لەشکر). سەیید عەلی (بسم الله)ش بێ بەش نەکراو بوو بە (قۆمیسەر).

بەم جۆرە بەشی زۆریەی خزم و کەس و کاری حوکمدار و دەستەو دائرەی شێخان هەریەکە بەجۆرێک و بەپێی حاڵ، کارێک یا مەواجبێکیان بۆ

---

١- ڕەفیق حلمی، یاداشت، بەشی یەکەم، ل ٥٨.
٢- ئەحمەد خواجە، (چیم دی)، بەرگی یەکەم، ل٢٠-٢١.

ڕێکخرابوو و دامەزرابوون»[١]. کەریم بەگ و مەحموود خانی دزلی و سەیید محەمەد جەباری لەکاتی تەشکیلاتەکەی حکوومەتی شێخ مەحموود هیچ پلەو پایەیەکیان نەویست لەبەر ئیشوکاری هۆزەکانیان کە دەسەلاتی بالایان هەبووە لەناوچەکە. بەلام پشتگیری تەواویان لە حکوومەتەکەی شێخ مەحموود کردووە.
لێرەدا بەپێویستم زانی بەکورتی باسی ئەو ناکۆکییەی موشیری حەمەی سلێمان و شێخ مەحموود بکەم کە موشیر ئاغا لەسەرچی لە شێخ مەحموود دلی رەنجاوە. بەلێ شێخ مەحموود هەموو خزم و کەسوکاری خۆی هەریەکە بەپلەیەک لە حکوومەتەکەی دامەزراندو بۆ موشیر ئاغاش هیچ، کە بەراستی موشیر ئاغا یەکێ بووە لەوانەی لەهەموو ناخۆشی و تالییەکدا لەگەلیدا بووە رۆلێکی گرنگی هەبووە لەناوچەکەدا، بەتایبەتی بەرامبەر عوسمانییەکان و ئینگلیزەکان.

مام موشیر وتی: کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو زۆری تر ئامادەی ئەو کۆبوونەوە بوون. هەموو کەسوکاری شێخ مەحموود پلەو پایەی ئەفسەرو وەزیریان وەرگرت، لەوانە شێخ قادری برای مقەدەم قادرو خزمی وای هەبوو لوولەی تفەنگ و ماوزەری باروووت پیسی نەکردبوو. تەقەی نەکردبوو، بەلام بوو بە مێجەرو ئۆفیسەرو وەزیر. منیش هیچ، تووڕەبووم و وتم قوربان شێخ مەحموود ئەمە ناحەقییەو ئەگەر وابێت لەم رۆژەوە من لەگەلت نیم لەپشتی تفەنگەوە نەبێت نامبینی. حەقی خۆم بوو من دوژمنی کورد نەبووم گوناهم بەملی شێخ مەحموود.

موشیر ئاغا دەلێ: بەپەنجا سواری جەریەزەی هەمەوەندەوە بۆ سلێمانی چووم بۆ پشتگیری کردن لە شێخ مەحموود. هەر هەمەوەند بوو دوای کوشتنی شێخ سەعیدی باوکی سالی ١٩٠٨ یاخی بوون و ئاژاوەیان نایەوە لە سلێمانیدا دژی عوسمانییەکان، داوای ئازادکردنی شێخ مەحموودیان دەکرد لەبەندیخانە. هەر چاونەترسی و شۆڕەسواریی ئێمە بوو ئینگلیزی ناچارکرد بۆ داخوازیی کورد مل کەچ بکات و کورد بوو بەحکوومەت و شێخ مەحموودیش بوو بە حوکومداری کورد»[٢].

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت، بەشی یەکەم ل٦٢.
٢- ئازاد هەمەوەندی، گۆڤاری رەنگین، ژمارە ١٠٩، سالی ١٩٩٨.

# کەریم بەگ
# لە شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحموود-دا

کاتێک ئینگلیزەکان لەشێخ مەحموود کەوتنە بیانوو، ئەمەش ناکۆکیی دروست کردو شێخ مەحموود کەوتە پەیوەندی کردن بەسەرۆک هۆزە نزیکەکانی خۆی، لەپێشەوەیان کەریم بەگی هەمەوەند و مەحموود خانی دزلی و هەباسی مەحموود ئاغای پشدەر«[1]».

مامۆستا ئەحمەد تەقی کەخۆی لەوسەردەمەدا ژیاوە دەڵێ: (شێخ مەحموود توانی کەریم بەگی فەتاح بەگی سەرەک عەشیرەتی هەمەوەند و هەباسی مەحموود ئاغای پشدەر و مەحموود خانی دزلی بکات بەدۆستی خۆی، هەر بەپشتی ئەمانەش کەوتە خۆئامادەکردن بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێک)«[2]».

ئەمەش لەکاردانەوەی (مێجەرسۆن)ی حاکمی سیاسی ئینگلیز لە سلێمانی کە کەوتبووە پەیوەندیکردنی نهێنی بەعەشایەرو خەڵکی دەروون بەزیبوو تا بیانکاتە داردەست و بەکرێ گیراوی خۆیان«[3]».

شێخ مەحموود لەگەڵ کەریم بەگ رێک دەکەوێت کە کاری کەریم بەگ رێگرتن بێت لەهەر هێزێکی سەربازی کە لەکەرکووکەوە بێت بۆ پشتیوانی هێزی ئینگلیزەکان لە سلێمانی و لەگەڵ مەحموود خانی دزلی رێک دەکەوێت کە بێت بۆ سلێمانی بەناوی زیارەتی مەرقەدی کاکە ئەحمەدی شێخەوەو رزگاری بکات لەدەستی ئینگلیز. مێجەرسۆن هەست بەمەدەکات و داوا لە شێخ مەحموود دەکات نەیەڵێ مەحموود خانی دزلی بەو هێزەیەوە کە بریتیبوو لە ٣٠٠ سێ سەد کەسی چەکدار بێتە سلێمانی. بەڵام شێخ مەحموود وەڵامی دایەوە کە لە عورفی

---

١- رەفیق حیلمی، یاداشت، بەشی دووەم، ل١١٣.

٢- ئەحمەد تەقی، یاداشتەکانی، ل٢٨.

٣- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، ل١١٣.

ئێمەدا نییە کۆسپ بخەینە پێش ئەوانەی دێنە زیارەتی کاکە ئەحمەدی شێخ.

مێجەرسۆن بەهاتنی مەحمود خانی دزلی زۆر شپرزە دەبێت و لەخۆی دەترسێت. ناچار هەڵدێ و خۆی دەگەیەنێتە شاری کەرکوک و لە ڕۆژی (٢١)ی مایس ١٩١٩ و (گرینهاوس) دەکاتە وەکیلی خۆی. ڕاکردنی مێجەر سۆن بۆ کەرکووک مانای شەڕو بێئومێد بوونە لە سلێمانی و دەوروبەری. خەتی تەلەفۆنی نێوان کەرکووک و سلێمانی بڕاو هەواڵ نەدەگەیشتە بەغدا. پاش شەڕێکی گەورە لەنێوان لەشکرەکەی مەحمود خانی دزلی کە ژمارەیان ٣٠٠ سوار بووەو هێزەکەی ئینگلیز بەسەرپەرشتیی (موقەدەم دانلیس)، شۆڕشگێڕان توانییان ئەو هێزەی ئینگلیز بشکێنن و (موقەدەم دانلیس) بەدیل بگرن. پاشان هەموو ئەو ئەفسەرو کاربەدەستانەی ئینگلیز بەدیل دەگیرێن و دەیانهێننەوە دەبۆکە"[١]. پاش ئەوە لەشکرێکی ئینگلیز لەکەرکووکەوە دەکەوێتەڕێ بۆ ئەوەی بگەنەفریای هێزەکەی ئینگلیز لەناو شاری سلێمانی و شۆڕشەکە فەرامۆش بکەن، بەڵام دەکەونە بۆسەی سوارەکانی کەریم بەگی هەمەوەند. لە دەربەندی بازیان بەدیل دەگیرێن و رووت دەکرێنەوە لەو چەک و تەقەمەنییەی کە پێیان بوو بەنیازی ئەوەی بۆ مەبەستی بەرگریکردن لە شاری سلێمانی بەکاری بهێنن. مامۆستا رەفیق حلمی لە باسی ئەم شەڕەدا دەڵێ: (هەر لەم ڕۆژەدا کاروانێکی عەسکەری کە چەک و سیلاحێکی زۆریان پێبوو و لەکەرکووکەوە دەهاتنە سلێمانی لەلایەن کوردەکانەوە شپرزە کران و رووت کرانەوە)"[٢].

شێخ لەتیف-ی شێخ مەحمودی حەفید دەڵێ: (لەشکری ئینگلیز، ویستیان بێنە ناو شاری سلێمانی و ئاگری بزووتنەوەکە خامۆش بکەن، بەڵام سوپای کورد لەژێر فەرمانەدەی میر مەحمود خانی دزلی-ی هەورامیدا، پەلاماری سوپای ئینگلیزی داو لەماوەیەکی کەمدا توانییان لەناویان بەرن کاتێک ئەم هەواڵە گەیشتە خەڵکی و گوێیان لە دەنگی تەقەبوو، بەرەو لای مەحمود خان ڕۆیشتن

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ل١١٥.

٢- سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم بەشی دووەم ل١١٥.

بۆ ئەوەی لەشەڕەکەدا یارمەتییان بدەن، بەڵام پێش ئەوەی بگەنەلایان کۆتاییان پەدوا سەربازی ئینگلیز هێنابوو. جگە لەهەندێکیان کە هەڵاتن، یان دەستگیرکران.

کەریم بەگی فەتاح بەگ و ئەحمەد بەگی ساحێبقران، لەگەڵ ژمارەیەک لە چەکدارانی کورد دوایان کەوتن. ژمارەیەکیان لێ کوشتن و هەندێکیشیان بەرەو کەرکووک هەڵاتن. ئەوانەش کە پیاوانی رامیاریی ئینگلیزبوون، بە دیل گیران و پارێزگاریی باش و رێزی زۆریان لێ گیرا)»[1].

---

١- شێخ مەحموود شێخ کاوە حەفید، یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل٥٤.

# شەڕی تاسلووجە

هەواڵی ڕاپەڕین و تێکشکانی ئینگلیز لەلایەن شۆڕشگێڕە کوردەکانەوە گەیشتە مەندووبی سامی لە بەغدا. مەندووبی سامی ئەمری بەسەرکردایەتیی عەسکەری کەرکووک کرد کە بەزووترین کات بگاتە سلێمانی بۆ ئەوەی ئابڕوویان بکرنەوە، چونکە (گرین هاوس)یش لە سلێمانی گیرابوو. شێخ مەحموودیش لەشکرەکەی خۆی لەتاسلووجە لەسەنگەردابوو، کەریم بەگیش هاتە تاسلووجە، عەشیرەتی (ئیسماعیل عوزێری)ش کەسەر بە جافەکان بوو تێکەڵاوی شۆڕشەکە بوون.

هێزێکی گەورەی ئینگلیز کە پێکهاتبوو لە (٥٠٠٠) پێنج هەزار سەرباز بەسەرۆکایەتیی (مێجەر بومی) لە ١٩١٩/٥/٢٥ گەیشتە تاسلووجە. شەڕ سەر لەبەیانی دەستی پێکردو بەپێی نەخشەیەکی سەربازی داڕێژراو شۆڕگێڕەکان لەم شەڕەدا زاڵ بوون. لەشکری ئینگلیزەکانیش شکستی هێناو زیاتر لە (١٠٠) سەد کوژراو لەدوای خۆی بەجێ هێشت، لەگەڵ کەلوپەلێکی سەربازی زۆردا. لەنێوان دەسکەوتەکاندا ئوتومبیل و زرێ پۆش و تۆپ و چەندین پارچە چەک و تەقەمەنی و چادر و کەرەسەی‌تر کەوتە دەستی شۆڕشگێرانی کورد، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەدیل. هۆزی هەمەوەند لەم شەڕەدا ڕۆڵی کاریگەری گێڕا. دیل و دەستکەوتی زۆر کەوتە بەردەستیان. ئەم شەڕە هەتا سەرلەئێوارەی خایاند. دوابەدوای شەڕی تاسلووجە کە ئینگلیزەکان بەزەلیلییەوە هەڵاتن. عەبدولمونعیم غولامی باسی بەشداریی کەریم بەگ دەکات دەڵێ( لەلای چەمچەماڵەوە (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند) کەیەکێکە لەهەرە بەناوبانگترینی سەرۆکەکانی هۆزی هەمەوەند بەخۆی و ژمارەیەکی زۆر لە سوارەی هۆزەکەیەوە گەیشتە شوێنی ناوبراو)»[١].

---

١- (عبدالمنعم غلامی)، ل٩٨-٩٩.

لەدوای شەری تاسلوجە و تێکشکانی ئینگلیزەکان شەوی ١٩١٩/٥/٥ هێرشیان بردە سەر شاری (چەمچەماڵ)و ئازادیان کرد. ئەم ئازادکردنە بە سەرۆکایەتیی کەریم بەگ بوو. لەم دەست بەسەراگرتنەدا «کاپتن بۆند» حاکمی سیاسیی چەمچەماڵ و کۆمەڵە کاربەدەستێکی ئینگلیز بەدیل گیران و بەسەلامەتی گەیێندرانە سلێمانی. دیارە بەم زەبر وەشاندنەی کەریم بەگ لەئینگلیزەکان، بەتایبەتی (کابتن بوند) رق و کینەیان زیاتر هەڵساو دواتر پیلانی لەناوبردنی کەریم بەگیان دارشت.



سەبارەت بەم داستانە عەبدولمونعیم غولامی دەڵێ: (یەکەم کەس کەچووە ناو شارەکەوە کەریم بەگی هەمەوەند بوو کە سەرکردەی سوارەکان بوو و لەم رووداوەدا (نەقیب بۆند) کەجێگری فەرمانرەوای سیاسی بوو لەم شارەدا بەدیل گیراو بەبەندکراوی و لەژێرچاودێریی هێزێکی زۆردا نێردرا بۆ سلێمانی)[١]. لەئەنجامی بەدەست هێنانی ئەم سەرکەوتنانە، شۆرش زیاتر کڵپەی سەندو زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستانی گرتەوە، وەک ناوچەی رانیە و کۆیە.

---

١- (عبدالمنعم غلامي)، ل١٠٠.

# شەڕی قەرەهەنجیر

رفیق حلمی دەڵێ: (هێزێکی‌تر لەژێر سەرکردایەتیی (مێجەر فرێزەر)، ١٧ میل لەلای کەرکووکەوە لەنزیک (قەرەهەنجیر) لەلایەن هێزی «مەحموود خانی دزلی»یەوە سێ رۆژ گەمارۆدران. ئەم هێزەی (فرێزەر) ڕابەرایەتییەکی ئازایانەی کرد بەلام لەئەنجامدا تووشی گەلێ دەردە سەری و رەنج هات و کوشتارێکی زۆری دا)»[١].

هەروەها مامۆستا ئەحمەد خواجە دەربارەی ئەم شەڕە دەڵێ: (دووەمین شەوە هەورامی دزلی و دوژمن لە قەرەهەنجیر لە جەنگدان. ئیمڕۆ سوارەی مەندمی و هەمەوەندیش ناوێتەیان بوون، لەدوژمن کوشتار زۆرە. تالان زۆر گیراوە. پێنج لە هەورامی و دوو لەمەندمی کوژراوەو بیست و دوو بریندار هاتۆتەوە).

دوژمن هێزێکی زۆری ئینگلیزو هیندیی بەتۆپ و چەکی زۆرەوە لە مووسڵەوە گەیاندە کەرکووک.

نووسراوی ژمارە-٤٢/لە ١٠ حوزەیران: دوژمن دێت بۆ چەمچەماڵ هێزی سوارەی ئێمە لە کفرییەوە تا ئاڵتوون کۆپری بلاوە. کار بەباشی نابینرێت تەنیا هێزی پیادە لەبارەگا ماوە»[٢].

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی (١)، بەشی ٢، ل١٢١-١٢٢.
٢- ئەحمەد خواجە، بەرگی (١)، ل٤٦-٤٧.

## شەڕی چیمەن"[١]"

مامۆستا ئەحمەد خواجە باسی ئەم شەڕەی کردووەو دەڵێ: لە چیمەن تاڵانێکی زۆر لە دوژمن گیراو (١) مەترالیۆز. لاشەی ئەفسەرێکی ئینگلیزی و (١٥) سۆلجەر بەجێ مابوو. بریندارەکانیشیان بردەوە. زەرەروزیانی ئێمەش لەم شەڕەدا ئەوە بوو کە حەمەئەمینی کۆزەڕەقە کوژرا، لەگەڵ (٢) جەباری و (١) هەمەوەندو (٢) بریندارێشمان هەبوو"[٢]".

لە باسی گەڕانەوەی ئەم شەڕە حاجی ئەحمەد فەتاح هەمەوەندی لە مامی سەعیدی بیستووە کە خۆی بەشداریی ئەم شەڕەی کردووەو دەڵێ: (ئەم شەڕە کە شەو و ڕۆژێکی خایاند. دوژمن هێزێکی زۆری هێنابوو شپرزەیان کردین. چونکە فڕۆکەیش ئامانی نەبوو. تۆپێکی گەورەیان هێنابوو، تۆپ بارانیان ئەکردین. لەوکاتەدا کەریم بەگ و سەیید محەممەدی جەباری هاتن و وورەی لەشکرەکەمان زۆر بەرزبووەوەو ئێمە دەستمان.کرد بەهێرش بردن بۆ سەر دوژمن. دوژمن شکا. تۆپەکەشمان گرت. من بە چاوی خۆم هەشت کوژراوم بینی، لەگەڵ یەک ئەفسەر کە لاشەکانیان بەجێ مابوون. چوار (تەیارە) لە گەردابوون بوو بە هۆی شەهیدبوونی شەش کەس لە هەمەوەندو جەباری و بریندار بوونی هەشت قارەمانی تر. شەهیدەکان سێیانیان هەمەوەندبوون. سەیید عەبدولڕەحمان مۆردانەش کوژرابوو، لەگەڵ سەیید وەلی سەیید مستەفا جەباری. دەست کەوتێکی زۆرمان کەوتە دەست لەگەڵ تۆپێکی گەورە بە چوار گوللەوەو مەترەلیۆزێک و چوار چەک و هەندێ کەل و پەلی تر. لەدواییدا هێزی دوژمن هەتادەهات زیاد دەبوو

---

١-چیمەن، گوندێکە پێنج کیلۆمەتر لە کەرکووکەوە دوورە، دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکووک-ەوە.

٢- ئەحمد خواجە، (چیم دی)، بەرگی یەکەم، ل٤٦.

لەوناوچانەدا هێرشی دوژمن بوو بەهۆی شکاندنی هەموو ئەو هێزانەی کە لەنێوان قەرەهەنجیرو کەرکووک دانرابوون. لەشکری هەورامیش لەوێ بوو. سێ شەهیدیان هەبوو، دواتر گەڕانەوە بۆ قەرەهەنجیر)»[1]. لە باسێکی تری، کاک حاجی ئەحمەد دەڵێ: هێزێکی دوژمن کە شەوێک پێش شەڕی دەربەندی بازیان دزەیان کردبوو بۆ بەینی (باشبلاغ)و قەرەهەنجیر، لەکاتی گەڕانەوەی لەشکرەکان بۆ چەمچەماڵ، لەگەڵ نیوەشەودا هەندێ سوارەی هەورامی و جەباری کەوتنە بۆسەکەیانەوەو شەڕ دامەزرا چوار بریندار هەبوو ئیتر لەشکرەکانیتر بەدەنگی تەقەکەوە هاتن. لێیان دان. هێزەکەی ئینگلیز شکاو لاشەیەکیان بەجێما. هێزەکانی کورد بەرەو چەمچەماڵ کشانەوە شێخ مەحموود خۆی هاتە دەربەندی بازیان. لەشکرەکە لە دەوروبەری چەمچەماڵ و دەربەندی بازیان دامەزرا.

---

١- کاک رەمەزان رەزا فەرەج لەزاری باوکییەوە باسی ئەم رووداوەی دەکرد، کە ئەم شەڕە بەچاوی خۆی دیبوو، کە دەیوت: [شەڕەکە زۆرسەخت بوو، مەترەلیۆزی دوژمن شپرزەی کرد بووین. سێ بریندارمان هەبوو، یەکێکیان ناوی (ئەحمەد کوڕی قادر بێری هەمەوەند) بوو. (ئەحمەد) کە بریندار بوو ماینەکەشی کوژرا.

(قادر بێری هەمەوەندی) خۆیشی لەشەڕەکەدا بوو. ئاگادار کرا کە (ئەحمەد)ی کوڕی بریندار بووە. شەش شەهیدی تریش هەبووە. مام قادر بێری وتی: (ئەحمەد) بدەنە دەستم. ئێمەش (ئەحمەد)مان بەرزکردەوە بۆی بۆ بان (ئەسپەکەی) و دامانە دەستی. بینیم مام قادر بێری، (ئەحمەد)ی کوڕی بەپشت خۆیەوە بەستەوە، لەبان ماینەکە. سەیر لەوەدابوو (مام قادر بێری) مەیدانی شەڕەکەی بەجێ نەهێشت و هەر تەقەی لە دوژمن دەکرد هەتا مەترەلیۆزەکە لەلایەن (سەید محەمەد جەباری و سابیر بەگ) گیراو دوژمن شکا. ئێمە سەرکەوتین.

ئینجا (مام قادر بێری هەمەوەندی) بەرەو چەمچەماڵ گەڕایەوە بۆ تیمارکردنی کوڕەکەی. ئەمەش هەڵوێستی ئەو شۆڕشگێڕە بوو لەکاتی دژایەتی ئینگلیزەکان]. بۆ سەلماندنی ئەم راستییەش (کاک رەمەزان رەزا فەرەج) بەهەمان شێوە بۆمانی گێڕایەوە کە ئێستا لەژیان ماوەو دانیشتووی ئۆردووگای (تەیناڵ)ی سەر بە سەرچنارە لە پارێزگای سلێمانی.

حکومەتی بەریتانیا زۆر نارەحەت بوو، بەسەرکەوتنە یەک لەدوای یەکەکانی شێخ مەحموود و هێزە هاوپەیمانەکانی، بۆیە زیاتر کەوتە خۆ بۆ ڕێگەگرتن لە تەشەنەی شۆڕش بۆ ناوچەکانیتر، ئەوەبوو لە (بەغدا) فەرمان بە ژەنەراڵ (فریزەر)درا لە (مووسڵ) کە فیرقەی (١٨) هەژدەمین بگەڕێنێتەوە (کەرکووک). مامۆستا ڕەفیق حلمی دەڵێ: (بەڕاستی ئیتر ئینگلیزەکان کەوتبوونە (دەرەک)ەوە. لەبەر ئەمە ئەمردرا بە (ژەنەراڵ فریزەر) کەبەفرقەی هەژدەهەمەوە بگاتە کۆڕی شەڕ. لەولای تریشەوە (ژەنەراڵ ساندەرس) لە (هەولێر) و (ئاڵتوون کۆپری)یەوە تا (کەرکووک) و (چەمچەماڵ) چاودێریی ڕێگەکانی پێ سپێررابوو. جگە لەمەش ئەبوو مەشق بە لەشکرەکانی کەرکووک و فێری شەڕی ناو شاخەکانیان بکا)[١].

د.فوئاد حەمە خورشید دەربارەی هەڵسەنگاندنی هێزەکەی (ژەنەراڵ فریزەر) دەڵێ: (هێزە زەبەلاحەکەی پێک هاتبوو لەیەک لیواو سێ فەوج و دوو سریە لەتەک چەندین بەشی تۆپی میکانیزمی و فڕۆکەی جەنگی و شارەزایانی موخابەرەی بێتەل و ئەندازیارانی مین چاندن و ئەندازیارانی شاخ. چونکە ئەو هێزە داگیرکەرە پێشەکی زانیارییەکی تەواوی بەدەستەوە هەبوو دەربارەی جوگرافیای سوپایی ناوچەی دەربەندی بازیان- گۆڕەپانی جەنگەکە نەک هەر بەنەخشەو فۆتۆگرافیی-ئاسمانی (بەفڕۆکە)، بەڵکو لەڕووی مەیدانیشەوە چەند ئەفسەری مەساح و ئەفسەری سیاسی پێشەکی ئەو ناوچەیەیان بەباشی تا سلێمانی بینیوەو پشکنیوە. سەرەڕای هەموو ئەو زانیارییە جوگرافیاییانە، چەندین ڕاپۆرتی نهێنی دەربارەی ناوچەکەو دانیشتوانی و هەڵوێستی خێڵەکانی

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، ل١٢٢-١٢٣.

لە ئارشیفی موخابەراتی بەریتانیا لەژێر دەستی ژەنەراڵ (فریزەر) و ئەرکانی جەنگی بوون، کاتی پلان دانانی ئەو هێرشەیان بۆ سەر بەردە قارەمان)«[١]».

ئەوەبوو بەرەبەیانی رۆژی ١٩١٩/٦/١٨ هێزەکەی (ژەنەراڵ فریزەر) گەیشتە دەربەندی بازیان. شەڕدامەزرا. پاش دوو کات ژمێرونیو«[٢]» شەڕ کۆتایی پێهات. لەشکری شێخ مەحموود شکا. مامۆستا رەفیق حلمی دەڵێ: «لەشکری (سیک و گورگە) بەسەر کوردا زاڵ بوون. زیانی لەشکری کورد (٤٨) کوژراو و ژمارەیەکی زۆر بریندار لەوناوەدا کەوتبوون، ئەوانەی بەدیلیش گیران (١٢٠) کەسێک ئەبوون. «حاجی سەیید حەسەن»ی مامی شێخ مەحموودو تایەری فەرخە (تاهیر ئەفەندی مودیری پۆلیسی شێخ مەحموود) لەناو کوژراوەکانا بوون. «حەمەنێرگەلە»ی پیاو ماقووڵی شێخ وای زانی کە شێخ مەحموود کوژراوە. لەبەر ئەمە سواری (ئەسپەکەی شێخ)بوو بووو رای کردبوو. بەم جۆرە لە (دیل)ی رزگاری بوو. «شێخ مەحموود) دوای برینداری کشایەوە ژێر بەردێ و لەوێدا لێی کەوت. ئینگلیزەکان دیسانەوە بەهۆی موشیر ئاغاوە«[٣]» شێخ مەحموودیان ناسییەوە و خستیانە (سەییارە)تێکەوە ئینجا لەژێر پارێزگاریی هێزێکی گەورەدا دەسبەجێ ناردیانە (بەغدا)»«[٤]».

زۆر هۆکاری بابەتی و زاتی هەبوون لەتێکشکانی شێخ مەحموود، لەوانە نابەرامبەری چەک و تەقەمەنی و خواردەمەنی. لەشکرەکەش لە ئاستی ئەو سوپایەی ئەواندا نەبووە، نە بە ژمارەو نە بە چەک.

---

١- د. فوئاد حەمە خورشید، گۆڤاری رەنگین ژمارە ١٠٧ ساڵی ١٩٩٧ ل١٤ (وتارێکی مێژوویی بەناونیشانی «جوگرافیای سەربازی و موشیری حەمەی سلێمان؟»).
٢- ئەندازیار: ئازاد هەمەوەندی، گۆڤاری رەنگین ژمارە ١٠٩ ساڵی ١٩٩٨ل١٢.
٣- بروانە پاشکۆی ژمارە (١)
٤- (رەفیق حلمی، یاداشت)، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، ل١٢٦-١٢٧.

لەکاتی شەڕی دەربەندی بازیان مامۆستا عەبدولمونعیم غولامی دەڵێ:
(شۆڕشگێڕ عەبدولکەریم کوڕی عەبدولفەتاح هەمەوەندی بەردەوام بوو لە شەڕکردن دژی ئینگلیز بە شێوەی شەڕی (پارتیزانی) و شەڕی (سوارەیی))»[1].

لە دۆکیومەنتی ژمارە No.831-C.O.130-22 ڕۆژی ١٩٢٢/٦/٢٣دا ڕاپۆرتێکی تیادایە کە مەندووبی سامی لەبەغدادەوە ناردوویەتی بۆ وەزیری موستەعمەراتی بەریتانی دەڵێ: (بەپێی تەلەگرافی ژمارە (٤٣٨)ی ڕۆژی ١٩٢٢/٦/١٦، کەریمی فەتاح بەگی سەرۆکی بەگزادەی عەشیرەتی هەمەوەند کەماوەیەکی زۆرە چەمچەماڵ بەهۆی ئەوەوە ناارامەو یەکێک بوو لەوانەی لە ١٩١٩دا سەر بەشێخ مەحموود بوو، لەوساوە هەمیشە لەیاسا لایداوە...)»[2].

مام عەبدوڵلا کوڕی کەریم بەگ کە خۆی لەوکاتەدا لەگەڵ کەریم بەگدا بوو دەیگێڕایەوە، دەیگوت: (شەوێک بەرلەوەی کە لەشکری (فرێزەر) هێرش بکاتە سەر دەربەند شێخ مەحموود داوای لە باوکم کرد، کە بەشێک لە سوارەکانی لەگەڵ خۆیدا بەرێت و بچێت بۆ نزیک قەرەهەنجیر لەکاتی دەست پێکردنی هێرش بۆ سەر دەربەندی بازیان، ئەویش لەلای قەرەهەنجیرەوە شەڕبکات بۆ ئەوەی سەر لەدوژمن بشێوێنێ. لەسەر فەرموودەی شێخ باوکم بەشێک لەهێزەکەی خۆی لەدەربەندی بازیان بەجێ هێشت، بۆئەوەی بتوانرێ بەرگری لەدەربەندەکە بکرێت. خۆی و بەشێک لەهێزەکەی ئەوشەوە لە (دەربەندی بازیان)ەوە کەوتینەڕێ، چووینە گوندەکانی (شۆراوە) و (هەڕاوە) و چەن گوندێکیتر. هەندێ چەکداری عەشایەرمان کۆکردەوە و لەگەڵ خۆماندا بردمان بۆ گوندی (باشبلاخ) نزیک قەرەهەنجیر.

ئەو شەوە لەرێگای کەرکوک لە چەند لایەکەوە تەقە هەبوو. هێزەکەی دوژمن زۆربوو بەدرێژایی جادەی نێوان کەرکوک و چەمچەماڵ مۆڵی خواردبوو. لەبانی

---

١- عبدالمنعم غلامي، ثورتنا في شمال العراق ل١٠٨.
٢- محەمەد رەسووڵ هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، چاپی لەندەن، بەرگی دووەم ل٢٢٣.

مەقان رووبەرووی شەڕێکی گەورەبووین. یەک شەهیدمان داو ئیتر هێزەکەی دوژمن ڕایان کردەوە ناو مۆڵگاکەیان لەسەر جادەی کەرکووک چەمچەماڵ. ئەوشەوە شێخ مەحموود بەپەلە داوای کەریم بەگی کرد کە بگاتەوە دەربەندی بازیان. کار لەوەشدا نەبوو کە ئەو هێزەی دوژمن بگەڕێتەوە دواوە. سەرلەبەیانی گەیشتینەوە دەربەندی بازیان. کەریم بەگ بریندارببوو. ئیتر ئێمەش بەپەلە لەشەڕەکە دوورمان خستەوە. مامۆستا جەمال بابان دەڵێت: (هەروەها کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند و سابیری کوڕی، بەخۆیان و لەشکریانەوە شان بەشانی شێخ مەحموود و لەشکرەکەی دژی ئینگلیز لە شەڕی دەربەندا ساڵی ١٩١٩ جەنگاون).«[١]»

هەروەها مامۆستا ڕەئووف تۆفیق فەتاح دەڵێت: (باسی ئەوەکراوە کە باوکم ناوی تۆفیق فەتاح بوو، لە هەندێک شوێنیشدا ناوی بە تۆفیق ئاغا هاتووە. یەکێک بووە لە سوارە جەنگاوەرە هەرە نزیکەکانی کەریم بەگ وتی: دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکە ئێمە لەبڵاوەکردندا بووین. کاتێکمان زانی لەناو چڕە دەوەنێکەوە تەقەیەک کراو کەریم بەگ لەئەسپەکەی گلاو بەربووە خوارەوە. ئێمە پەلامارمان دا کەریم بەگمان ڕاست کردەوە. یەک دووانێک شانی ئەومان گرت و یەک دووانێکیشمان بەرەو جێگەی تەقەکە چووین. لەناو دەوەنێکدا بینیمان سەربازێکی لیڤی بریندارببوو. تفەنگێکی ئینگلیزی پێ بوو. هەر ئەوفیشەکەی تێدا مابوو کەنای بە کەریم بەگەوە. ئێمەش فیشەکێکی ترمان پێوەناو تفەنگەکەیان هێناو هاتینەوە. بەرەو جێگای پاشەکشێ گەڕاینەوە بۆ گوندی (خەربەندەلوو)ی نێوان ئاغجەلەر و دەربەند. ئەوەی باش بوو گوللەکە سەرشانی کەریم بەگی گرتبوو، سەلامەت بوو، زوو چاک بووەوە)«[٢]».

---

١- جەمال بابان، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١٤ ساڵی ١٩٨٧ ل١١٠ (ئاوڕێک لەمێژووی هەمەوەند).
٢- ڕەئووف تۆفیق هەمەوەندی، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە (٣) ساڵی ١٩٩٨. ل١٩٤-١٩٥ (هەمەوەند لە خەباتی سەختی مێژوودا).

# بەشی پێنجەم

---

## کەریم بەگ و درێژەدان بەشۆڕش
## پاش گرتنی شێخ مەحموود (١٩١٩-١٩٢٢)

# کەریم بەگ و درێژەدانی بەشۆڕش
# پاش گرتنی شێخ مەحموود (١٩١٩-١٩٢٢)

لەدوای کارەساتی دەربەندی بازیان ئینگلیزەکان بۆجاری دووەم سلێمانی داگیردەکەنەوەو هەموو (گیراوەکانیان)*[١]* لە سلێمانی بەرەڵادەکەن. لەناوگیراوەکاندا «کابتن بۆند» حاکمی سیاسی چەمچەماڵ بوو دوای بەربوونی گەڕایەوە شوێنی خۆی.

لەدوای گرتنەوەی شاری سلێمانی هێزێکیان نارده (گوندی داری کەلی) و هێزێکیان نارد بۆ داگیرکردنەوەی هەڵەبجە. ئەگەر چی لەرێگەدا تووشی بەرەنگاریی زۆر هات لەلایەن شۆڕشگێڕە کوردەکانەوە، بەڵام بێ ئەنجام بوو. لە ٢١ی حوزەیرانی ئەو ساڵەدا شاری هەڵەبجەش بۆ جاری دووەم داگیرکرایەوە*[٢]*.

لەگەڵ گەڕانەوەی ئینگلیزەکان، (میجەرسۆن) وەکو حاکمی شار گەڕایەوە

---

١- محەمەد ساڵح ئیبراهیم محەمەدی، ئاماژەی بەناوی دیلەکان داوە کە ئەمانەن:-
أ- میجەرکرینهاوس (معاون حاکم سیاسی شاری سلیمانی).
ب- کاپتن دگلاس (معاون سیاسي).
جـ- کاپتن هۆڵت (معاون سیاسي).
د- کاپتن رایت (معاون سیاسي).
هـ- مێجەر دانلیس (فەرماندەی سیاسیی لیڤی).
و- شکوفیل (ساجن مێجەر).
ز- کاپتن بۆند (حاکم سیاسیی چەمچەماڵ) کەریم بەگ بەدیل گرتی لەچەمچەماڵ.
ئەمانەش دیل بوون (چەند ئەفسەرێکیتر و مەئموور لەگەڵ هیندي و عەرەب و ئەفغانی و ئێرانی لەگەڵ هەموو خزمەتکارەکانیان.
ژیناوی زانایانی کورد لەجیهانی ئیسلامەتی یا گەنجینەی فەرهەنگ و زانست.ل٦٩١.
٢- (عەبدولمونعیم غولامی). ل١٠٨.

سلێمانی و کەوتە نێزەی خەڵکی بێتاوان و خۆسەپاندن بەسەر شار. ئەمەش وردە وردە بەرەو نارەزایی زیاتری خەڵک دەچوو. هۆزو سەرەک هۆزەکان چالاکیی سیاسییان لەناودا بڵاوبووەوە لەبەرامبەر زوڵم و زۆرداریی کاربەدەستە ئینگلیزەکان»[1].

لە ۲۳ی حوزەیرانی ۱۹۲۲ز کەمالییەکانیش کە هێشتا بەتەواوی دەوڵەتی ناسیونالیستی تورکیان رانەگەیاندبوو، هێزێکی بچووکیان بەسەرۆکایەتی (ئۆزدەمیر)«[2]» ناردە رەواندز«[3]». کاری (ئۆزدەمیر) زیاتر بڵاوکردنەوەی گیانی دۆستایەتی و خۆشەویستی تورکیا بوو بۆ کورد و سوود وەرگرتن لەو رۆژگارەی لەسەردەمی عوسمانییەکان پێکەوە ژیاون، لەگەڵ هەوڵدان بۆ زیاتر دروست بوونی ناحەز بۆ ئینگلیزەکان. ئەمەش لەکاتی خۆیدا سوودی هەبوو.

دیارە کە کەمالییەکان لەئینگلیزەکان دوژمنترن بەرامبەر مەسەلەی کورد. بەڵێنەکانیشیان هیچی لێ هەڵنەوەراو هەوڵەکانیان زیاتر بۆ ویلایەتی (مووسڵ)و شوێن پێ لەق کردنی ئینگلیزەکان بوو لەناوچەکەدا. بەڵام هۆزە شۆرشگێرو دوژمن بەئینگلیزەکان سوودیان لەوحاڵەتە وەرگرت. بەمەش فشارێکی باش بۆ سەر ئینگلیزەکان هات بۆ ئەوەی بە سیاسەتی خۆیدا بچێتەوەو سیاسەتی زوڵم و زۆرداری بگۆڕی بەدەرفەتدان بە گەڕانەوەی شێخ مەحموود»[4].

---

۱- ئەحمەد خواجە (چیم دی)- بەرگی یەکەم ل۵۸-۵۹.

۲- (ئۆزدەمیر) نازناوی (عەلی شەفیق) بووە لەبنەچەدا لە چەرکەسەکانی میسر بوو. وشەی (ئۆزدەمیر) مانای (پۆڵا) یا (رۆبیتەن) دەگرێتەوە. بەسەرۆکایەتی هێزێکی بچووکی تورک کەلەچەند زابت و دەرمەجەدارێکی تورک و کورد پێکهاتبوو هاتنە رەواندز. بەرنامەی (ئۆزدەمیر) کەناوی (ئۆزدەمیر پاشا)ی لەخۆنابوو زیاتر بریتی بوو لە راپەڕاندنی پیلانی کەمالییەکان کە هاندانی هۆزە کوردەکان بوو لە دژی ئینگلیز لەژێر سێبەری (ئایین) و ئیسلامەتییەوە بۆ خۆش کردنی زەمینە بۆ گەڕاندنەوەی ویلایەتی (مووسل) بۆ تورکیا.

۳- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی دووەم، ل٥٥٤.

٤- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی دووەم، ل٥٥٤ - ٥٥٦.

شێخ مەحموود بەبرینداری بەدیل گیراو دەس بەجێ بەیەخسیری بردیانە شاری بەغدا. لە (مەجلسی عورفیی عەسکەری) دادگایی کرا. لەناکامدا حوکمی (ئیعدام)ی بەسەردادرا. بەڵام (حاکمی مەلیکی عام) حوکمەکەی لە (ئیعدام)ەوە گۆڕی بۆ دە ساڵ بەندی و نەفی کرا بۆ هیندستان. لەسلێمانی و دەوروبەریشی زۆربەی کوردپەروەرەکان ئاوارەو دەربەدەربوون و هەندێکیان گیران و حوکم دران بەسجن یا (غەرامە)ی ماددییان لێ سەندرا.

بەڵام سەیر لەوەدابوو لەکاتی دادگایی کردنی شێخ مەحموود، لە (سلێمانی)یەوە بەناوی شایەت کۆمەڵێک لە پیاوی ناسراویان کۆکردبۆوەو بەزۆری یا بەخواهش لەکاتی موحاکەمەکەدا ئامادەبوون. ئەم ناوانە لەگەڵ (کاپتن بۆند) حاکمی سیاسیی چەمچەماڵ نێررابوونە بەغدا:

١- حاجی مەلا سەعیدی کەرکووکی.

٢- عیزەت بەگی وەسمان پاشای جاف.

٣-شێخ (نەجیب)ی (قەرەداغ).

٤- عەونی ئەفەندی یوزباشی کوڕی (حاجی کووروون).

٥- حەمەد بەگی قادر پاشا.

٦- حاجی ئاغای حەسەن ئاغا.

٧- (میرزا فەرەج)ی حاجی شەریف.

شێخ مەحموود وێرای ئەو هەموو کارەساتانە وورەی بەرنەدابوو و نەپەشۆکابوو. برینداری و بەدیل گیران و (دیوانی عورفی)ی شڵەژاندبوو. بەوێنەی (پڵنگ)ێکی ناوقەفەس لەهەڵمەت بردن و چەپۆک داهێنان ئەگەڕا»[1].

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی یەکەم، ل١٦٧- ١٦٩.

# هەمەوەند لەشۆڕشێکی نوێدا

سەرەڕای باری توندوتیژی لەناوچەکەدا و گەڕانەوەی (بۆند) بۆ چەمچەماڵ و (میجەرسۆن) بۆ سلێمانی«[1]» و پیادەکردنی سیاسەتی تۆقاندن و هەڵخەڵەتاندنی سەرەک هۆزو پیاوی دەروون بەزیو، کەریم بەگ چەکی شۆڕشگێڕیی دانەناو سەری بۆ دوژمن دانەنەواندو بەعەفووی ئەوان هەڵنەخەڵەتاو شاخ و دۆڵەکانی بازیان و چەمچەماڵ و قەرەداغ و سەنگاوی کردە لانەی ڕووبەڕووبوونەوە و ترساندنی ئینگلیزەکان و هاندانی هێزی عەشایەری ناوچەکە بۆ بەرەنگاری و شۆڕش. هەروەها ڕۆژ بەڕۆژ سوورتر بووە لەسەر داوای مافی ڕەوای نەتەوەکەی، مامۆستا عەبدولمونعیم غولامی دەڵێ (بەلام عەبدولکەریمی کوڕی عەبدولفەتاح هەمەوەندی لە شەڕکردن دژی ئینگلیز بەردەوام بوو - ئەویش لە شێوەی شەڕی پارتیزانی و سوارچاکی - لە دووری چل کیلۆمەتر لە «دەربەندی بازیانەوە»)«[2]».

کەریم بەگ لەدوای شەڕی (دەربەندی بازیان)یش کۆڵی نەداوەو سەنگەری پاراستنی وڵاتەکەی و دوژمنکاری هێزی داگیرکەری چۆڵ نەکردووە. هەر بەپارتی زانی لەناوچەکەدا ماوەتەوەو خەریکی شۆڕش بووە لە دژی ئینگلیزەکان.

کەریم بەگ هەمیشە ڕێگەی (بازیان- چەمچەماڵ)ی کردبووە مەڵبەندی شەڕ و نواندنی پاڵەوانیەتی لەدژی ناحەزان و دوژمنان.

دوابەدوای شەڕی دەربەندی بازیان حکوومەتی بەریتانیا هێزێکی (٢٠٠) دووسەد کەسیی لەدەربەندەکە دانا بەمەبەستی پاراستنی ئەودەڤەرە

١- ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی یەکەم، ل٥٨-٥٩.
٢- (عبدالمنعم غلامی)، ل١٠٨.

بەسەرۆکایەتیی (کاپتن لاین)ی ئوستراڵی و جێگرەکەی کەناوی نەقیب وینکل (کاپتن وینکل)ی ئینگلیزو (سەید رەشید داود) کە (کاتبی) ئەو بنکەیەبوو.

کەریم بەگ و سوارەکانی شەوی یەکەم پەلەنگئاسا پەلاماری ئەو هێزە ئەدەن و چەند سەربازێکی لێ دەکوژن و بریندار دەکەن و چەند مۆڵگایەکیان تێکوپێک دەدەن. هەموو ئەو هێزە لەیەک مۆڵگادا کۆدەبنەوە.

بۆ شەوی دووەم کەریم بەگ فەرمانیدا بە چەن سوارێکی ئاگریان بەردایە هەرچی پووش و درک و داڵی چواردەوری بنکەکەی دوژمن و دەست کرا بە تەقەو هێرش کردن بۆ سەر بنکەکانیان.

هێزە ئابلـوقـە دراوەکـەی دوژمن شـپـرزەدەبن. (کـاپتن لاین) بەبێتەل (لاسلکی) پەیوەندی بە(مـێـجـەر بومی)یەوە لە کـەرکـووک دەکـات و داوای هاوکاریی لێ دەکات کەفریای کەون.

پاش ئەم پەیوەندییە بەچەند کات ژمێرێک شەش فرۆکەی جەنگی دەگاتە سەر دەربەندەکە و بە (ناپاڵم) فرێدان و بە بەرگری زۆر توانییان شۆرش گێران دوور بخەنەوەو ئابلـوقەی سەر هێزەکەی (کـاپتن لاین) بکەنەوە. بنکەکەی سووتاو هێزی دوژمن لەوناوچەیە دووركەوتنەوە کـەزۆری نەمـابوو بسـووتێن. (کاپتن لاین) بەهۆی ئاگر و دووکەڵەکەوە بەهیلاکی دەیگەیەننە ئەخۆشخانەو هەر لەهەمان شەودا دەمرێ»[1].

محەمەد رەسوڵ هاوار دەڵێ (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو سابیری کوڕی دوای ئەوەی شێخ مەحموود لە شەڕی دەربەندی بازیاندا گیرا ئەوان خۆیان نەدا بەدەستەوەو چەکیان فرێ نەداو هەمیشە بەرامبەر ئینگلیزەکان شەڕیان ئەکرد)»[2].

هەروەها مامۆستا محەمەد رەسوڵ هاوار دەڵێ (دوای شەڕی شارەزوور لە ناوچەکانی بازیان و چەمچەماڵیش ڕاپەڕین دەستی پێکرد. مەحموود خدر

---

١- (عبدالمنعم غلامی)، ل١٠٨-١٠٩.

٢- م.ر. هاوار، بەرگی یەکەم، ل٢٠١.

هەمەوەند کە لە زەمانی عوسمانییەکاندا فەرماندەی ژاندرمەبوو (لەبەرگی یەکەمدا لەباسی کارەساتەکەی موسڵدا باسی مەحموود خدر هەمەوند کراوە) ئەو مەحموود خدرە لەورۆژانەدا دژی ئینگلیزەکان ڕاوەستاو ڕێگەی سلێمانی و کەرکووکی بڕی.

(مێجەرسۆن) وەکو لاساییکردنەوەی تورکەکان هێزێکی ئێستر سواری لەناو کورددا دامەزراندو ناردنی بۆ شەڕ دژی مەحموود خدرو فەرمانیدا مەحموود خدر و سەید محەمەدی جەباری بگرن. هێزی هەردوولا لەدەربەندی بازیان بەرەنگاری یەک بوون و زیانێکی زۆر لە ئینگلیز کەوت. (کاپتن بۆند) کەکاتی خۆی لە ئەستەمبوڵ ژیابوو، زمانی تورکیی باش دەزانی و لەورۆژانەدا کرابوو بە حاکمی سیاسی لە چەمچەماڵ هەتا بڵێی پیاوێکی چەتوون بوو.

(بۆند) هەوڵیدا مەحموود خدر ببینێت و لەپاش ڕێکەوتن بە مەحموود خدر دەڵێ: مەندووبی سامی بڕیاری داوە لە حەپسکردنت خۆش بێ بەمەرجێک دووهەزار ڕووپیە بدەی لەتۆڵەی ئەو زیانانەی کە بەهۆی تووە لێمان کەوتووە.

مەحموود خدر سویاسی دەکاو دەچێتە ژوورەوە لێفەیەکی شڕی بۆ دەردەهێنێت و بە (کاپتن بۆند) دەڵێ: جەنابی حاکم: ئەم لێفە شڕە بنێرە بۆ لەندەن با لۆکەکەی بکەن بە بانقەنۆتی دە ڕووپیەیی و چەندتان گەرەکە هەڵیگرن و ئەوی تریشی بیدەن بەمن. مەحموود خدر لەو ڕۆژانەدا پیر بووبوو، بەرگەی شەڕی نەدەگرت، بەڵام سەید محەمەدی جەباری کۆڵینەدا هەتا ماوەیەک هەر دژی ئینگلیز بوو)»[1].

بەوجۆرە ئاگری شۆڕش و ڕاپەڕین لەناوچەی (چەمچەماڵ- بازیان) ڕۆژ بەڕۆژ گەشەی دەکردو ناوچەکانی تریشی گرتەوە. ئینگلیزەکان مەترسییەکی زۆریان

---

١- (م.ر. هاوار)- بەرگی دووەم، ل٢١٥-٢١٦.

پەیدا کردبوو لەهاتوچۆی نێوان کەرکووک و سلێمانی، بەهۆی ئەوەی بۆ چەندین جار ئەو ڕێگایە لەلایەن دەستەی سوارەی هەمەوەندەوە قەتع دەکرا.

مامۆستا محەممەد رەسوول هاوار لە کتێبەکەیدا لەبەڵگە نامەیەکی بەریتانی پوختەکراوە و تایبەتە بە بیرەوەرییەکانی (کاپتن بوند) کە بۆ (ویلسن) لە ساڵی ١٩٢٠ نووسیویەتی، دەڵێ: (کەریم بەگ)ی سەرۆکی بەگزادە لە مانگی مایسی ١٩٢٠وە بەرەڵلایە و چەتەیەو ناوبانگی وای کردووە کە بەسەر عەشیرەتەکەیدا زاڵ بێت) هەروەها دەڵێ (بۆ ئەوەی تووشی هەرا نەبین لەگەڵیا وەکو ئەو تووش بوونەی تورکان لەگەڵ هەمەوەندەکانا باشترین شت ئەوەیە هەوڵ بدرێت عەشیرەتی بەگزادە لە کەریم بەگ دوور بخرێتەوەو تەقەلای ئەوە بدرێت عەشیرەتەکەی لەناوخۆیانا نارێک بن و دووبەرەکییان تێ بکەوێ). لەسەر قسەکانی دەڕوا دەڵێ (ئەوسیاسەتەی هەتا شەش مانگ لەمەوبەر بەکارهێنرا داوا لەکەریم بەگ کرا لە گوندەکەی خۆیدا بەبێ دەنگ دانیشێت و نەخۆی و نەهەمەوەندەکانیش دەست نەخەنە کاروباری حکوومەتەوە، بەڵام دوای ئەوە بەهۆی پڕوپاگەندەی تورکخوازەکانەوە لەکەرکووک و ڕەواندز بەڵێنی ئەوەی پێ درابوو بکرێ بە سەرۆکی هەموو هەمەوەند کە ئەمە وای لە کەریم بەگ کرد خزم و کەس و کارو دەست و پەیوەندەکانی بەگوندەکانا بڵاوبکاتەوە کە ئەمە هەتا گوندەکانی ناوچەی سووورداشی گرتەوە)«[1]». «کابتن بۆند» هەوڵی زۆری داوە دووبەرەکی بخاتە نێوان کەریم بەگ و هەمەوەندەوەو کێشەی ناوخۆیی بۆ کەریم بەگ دروست بکات. خۆی گوتەنی «باشترین شت ئەوەیە هەوڵ بدرێ عەشیرەتی بەگزادە لە کەریم بەگ دووربخرێتەوەو تەقەلای ئەوە بدرێ عەشیرەتەکەی لەناوخۆیانا نارێک بن«[2]»....هتد).

---

١- (م.ر. هاوار)- بەرگی دووەم، ل٢٢٧.
٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٧.
دۆکیومەنتی ژمارە C.O 730-22 ی رۆژی ١٩٢٢/٦/٢٣.

دیاره ئەو رق و قینەی (بۆند) لە کەریم بەگ سەرەڕای سیفەتی کەللەڕەقی و چەتوونی و لووت بەرزی و توندو تیژی خۆی کە هەبووە، رقی تایبەتی بووە لە کەریم بەگ، چونکە کاتی خۆی بەدەستی ئەم دیل دەکرێو"[١]" ڕەوانەی سلێمانی دەکرێت. لێرەدا ئێمە چەند لێکۆڵینەوەیەک دەخەینە ڕوو دەربارەی ئەم قسانەی (کاپتن بۆند) کەهەڵبەستراوی خۆیەتی بۆ ناوزڕاندنی کەریم بەگ و تاوانبارکردنی بە پەیوەندی بە تورکخوازەکانەوە.

بەلام ئایا بۆند چ بەڵگەیەکی بەدەستەوەبوو کە (کەریم بەگ) لەگەڵ تورکخوازەکانا ڕێککەوتووەو ئایا تورکەکان بەرامبەر بەوە چییان بۆ کەریم بەگ کردووە. یاخود ئەو تواناو جەماوەرەی کەریم بەگ لەوکاتانەدا ئەگەر دەعمێکی مادی و مەعنەوی هەبوایە شۆڕشەکە گەورەتر نەدەبووەوە؟

کەریم بەگ دەسەلاتی بەسەر هەموو ناوچەی چەمچەماڵ و بازیان هەبوو، ئەمە سەرەڕای ناوچەی سووورداش. لەهەمان کاتدا سەرۆکی تیرەی بەگزادەش بوو و بەسەر عەشیرەتەکەیدا زاڵ بوو، وەک (بۆند) خۆی دەڵێ ئایا سەرەک هۆز وەک ئەم نەبێت دەبێ چ سەرۆک هۆزێ ئەو دەسەلاتەی هەبوبێت. هەروەها (تورک) پاش دووساڵ بەسەر نامەکەی بۆند بۆ ولسن ١٩٢٠ بەنهێنی و لەژێر پەردەی (ئایین) پەروەری (نۆزدەمیر)یان ناردە ڕەواندز. ئەمە خۆی لەخۆیدا لاوازیی تورک دەردەخات. دەبێ کێ لە ١٩٢٠ باوەڕ بە بەڵێنەکانیان بکا کە وەک بۆند دەڵێ (بەڵێنی ئەوەی پێ درابوو بکرێ بەسەرۆکی هەموو هەمەوەند).

---

٣- ثورتنا في شمال العراق عبدالمنعم غلامي ل١٠٠.

# ئەنجومەنی هەڵبژێردراوی سلێمانی
# (مەجلیسی ئیداری) (١٩٢١-١٩٢٢)

لەو کاتەی کە (شێخ مەحموود) لە هیندستان دەس بەسەر بوو، کەریم بەگی هەمەوەندو سوارەکانی ئاگرو بڵێسە بوون لەدژی ئینگلیزەکان. ئینگلیز بەهەموو شێوەیەک هەوڵی سەرکوت کردنی شۆڕشی کوردی دەدا، بۆ ئەم مەبەستە چەند هەنگاوێکی نا وەک ئامادەکردنی هێزی سەربازی و فڕۆکەو گرتن و ئازاردانی شۆڕشگێڕەکان.

بەڵام هەموو ئەمانە دادی نەدا، ڕۆژ بەڕۆژ ئاگری شۆڕش لە گەشەسەندندا بوو. وەک مامۆستا ڕەفیق حلمی دەڵێ: (ئاگری شۆڕشی دووەم دەستی کرد بوو بە پریشکدان و گەشانەوە. لەبەر ئەمە بیر لە دامەزراندنی ئەنجومەنێک کرایەوە لە سنووری هەرێمی سلێمانیدا، کە ببێتە هاندەری حاکمی سیاسی. ئەنجومەنەکە لە (١٢) ئەندام پێکهاتبوو، بەسەرپەرشتیی حاکمی سیاسی بوو، بەڵام ئەنجومەنەکە بەهۆی مانەوەی (مێجەر سۆن) لەسلێمانی نەیتوانی کۆتایی بە ئاژاوە بهێنێت و شۆڕشەکە هەر بەردەوام بوو»[١].

«گۆڵد سمیث» کرا بەحاکمی سلێمانی، هەوڵی‌دا ئەو بێزارییەی لەناو دانیشتوانی شاری سلێمانی و دەوروبەری بەهۆی ڕەفتارەکانی مێجەر (سۆن)ـەوە پەیدابوو بوو نەهێڵێ، تەقەلای ئەوەی دا ڕێگا چارەیەک بدۆزێتەوە دڵی خەڵک رازی بکا. مامۆستا محەممەد ڕەسوڵ هاوار دەڵێ:«[٢] (دەربارەی

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ل٢٠-٢١.
٢- (م.ر. هاوار) بەرگی دووەم، ل٢١٧-٢١٨.

ئەو تەقەلایەی گۆلْد سمیث لە دۆکیومەنتی ژمارە (F.O.٢٠٥٠ 15 ) ڕۆژی ٧/ی دیسەمبری ١٩٢١دا نامەیەکی مەندووبی سامیی تیایە کە لە بەغدادەوە ناردوویەتی بۆ (چەرچل) کە دەڵێ: «ئەنجومەنی هەڵبژێردراوی سلێمانی یەکەم کۆبوونەوەی لە ٢٢ی نۆڤەمبەری ١٩٢١دا کرد، کە ئەندامەکانی بریتی بوون لەمانە (کەوەکو چۆن نووسراوە بڵاوی دەکەینەوە):

١- میجەر گۆلْد سمیث ئەفسەری سیاسی و نوێنەری حکومەتی بەریتانیا

| | |
|---|---|
| ٢- ئەحمەد موختار | قازی |
| ٣- سەدیق مەزهەر | حاکم |
| ٤- ساڵح پاشا | سکرتێری واریدات |
| ٥- حمە ئاغای عەبدولڕەحمان ئاغا | نوێنەری دانیشتوانی سلێمانی |
| ٦- حاجی ئیبراهیم ئاغا | نوێنەری دانیشتوانی سلێمانی |
| ٧- عەبدوڵلا چەلەبی | مەئمووری کۆن بووە ئێستە بازرگانە |
| ٨- حامد بەگ | بەگزادەی جاف - نوێنەری هەڵەبجە |
| ٩-محەمەد ساڵح بەگ | مەلاک و نوێنەری شارباژێڕ |
| ١٠- ئەمین ڕەشید ئاغا«[١]» | سەرۆکی عەشیرەتی هەمەوەندو نوێنەری چەمچەماڵ. |

١- ئەمین ڕەشید ئاغا، یەکێک بووە لە سەرۆکەکانی هۆزی هەمەوەند، کاربەدەستانی ئینگلیز بۆ دژایەتی کردنی (کەریم بەگی فەتاح بەگی) هەمەوەند هەوڵیاندا بەدروست کردنی ناکۆکی و ناحەزی لەنێوانیان بۆ ئەوەی سوود لەو بۆشاییە ببینن هەر بۆیە لە ساڵی ١٩٢٣ ئەدمۆندز لە کتێبی کرد و ترک و عەرەب ل٢٨٧-٢٨٨ دەڵێ: فەرمان مان وەرگرت چەمچەماڵ بگرین و ئیدارەو کاروباری شار بسپێرین بە قائمقام کەوەک (بەریەستی گوللە وابێت) کە ئەویش ئەمین ڕەشید ئاغای ڕەمەوەندە کە سەر بە هەمەوەندەو زۆر رقی لە (کەریم فەتاحە).

رەفـــیق حلمی لەپەراوێزی لاپەڕەکـــانی (٢٠-٢١)ی بەرگی دووهەمی یاداشتەکانیدا ئەو ئەنجومەنەی ناوناوە (مەجلیسی ئیداری)و دەڵێ (بۆ ئەوە پێک هاتبوو کە یارمەتیی حاکمی سیاسی بدا لەراوێژکردن و کاروباردا. بەڵام لە ناوەکـانا کـە باسی کـردوون عـەبدوڵلا چەلەبی بە عـەبدولفـەتاح چەلەبی ناو هێناوەو ناوی (کابتن هۆڵت)ی معاونی حاکمی سیاسیشی لەو ئەنجومەنەدا ناو هێناوە، کە لە دۆکیومەنتەکەدا ناوی نوێنەری رانیە نەهاتووە. بەڵام رەفیق حلمی لەلاپەڕە (٢٢)دا دەڵێ هەمـزەئاغـای ئەولاغـا بەناوی نوێنەری رانیـەوە دانرا (کەدوور نییە چ کابتن هۆڵت و چ هەمزاغا هەردووکیان لەدواییدا خرابنە سەر ئەو ئەنجومەنە)) بەڵام ئەمەش سەری نەگرت.

# کوشتنی
# (کابتن بۆند) و (مێجەر ماکانت)

(کاپتن بۆند)ی دڵڕەق لەسەر کورد و شۆڕشەکەیان لەدوای دەربوونی لەدیلی و پاش شەڕی (دەربەندی بازیان)، (شێخ مەحموود) دەباتە بەردەمی (مەحکەمەی عورفی)ی بەریتانی«[1]» هەتا حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردابدەن. ئەو (بۆند)ە هەمیشە خەریکی ئاژاوە نانەوەبوو لەناوتیرەو هۆزە کوردەکانی دەوروبەری چەمچەماڵ. سیاسەتی دوژمنکارانەو دڵڕەقیتی بەرامبەر کورد بەکاردەهێنا و ناڕەزایی زۆری لەلای خەڵکی ناوچەکە دروست کرد بوو بەتایبەتی پاش ئەوەی فێری زمانی کوردی بوو بوو.

(مێجەر ماکانت)یش کاتی خۆی لە سوپای لیڤی بوو، ماوەیەک بوو لە چەمچەماڵ هاوکاریی (بۆند)ی دەکرد. کوردیی دەزانی. لەکاروباری عەشایەردا شارەزا بوو.

(کەریم بەگ) زۆرکێشەو گرفتی بۆ دروست کراوە لە لایەن کاپتن بۆندەوە. ڕقی کۆن و ئازایەتی و جوامێریی (کەریم بەگ) ململانێی گەیاندە ئەوپەڕی. هەتا کارگەیشتە ڕادەیەک (کەریم بەگ) بڕیاری مەردانەی دا کە (بۆند) لەکۆڵ خەڵکی ناوچەکە بکاتەوەو بیکوژێ.

بەر لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩٢٢ کە (کەریم بەگ) هەردوو حاکمەکەی کوشت دیارە نامەو نامەگۆڕینەوە لە نێوان (بۆند) و (کەریم بەگ)دا هەبووە، هەریەک بەمەبەستێک.

محەمەد ڕەسوڵ هاوار لەکتێبەکەیدا بەڵگەنامەیەکی بەریتانی-ی دەرخستووە کە لە تەلەگرافێکدا لەسەر بارودۆخی ناوچەی چەمچەماڵ و کەریم بەگ بەرزکراوەتەوە. ئەو دەنووسێت (بەپێی تەلەگرافی ژمارە ٤٣٨ ڕۆژی ١٦/٦/

---

١- كوردستان والحركة القومية الكردية جلال طالباني ل٢١٦ طبعة الثانية ١٩٧١.

١٩٢٢ کەریم بەگی فەتاح بەگی سەرۆکی بەگزادەی هەمەوەند کە ماوەیەکی زۆربوو چەمچەماڵ بەهۆی ئەوەوە نائارام بو و یەکێک بوو لەوانەی کە لە ساڵی ١٩١٩ سەر بەشێخ مەحموود بووەو لەوماوەیەدا هەمیشە لەیاسا لای‌داوە. بەڵام ماوەیەکە دەیەوێ ئارام بگرێ و داوای لێ‌خۆش بوون دەکا)"[١].

ئەوەی لەم بەڵگەنامەیە دەردەکەوێ ئەوەیەکە بە درێژایی ماوەی نێوان شەڕی دەربەندی بازیان هەتا ئەو مێژووە، (کەریم بەگ) بەردەوام بووە لە کوشتنی ئینگلیزەکان. سەبارەت بەو نامەیەی کە داوای لێ خۆشبوون دەکات و دەیەوێت ئارام بگرێ، لە کاتێکدا ئەم تەلەگرافە نووسراوە دوو رۆژ پێش کوشتنی (کاپتن بۆند)و (مێجەر ماکانت)بووە و لەو سەروەختەدا شۆڕش بە تەواوی لە ناوچەکانی بارزان و ئاکرێ و زاخۆ و ڕەواندز لە دژی ئینگلیزەکان لە گڵپەدا بووە و هەڵوێستی (کەریم بەگ) لە تەنگژەی رۆژانی دوای شەڕی دەربەندی بازیان ئەو تەنازولەی نەکردووە، ئێستا چۆن بەم شێوەیە داوای لێ خۆش بوون دەکات. بەتایبەتی ئەگەر لە قسەکانی (کەریم بەگ) وردبینەوە لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ (کابتن بۆند) کە چۆن کەڵەپیاوانە دێتە گۆ. ئەمەی هەیە، وای بۆ دەچم، زیاتر هێمن کردنەوەی کاربەدەستانی ئینگلیزبێت لەلایەن (کەریم بەگ)ەوە هەتا زەبرێکی کوشندەیان لێ بدات و هەردوو رۆژ دوای ئەو تەلەگرافە لە ١٨ی حوزەیرانی ئەو ساڵە لەسەر ڕێگەی گوندی مۆرتکەو هەنجیرە (کابتن بوند)و (مێجەر ماکانت) دەکوژێ و تۆڵەی چەند ساڵەی زوڵم و زۆردارییان لێ دەکاتەوە."[٢]

گێڕانەوەی جۆراوجۆر هەیە لەسەر بەیەک گەیشتنی (کەریم بەگ)و ( کابتن بۆند)و کوشتنی (بوند)و (ماکانت). ئەوەی پوختەیەو هەموو گێڕانەوەکان لەسەری یەک دەنگن ئەمەی خوارەوەیە:- ماوەیەک لەپێش ١٨ی حوزەیرانی

١- (م.ر. هاوار)، بەرگی دووەم، ل٢٢٣ .
٢- (م.ر. هاوار)، بەرگی دووەم، ل ٢٢٤.

١٩٢٢ نامە گۆڕینەوە لە نێوان (بۆند)و (کەریم بەگ)دا هەبووە "[١]".

لەلایەن (بۆند)ەوە جەخت کراوەتە سەر داماڵینی چەک و دانیشتنی (کەریم بەگ) بە ئارامی و دەرکردنی لێ بوردنی گشتی بۆ خۆی و هەموو سوارەکانی، هەروەها بەڵێنی ئەوە بە (کەریم بەگ) دەدا کە ناوچەی نێوان تاسلوجەو دەربەندی بازیانی لەسەر تاپۆ بکات"[٢]" بەلای کەریم بەگەوە ئەم بەرەو پیرهاتنە گرنگ نەبووەو ئەو زیاتر ویستوویەتی میللەتەکەی لەژێر دەستی رزگار بێت و گەلەکەی ئازاد بێت و شێخ مەحموود بگەڕێتەوە کوردستان و ئینگلیزەکان لە وڵات دا نەمێنن.

١- تەنانەت لە نامەیەکی مەندووبی سامیی بەغدا کە لە رێگەی حاکمی سامیی چەمچەماڵ بۆ (کەریم بەگ) نێردرا بوو، داوای لێ دەکات خۆی تەسلیم بکاتەوەو هەموو داواکارییەکی بۆ جێ بەجێ دەکات. ئەم نامەیە لەلایەن (فەقێ محەمەدی مۆرتکە)ی مدیری ناحییەی بازیان گەیشتبووە (کەریم بەگ) کە خزمی خۆیەتی.

ئەو نامەیە لەلایەن (ئەحمەد بەگی) باوکم پارێزراوبوو هەتا ساڵ ١٩٧٧ بەهۆی کارەساتی (گوندی باینجان) سووتا.

٢- نووسەر.

## (کاپتن بۆند)

## پێش کوژرانی، (کەریم بەگ) دەبینێت

پاش ئاڵوگۆڕکردنی نامە بۆ گفتوگۆکردن لەنێوان (کەریم بەگ) و (کاپتن بۆند)، مامۆستا محەممەد رەسووڵ هاوار دەربارەی دیاریکردنی شوێنی دیاری کراو بۆ یەکتر بینین نووسیویەتی:

چەند جارێک هەوڵی بینینی ئەفسەری سیاسی داوە، بۆ ئەوە هەتا ئێستا (کاپتن بۆند) کە یارمەتیدەری ئەفسەری سیاسی بوو، هەوڵیدا لە (تەیناڵ)«١» لە ١٦/ی حوزەیراندا یەکتر ببینن، رۆژی ١٧/ی مانگ نامەیەک لە (کەریم بەگ)ەوە دەگات بەدەستی (کاپتن بۆند) کە شەوێک بەرلەوە لە گوندی (هەنجیرد)«٢» بوو، لەو نامەیەدا پرسیاری ئەوەی کردبوو لە کاتێکدا کە ئەو دەیەوێ لەگەڵیانا رێک بکەوێ کەچی ئەوان هێز دەنێرن بۆ ناوچەکە؟.

وەرامی (کاپتن بۆند) نێررایەوە بۆ (کەریم بەگ) کە لە گوندی (کانی مستەفا)«٣» بوو، بەلام (کەریم بەگ) یەکسەر وەلامی نامەکەی بۆندی نەدایەوە بەڵکو نامەیەکی ناردبوو بۆ (فەقێ محەممەدی مۆرتکە) و لەونامەیەدا ئامادەیی خۆی دەربڕیبوو کە لە (کانی مستەفا) (کاپتن بۆند) ببینێت.

(کاپتن بۆند) لەلایەن دۆستەکانییەوە ئاگادارکرا کە ئەو شوێنە بۆکۆبوونەوە باش نییە، بەلام (بۆند) زۆری حەزدەکرد (کەریم بەگ) ببینێت. بۆیە گوێی بەم قسەیە نەداو کاپتن (ماکانت)یشی لەگەڵ خۆیدا برد لەگەڵ دوو سەربازی لیڤیو

---

١- تەیناڵ، گوندێکە دەکەوێتە نێوان دەربەندی بازیان و ملەی تاسلووجە لەسەر جادەی کشتییە.

٢- هەنجیرە، گوندێکە لە (دۆڵی بازیان)ە دەکەوێتە کەناری شاخی هەنجیرەوە ٣ کم لەجادەی کشتی‌یەوە دوورە.

٣- کانی مستەفا، گوندێکە بەشاخ دەربەندی بازیانەوە بەدیوی چەمچەماڵدا .

سی سواری کورد کە مەفرەزەی تایبەتی (کاپتن بۆند) بوون، لەشوێنێک کە دوو میل دووربوو لەو شوێنەی کەریم بەگ دایانابوو، لەوێ یەکتریان بینی "[1]".

ئەوەبوو لەنێوان گوندی مۆرتکەو هەنجیرە لەسەر کانی و ئاوی (سەرمۆرد)"[2]" بەیەک دەگەن و وتوویژی توند دەکەویتە نێوانیان و قسەیان ناگاتە یەک و کەریم بەگ و سابیر بەگی کوڕی و چەکدارەکانیتر هەر لەوێ (کاپتن بۆند) و (مێجەر ماکانت) و (غەفووری خەجێ)ی پیاو ماقوولی (بۆند) کە خەڵکی سلێمانی-ی گەڕەکی دەرگەزێنە- دەکوژن. چەکدارەکانی تریش خۆدەدەن بەدەستەوەو دەگیرێن.

لە پیاوە ئازاکانی هەمەوەند کە لەکوشتنی حاکمەکان لەگەڵ کەریم بەگدا بوون (سابیر بەگ و عەبدوڵلا بەگی کوڕی) و (ئامیق حوسێن ئاغا) و (محەمەد حوسێن ئاغا) و (عابید شەریف) و چەند سوارێکیتر بوون. پاش ئەم ڕووداوە (کەریم بەگ)، (سابیر بەگ) و (حەمە رەشید فەقێ محەمەد) دەنێرێ بۆ بڕینی ئەو هێڵە تەلەفۆنییەی نێوان کەرکووک و سلێمانی:

١- کاپتن بۆند حاکمی سیاسیی چەمچەماڵ بوو.

٢- مێجەر ماکانت سەر لەشکری سوپای لیڤی بوو کە کەریم بەگ لەورۆژەدا هەردووکیانی کوشتن، واتە لە ١٨/ حوزیرانی ١٩٢٢.

---

١- (م.ر. هاوار)، ل٢٢٣-٢٢٤.

٢- (سەرمۆرد) کانی و ئاوێکە، بە شاخی دەربەندی بازیانەوەیە.

# کەریم بەگ پاش کوشتنی کاپتن بۆند

رۆژی (١٨)ی حوزەیران هەواڵی کوشتنی (کاپتن بۆند) و هاوڕێکانی گەیشتە (تەینال)، پاشان ئاگاداری سلێمانی کرایەوە. لەهەمان رۆژدا کۆلۆنێل (مانت) کە ئەفسەرێکی هێزی لیڤی بوو، بەهێزێکی گەورەو بە پاڵپشتی زرێپۆش و چەندین پارچە چەک، توانییان بچنە شوێنی رووداوەکەو لاشەکانیان بهێننەوە.

کوشتنی ئەو (کاپتن)ە ئاگرێکی گورچک بڕ بوو لە دڵی ئینگلیزەکان درا. لە سەرەتادا ویستیان ئەم زیانە قەرەبوو بکەنەوە. دەگێڕنەوە لەدوای کوشتنی ئەو ئینگلیزانە بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە کەوتنە گیانی خەڵکی ناوچەکەو گوندەکان و بەفڕۆکە بۆردومانیان دەکردن. مامۆستا محەمەد رەسوڵ هاوار لە باسێکی دا دەربارەی رۆژی ١٩/حوزێرانی /١٩٢٢ کە بەرێزی لە دۆکیومەنتی ژمارە 730-22.٥.٢ - No.831 رۆژی ١٩٢٢/٦/٢٣ لەراپۆرتێکیدا دەربارەی ئەو رۆژە نووسیویەتی (رۆژی ١٩/ی مانگ شەش فڕۆکە بەسەر سلێمانیدا فڕین و دوانیان بەسەر چەمچەماڵدا فڕین و لە چەمچەماڵ یەکێک لەو دوو فڕۆکەیە کاپتن (هۆڵت)ی معاونی ئەفسەری سیاسیی هەڵگرت.

فڕۆکەکان بەسەر ئەو ناوچانەدا فڕین کە کەریم بەگ و تاقمەکەی لێبوو کە ٣٠-٤٠ کەسێک دەبوون بەڵام هیچ بزووتنەوەو جم و جووڵێک لەوناوچەیە نەبینرا)«[١]».

بەوشێوەیە باری ئارامی ناوچەکە تێکچوو بوو. ژیان بەجارێ لەناوچەی چەمچەماڵ و بازیان بەرەو ئاڵۆزتر دەچوو.

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەربارەی ئەو رۆژانە نوسیوویەتی و دەڵێ: (زۆر

---

١- (م.ر. هاوار)، بەرگی دووەم ل. ٢٢٤

خۆتبوو تا ده رۆژ لەدێهاتەکانی سلێمانی-دا بەفرۆکە بۆیان دەگەڕان. نزیکەی سەد چووغل جاسووسیان بلاوکردەوە کەچی نەیاندەزانی کە چوون بۆ کوێ)"[1].

هەروەها رۆژی ۱۹۲۲/٦/۲۲ لەژمارە ۱۱۳ی رۆژنامەی (پێشکەوتن)دا ئەم هەواڵە لەشاری سلێمانی بلاوکرایەوە.

**(شەخصێک وەیا چەند شەخصێک اگر خبرو اطلاع بدەن او خبرو اطلاعە ببێ بەسەبەبی توقیف و گرتنی کەریم فتاح بگی هموند، لەلایەن حکومەتەوە دە هەزار روپیە انعام وە بخشیشی ئەدرێتێ، دیسان هەروەها اطلاع بدرێت و ببێ بە سبب گرتنی سید محمد جباری بۆ ئەمەش دوو هەزار روپیە انعام و بخشش ئەدرێ)"[2].**

**ئیمزا**

**حاکمی سیاسی گۆلد سمیس**

لەم کاتانەدا ماڵ و منداڵی (کەریم بەگ) و (سابیری کوڕی) لەسەرووی گوندی (باینجان) خۆیان شاردبۆوە.

مام عەزیزی کوڕی کەریم بەگ بۆی گێڕامەوە کە ماڵ و منداڵی کەریم بەگ و (صابیر بەگ) لە گوندی (کۆیەڵە)، شاخێک هەیە بە (کونەقەل) ناسراوە. لەوێ چوونە دەوارەوە. ئەم جێگەیەش پەنایەو شوێنی داڵدەیە، دەکەوێتە نێوان گوندی (کۆیەڵە) و شاخی (قەڵا بەردینە) لەسەرووی گوندی (باینجان). مام عەزیز دەیوت ئەو رۆژە ئاگامان لێبوو، کە چۆن فرۆکەکانی دوژمن دێهاتەکانیان بۆردومان دەکرد و پووش و پاوانی خەڵکیان دەسووتاند و لە دەوروبەری گوندی (مزرتکە) گوندەکانیان دەڕووخاند. بەبەردەوامی چەند تەیارەیەک لە ئاسمانی ناوچەکە دەسوڕانەوە. شەو کەریم بەگی باوکم هات، دەوارمان پێچایەوەو بەرەو

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی یەکەم . ل٨٤.
٢- (م.ر. هاوار)، بەرگی دووەمی کتابەکەی، ل ٢٢٥.

گوندی (تەڕەمار)«[1]» سەرکەوتین. ماڵی کەریم بەگی باوکم و سابیر بەگی برام، لەگەڵ پیرۆزەی«[2]» دایکم و سەکینەی«[3]» باوەژنم و ئەوانیتر کە هەموومان (١٥) تا (٢٠) ژن و منداڵ دەبووین، ئەو ڕۆژە بۆ بەیانی فڕۆکەکان بەردەوام بوون لەبۆردومانکردنی ناوچەکەو چەندەها ژن و منداڵی بێ تاوانیان لەناوچەکەدا کوشت.

(کەریم بەگ) پێی وتین ئێوە لێرە نەمێنن و بچنە ناوچەی (شێخ بزێنی)«[4]» لای ماڵی (ڕەشید ئاغا عەبدولوەهاب ئاغای سەرچنار)«[5]». ئێمە لە (تەڕەمار)ەوە بەرەو (چەمی ڕەزان)«[6]»و لەوێوە بەرەو سەرچناری شێخ بزێنی ڕۆیشتین. خەڵکی گوندەکان زۆر یارمەتییان داین.

لەگوندی (کانی هەنجیر)«[7]» نیشتەجێیان کردین. لەدەرەوەی گوندەکە باخێکی هەنجیر هەبوو ژوورێکیان بەدارو بەرد بۆ دروست کردین و لەوێ ماینەوە. بەوجۆرە ماینەوە هەتا زیاتر لە ساڵێک، ئینجا دوایی چووینە ناوچەی هەورامان و لەگوندی (دزڵی) نیشتەجێ بووین«[8]».

لە دوای کوشتنی حاکمەکان، نەک هەرخێزان و ماڵی (کەریم بەگ) بەتەنها، بەڵکو زۆر لەخزمەکانی و هەندێ لەهەمەوەندەکان کە لەگەڵ کەریم بەگ بوون

---

١- (تەڕەمار) گوندێکە دەکەوێتە سەر زنجیرە شاخی تاسلووجە بەدیوی سوورداشدا دەڕوانێ.

٢- (پیرۆزە) خێزانی کەریم بەگ بووەو خزمی خۆی بووە.

٣- (سەکینە) خێزانی دووەمی کەریم بەگ بووە کە ئەم ژنەی لە (عەشیرەتی شێخ بزێنی) خواستووە.

٤- (ناوچەی شێخ بزێنی): شێخ بزێنی عەشیرەتێکی ناودار و دۆستی خۆشەویستی هۆزی هەمەوەندە، سنووریان دەکەوێتە نێوان چەمچەماڵ و کۆیە.

٥- (ڕەشید ئاغای عەبدولوەهاب ئاغای سەرچنار) یەکێکە لەپیاوە بەناوبانگەکانی شێخ بزێنی.

٦- (چەمی ڕەزان) چەمێکی زۆر سەخت و گەورەیە، بەناوبانگترین چەمە لەو ناوچەیە.

٧- (کانی هەنجیر) گوندێکە لەناوچەی شێخ بزێنی.

٨- ئەم باسە لەزاری مامە عەزیز کوڕی کەریم بەگەوە وەرمان گرتووە.

تووشی ئازارو ئەشکەنجە بوون، بەر چەپۆکی ئینگلیزەکان کەوتن و زۆریان لێ دەربەدەر بوون بۆ شارو ناوچەکانی هەولێرو سلێمانی. هەڕەشەو بڕیاری ئینگلیزەکان لەسەر (کەریم بەگ) و خزمەکانی و ئەوانەی شوێنیان دەزانین یان دالدەیان دەدان توندوتیژ بوو.

کەریم بەگ لەدوای بەرێ کردنی ژن و منداڵەکەی بۆ ناوچەی شێخ بزێنی، بەخۆی و سوارەکانییەوە دەچێت بۆ دیوی چەمچەماڵ بۆ گوندی کانی مستەفا و پاشان دەچێت بۆ گوندی (تاڵەبان)«[1]».

لەکاتی ڕۆژهەڵهاتن شەش فڕۆکەی جەنگی ئینگلیزەکان دەکەونە بۆردومان کردنی ئەم گوندانە کە لەناوچەی هەمەوەندن (کانی سارد، تاڵەبان، کانی مستەفا، قەرەتامۆر، حەمک)«[2]».

د.کەمال مەزهەر دەڵێ: «هەر لە سەرەتاوە ئەڵێم ئەگەر فڕۆکەکانی ئینگلیزو زۆر جار بۆمباباراني بێ وچانیان نەبوایە شێخ مەحموود و لایەنگرانی لەوانە بوو بتوانن بەشی زۆری ئامانجە نەتەوەییەکانی کورد جێ بەجێ بکەن. بۆ روون کردنەوەی ئەم ڕاستییە بایەخدارە دەیان بەڵگەو ڕووداوی هەمەچەشنە بە دەستەوەن کە سەرچاوەکانیان ئینگلیز خۆیانن«[3]».

لەکاتی بۆردومانکردنی گوندی (تاڵەبان) کەریم بەگ لەوێ بوو و لەلایەن فڕۆکەکانی ئینگلیزەوە بینراوە، چونکە زۆر بەگەرمی بۆردومانی ئەم گوندەیان کردووەو بۆتە هۆی شەهید بوونی زۆر کەس لەژن و منداڵ و خەڵکی ئەو ناوچەیە. کەریم بەگیش بەچەکی سووک شەڕی لەگەڵ کردوون، بەڵام بێ ئەنجام بوو. لەدواییدا. (کەریم بەگ) و سوارە کانی دەچن بۆ نێوان جادەی کفری - کەرکووک، لەوێ بۆسەیەک دادەنێن. هێزێکی لیڤی دەکەوێتە ناو بۆسەکەوەو

---

١- (تاڵەبان) گوندێکە لە ناوچەی هەمەوەند دەکەوێتە باکووری چەمچەماڵەوە.
٢- ئەم گوندانە دەکەونە نێوان چەمچەماڵ و کەرکووکەوە، بەلای ڕۆژهەڵاتدا.
٣- د. کمال مەزهەر، گۆڤاری رۆشنبیری، ژمارە (١٣٦) ساڵی. ١٩٩٥.

چواریان لێ دەکوژن»[1] بەم جۆرە ناوچەی کەرکووک و سلێمانی و چەمچەماڵ لە ژێر هێرشی فڕۆکەوە دەبێتە مەیدانی شەڕو ڕووبەڕووبوونەوە. هێزی لیڤی بە پاڵپشتی چەندین تانک و زرێپۆش دەکەونە ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوە. بەڵام دواتر ترس و ناڕەحەتی کەوتە ناو سوپای ئینگلیزەوە، هەتا کار گەیشتە ئەوەی سێر پرسی کۆکس مەندووبی سامی لە بەغدا تەلەگرافێکی لە ١٩٢٢/٧/٥ ناردبوو بۆ (قوستەنتەنییە)و (ئەستەمبۆڵ) و هیندستان و میسر کە بە ڕەسمی دەڵێ: «ناوچەی سلێمانی و کەرکووک لەگەڵ ئەو هەموو هەڕەشەو فشارەی کە هێزی لیڤی خستییە سەر پیاوکوژەکان کە کەریمی فەتاح بەگ و تاقمەکەی لێ بوو، ئەوگوندانەی کەیارمەتییان دابوو هەموو سزادران و هێزی ئاسمانی دەوری خۆی بینی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەریم بەگ پەلاماری هێزێکی بچووکی هێزی لیڤیی دا لەسەر ڕێگەی کفری- کەرکووک کە لەوشەڕەدا چوار لیڤی کوژراو هیچ دەسەڵاتدار و ئاغایەک لەوناوچەیەدا نەبوونە لایەنگری کەریم بەگ. ئەو هێزە تۆپخانەیەی (سیک) کە لە مووسڵەوە نێررابوو لە ٩/ی تەمووزدا گەیشتە کەرکووک»[2].

نیمزا/ پرسی کۆکس

ئەم بەڵگەنامەیە ئەوە دەردەخات کە هەموو ئاغاو پیاو ماقووڵانی ئەو سنوورانە لەلایەن ئینگلیزەوە، لەسەر هاوکاریکردنی کەریم بەگ و هێزەکەی سزادراون. کەریم بەگ و هێزەکەیشی هەوڵی ئەوەیان دەدا کە نەچنە هیچ گوندێک بۆ ئەوەی دانیشتوانەکەی سزا نەدرێن. بەڵگەش بۆ دەرخستنی ڕاستیی ئەم ڕەفتارە لە دۆکیومەنتی ژمارە 23 - 730 C.O ڕۆژی ١٩٢٢/٧/٦ کە

١- (م.ر. هاوار)، ل.٢٢٦
٢- (م.ر. هاوار)، ل٢٢٦ .

مەندووبی سامی (سێر پرسی کۆکس) ناردوویەتی بۆ کاربەدەستانی خۆی لە لەندەن دەردەکەویت. لە برگەی - ٤٧٩دا دەڵێ:

(بەلام ئەوانەی دژی هێنانەوەی شێخ مەحموودن وەکو شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەم بەڵێنی تەواویان داوە کە گوندو ناوچەکانی خۆیان لەژێر کۆنترۆڵی خۆیانا بهێڵنەوەو رێگەی ئەوە نەدەن یارمەتیی (کەریم بەگی) هەمەوەند بدرێ و بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ ئەفسەرە سیاسییەکانی ئێمەدا لەو رووەوە رێککەوتوون)"[1]. هەرچەندە ئەم بارودۆخە ناهەمواربووو تاڕادەیەک بوو بە هۆی دوورکەوتنەوەی کەریم بەگ و هێزەکەی لە کۆڕو کۆمەڵ و پەنابردنی بۆ ناوچە شاخاوییەکانی دەوروبەر و دەیان «سیخوڕ» بەناوی «سوالکردن»و «کڕین و فرۆشتنی» ئاژەڵەوە دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی بارەگاو مەڵبەندەکەی، بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان بهێننە سەریان و ئەو خەلاتە زۆرە تەرخان کراوەکەی ئینگلیز وەربگرن. بەلام کەریم بەگ سووربوو لەسەر ئەوەی بەهەر شێوەیەک بێت پێی ئینگلیزەکان لە کوردستان نەهێڵی. وەک سابیر بەگ باسی دەکرد کەلەوکاتانەدا (کەریم بەگ) هەڕەشەی ناردووە بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز، بەم شێوەیە: (گەر کوردستان و ئەم ناوچەیە بەجێ نەهێڵن چارەنووستان لە بۆند و ماکانت باشتر نابێت)"[2]" ئەمەش بەجارێ ترسی خستە دڵی ئینگلیزەوە، هەر بۆیە لە ١٩٢٢/٧/٦ مەندووبی سامی (سێر پرسی کۆکس) بەڕاپۆرت کاربەدەستانی خۆی لە لەندن ئاگادار دەکاتەوەو دەڵێ: (داوای سەربەخۆیی بۆ کورد لە خوارووی کوردستان-دا لەپەرەسەندندایە کە بێگومان سەرکەوتنەکانی سمکۆ لە ئێراندا ئەو هەستەی



سێر پرسی کۆکس

١- (م.ر. هاوار)، ل٢٣٦.

٢- سابیر بەگ، لە دەس نووسەکانیدا کە هێشتا بلاونەکراونەتەوە بە درێژی باسی لەم بابەتە کردووە.

زۆرتر بەتین کردووە. بۆ ئەو مەبەستە داوای بوونی سەرکردەیەکی کورد دەکەن و بەهیچ جۆرێکیش نایانەوێ بخرێنە سەر عێراق)"[1]. بەرواری نووسینی ئەم راپۆرتە لەکاتی تێپەڕبوونی نزیکەی هەژدە رۆژ بەسەر کوشتنی (کاپتن بۆند) و (مێجەر ماکانت)بووە.

---

١- (م.ر. هاوار)، ل٢٣٥.
دۆکیومەنتی ژمارە 23-730 c.o رۆژی ١٩٢٢/٧/٦.

# کوشتنی کاپتن بۆند و ماکانت دەست وەشاندنێکی گەورە بوو کە لە حکوومەتی بەریتانیا درا

کوژرانی (بۆند) و (ماکانت) دەسەلاتی ئینگلیزەکانی لەناوچەکە خستە لەرزەو وای لێکردن چاو بخشێنن بە هەموو بەرنامەکانیان کە بۆ مانەوەیان لەناوچەکە دایان رشتبوو. ئەم دەست وەشاندنە جوامێرانەیەش گوڕوتینێکی تری دا بەو هەلچوون و نارەزاییەی کە لەزۆربەی ناوچەکانی سلێمانی و شارەزوورو پشدەرو رەواندز و ئاکرێ و زاخۆدا هەبوو. بەمەش شۆڕش لە دژی ئینگلیزەکان فراوانتر بوو. لە هەمان کاتدا تورکەکان هێزێکی بچووکیان بەسەرۆکایەتیی (ئۆزدەمیر) ناردبووە رەواندز، ئەمەش بۆکاتی خۆی زۆر بەسوود بوو. کەریم بەگ دوای ئەوەی چەند رۆژێک لەناوچەکە دەمێنێتەوە خۆی و سەیید محەمەدی جەباری"[1]" لەرێگەی هەریرەوە بە دووسەد سوارەوە دەچنە رەواندز. لەم بارەیەوە مامۆستا رەفیق حلمی دەڵێ: «چوونی (کەریم بەگ) بۆلای (ئۆزدەمیر) ئەمە بوو بەهۆی پەرەسەندنی دەسەلاتی (ئۆزدەمیر) و زیادبوونی ئاژاوە لە کوردستان»"[2]". لەراستیدا مامۆستا رەفیق حلمی لەوە راست دەکات کەدەسەلاتی (ئۆزدەمیر) و سام و هەیبەتی زیادی کرد. چونکە مەفرەزەیەکی تورک - کە زۆر لە نووسەرو مێژوونووسان بە مەفرەزەی ناودەبەن - بە سەرۆکایەتی (ئۆزدەمیر) کە هیچی لەدەست نەدەهات بەچوونی کەریم بەگ دەسەلاتی زیادی کرد. بەلام ئەمە وەکو شمشێر وایە، بەهەردوولا دەبڕێ. لەوەدا

---

١- سێ برای کاکە عەبدوللا ئاغای بەگزادەش لەگەڵ کەریم بەگدا چوون بۆ رەواندز. هەروەها فەقێ محەمەدی مورتکە سەرۆکی رەشاوەند ئەویش بەهۆی کوشتنی (بۆند)ەوە کەلەنزیک گوندەکەی ئەو رووی‌دا ئەویش لەگەڵ کەریم بەگ چوو بۆ رەواندز.
٢- (رەفیق حلمی. یاداشت)بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ل٢٦.

دەسەڵاتی زیادی کرد و لەگەڵ ئەو گەلە کۆمەڵییەی شەڕی دەربەندی رانیەیان کرد و سەرکەوتن، بەڵام ئەگەر مەبەست دانەپاڵ و چوونی رەواندز پەیوەندی لە پێشینەی کەریم بەگ و تۆزدەمیرەوە هەبێت ئەوە شتێوانەبووە. ئەمە سەرەڕای تێبینی لەسەر وشەی ئاژاوە، چونکە شۆڕش لە دژی ئینگلیزا پەرەی سەند، نەک ئاژاوە زیادی کرد.

رەواندز ببووە مەڵبەندی شۆڕش و ناڕەزایی، بۆیە (کەریم بەگ) رووی تێکرد. ئەگینا (ئۆزدەمیر) هێزێکی ئەوتۆی لەگەڵ نەبوو پارێزگاری لە خۆشی بکا، کەریم بەگ پشتی بەبەرهەڵستکارانی ئینگلیز دەبەست لەو ناوچەیەدا.

لەلایەکی ترەوە حکومەتی ئینگلیز پارەیەکی زۆریان تەرخان کرد بوو بۆ دۆزینەوەو کوشتنی (کەریم بەگ)، لەو کاتەی کە هەواڵی ئەم دەست وەشاندنەی لە ئینگلیزەکان گەیشتە مەجلیسی عموومی بەریتانی. مامۆستا محەمەد رەسوڵ هاوار نووسیویەتی (لەو رۆژانەدا کە هەواڵی بزووتنەوەی کورد دژی بریتانیا پەرەی سەندبوو، لە پەرلەمانی بەریتانیا باسی کوشتنی (بۆند و ماکانت) کراوە.



مستەر چەرچل

لە ژمارەی (١١٧)ی رۆژنامەی پێشکەوتن رۆژی ١٩٢٢/٧/٢٠دا ئەم هەواڵە بڵاوکراوەتەوە لەورووەوە کە نووسراوە: لەندەن ٥ی تەمووز (لە مەجلیسی عموومی بەریتانیادا مستەر چەرچل"[1] جوابی ئەو پرسیارەی دایەوە کە

١- (م.ر. هاوار) ل٢٢٥-٢٢٦ رۆژنامەی پێشکەوتن. ژ (١١٧) ٢٠ تەمووز ١٩٢٢.

لەمەجلیسی عوامدا لێیان کردو وتی: هیچ زانیارییەکی تری دەست نەکەوتووە دەربارەی کوشتنی (بۆند و ماکانت) لەلایەن کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەندەوە کە لـــــــە ۱۹۲۲/٦/۱۸ کـــــوژرابوون. لەم ڕووەوە مـــوخـــابەرە هەیە لەگـــەڵ مەندووبی سامی بەریتانی لە عـــــێـــــراق بۆ ئەوەی بەیارمەتیی هێزی ئاسمانی سزای تاوانبارەکان بدرێ و لەکـــۆتایی ئەو باســـەدا چەرچڵ دەڵێ: کـــوردەکـــان ئیتاعەتی مەلیک فەیسەڵ ناکەن. بەڵام ئەگەر پەیمانی ئاشتبوونەوە لەگەڵ تورکدا مـۆربکرێ ئومێد وایە کـە تەرتیـــبـــاتێکی وابکرێ کوردو عەرەب یەک بگرن و لەگـەڵ مـەلیـک فـەیسـەڵدا بەرەزامـــەندیی هەردوولا ڕێک بکەون).

بەو جۆرە کـەریم بەگ و ســوارە ئازاکـانی لەژێر ئەم گـــوشـــارە گـــەورەیەدا لە

پیشکوتن

ناوچەکە مانەوە. ڕۆژێک لە بازیان و ڕۆژێک چیای سورداش و لەدەورووبەری چەمچەماڵ و کفری. شاخ نەما، گوند نەما، درەخت لە چیاکان نەما بەر بۆردومانی فڕۆکە نەکەوێ. بۆ دواجار کەریم بەگ و سوارەکانی بەرەو ڕەواندز دەچن. فڕۆکەو هێزی لیڤی بەدوایاندا دەگەڕان و بەشوێنیانەوە بوون. دەربارەی ئەم ڕووداوە مامۆستا محەمەد رەسوڵ هاوار ئاماژەی بە ڕاپۆرتێکی ئەوکاتە داوە، کە نووسراوە (هەواڵ گەیشت کە کەریم بەگ ڕووی کردۆتە ناوچەی سووڕداش و بەرەو دەربەندی زاب دەڕوا. فڕۆکە بەسەریەوە دوای کەوت و شەش گوندی ئەو ناوچەیە بۆردومان کرا. هەندێ هەواڵیتر وادەگەیەنێت کە کەریم بەگ لە ناوچەی دوکانەوە لەناوی زێ پەڕیوەتەوە. هێزی لیڤیش لەزێ پەڕییەوە بۆ ناوچەی ڕانیە، بەڵام هەندێ هەواڵی تریش وادەگەیەنن هێشتا هەر لەناوچەکانی خوارووی سلێمانیدایە. هەواڵێکی تریش دەڵێ کەریم بەگ لەگوندەکانی شێخ مەحموود- دایە. کۆلۆنێل (ماینت) لای وایە سەیید محەمەدی جەباری وەکو پەناهەندێک لای شێخ عەبدولکەریی قادر کەرەمە لە (قەڵای میکائیل)، بەڵام شێخ عەبدولقادر ئەو هەواڵەی بەدرۆ خستەوە)«[1]».

بەم جۆرە لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئینگلیزەوە جەخت کراوەتە سەر سوپاکەیان کە بەهەر شێوەیەک بێت کەریم بەگ لەناوبەرن. بەڵام کەریم بەگی هەمەوەند سەرکردەیەکی خۆشەویست بووە و خاوەن جەماوەرێکی زۆر بووە لە کوردستاندا. چونکە هەتا (کەریم بەگ) دەگاتە ڕەواندز هیچ کەسێک بەتەواوی نەیانزانیوە کە چۆن ڕۆیشتووە. سەرەڕای ئەوەی حکومەتی بەریتانیا چەندین جاسووسیان هەبووە لەو ناوچانەدا.

---

١- (م.ر. هاوار)، ل٢٢٩.
لەدۆکیومەنتی ژمارە، 22-730 c.o ڕۆژی ١٩٢٢/٦/٢٣.

پاش گەیشتنی (کەریم بەگ) بۆ ڕەواندز هەواڵ و ڕاپۆرتەکان بۆحکوومەتی ئینگلیز روونیان کردەوە، کە کەریم بەگی هەمەوەند لەگەڵ سوارەکانی چوونەتە ڕەواندز.

هەروەها ئەدمۆندز لەکتێبەکەیدا دەڵێ (کەریم بەگی فەتاح بەگ)ی هەمەوەند کە کاپتن (بۆندو ماکانت)ی کوشت لە (٢٣)ی تەمووزدا لە نزیک دوکانەوە لەزێ پەڕیوەتەوە "[١]).

هەروەها مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ (لەدێهاتی سلێمانیدا بەفڕۆکە بۆیان ئەگەڕان و نزیکەی سەد چووغل جاسووسیان بڵاوکردبۆوە. کەچی نەیان ئەزانی کە بۆ ڕەواندز چوون)"[٢].

کەریم بەگ لە نزیک گوندی کانی هەنجیر لەزێی بچووک دەپەڕێتەوەو دەچێتە گوندی گۆمەشین.

کاک (نەجمەددین عومەر فەقێ عەلی) کە لە ژیاندا ماوەو دانیشتووی گوندی گۆمەشینە لەزاری کاک (قادر عەلی نادر) خەڵکی (گۆمەشین)کە پیاوێکی بەتەمەن و لەژیان دا ماوەو ئێستا لە (گۆمەشین)ە دەڵێ: لە ساڵەکانی ١٩٢٢ (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند) و سوارەکانی هاتوونەتەوە ناوچەکەمان، چەند ڕۆژێک لە ئەشکەوتێ نزیک بە (قەلادگە)ی سەربە (گۆمەشین)خۆی و سوارەکانی ماوەتەوە. لەو کاتەوە هەتا ئێستا ئەو ئەشکەوتە بە(ئەشکەوتی کەریم بەگ) ناسراوە.

هەروەها دەڵێ: ڕۆژێک سەر لەبەیانی فڕۆکەی ئینگلیز دێتە سەریان، لە ئەنجامدا فڕۆکەیەک لە گۆمەشین دەخەنە خوارەوە.

کوشتنی کاپتن (بۆند و ماکانت) سەری بۆ پیاچوونەوە بەمەسەلەی پەیوەندی

---

١- ئەدموندز، (ک . ت . ع)، ل٢٢٧.

٢- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی یەکەم، ل٨٤- ٨٥.

نێوان ئینگلیز لەگەڵ تورک و بەهێزکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی و خۆدوورگرتنی بەریتانیا لەشەڕی راستەوخۆ لەگەڵ کورددا کێشایەوە، بەتایبەتیش بە چوونی (کەریم بەگ) بۆ رەواندز شۆڕش گەشەی کرد. هەر ئەم هەڵوێستە جوامێرانەی (کەریم بەگ) و پشدەرییەکان بوو وای لە ئینگلیزەکان کرد رێگە خۆش بکەن بۆ بەجێ هێشتنی سلێمانی و سپاردنی ئیدارەی شار بە ئەنجومەنێکی میللی»[1].

ئەدمۆندز دەڵێ: (سەرکوت کردنی ئەم پیلانانە کارێکی گران نەبوو»[2]، بەڵام کوشتنی «بۆندو ماکانت» لە ۱۸ی حوزەیراندا شکستییەکی توند بوو بۆمان و کاریگەرییەکی تەواوی هەبوو لە دڵ و دەروونی دانیشتواندا و بوو بە هۆی ئەوەی ترسیان بشکێ و چاویان بکرێتەوە، کە ئەمەش هۆکارێکی نوێیەو لە بەرژەوەندیان نییەو هەڵوێستەکەی ئاڵۆزتر کردووە، بۆیە لە ۲۰ی مانگدا ئەم بروسکەیەم نارد: «لەبەر ئەوەی تائێستا نازانین بارودۆخی چەمچەماڵ چۆنەو جموجوڵیش لە رەواندز هەیە- کە زانیاریی تەواومان لە بارەیەوە نییە- سەربازەکانمان چالاکییان لە پشدەر زیادکردووەو دووریش نییە بارودۆخی ئەم ناوچەیە بەهۆی رووداوەکانی ئەم دواییەوە ئاڵۆزتربێت (لەو بروسکەیەدا چەند پێشنیارێکی کردووە لەگەڵ داواکردنی پارەی زیاتر)»[3].

---

۱- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی دووەم، ل ٥٠٤-٥٠٦.

۲- مەبەستی لەڕاپەڕینی پشدەرییەکانە کە لەناوچەی قەڵادزێ سەری هەڵدابوو.

۳- کوردو تورک و عەرەب، ل۲۲٤.

# ڕۆڵی کەریم بەگ
# لە شەڕی دەربەندی ڕانیەدا

ئینگلیزەکان بەسوپای لیڤی کەپێکهاتبوو لە هیندو ئەفغان و سیک و نەتەوە جیاجیایەکانیتر، دەیویست کوردستان کۆنترۆل بکات. بۆ ئەو مەبەستەش هێزێکی (لیڤی) ناردبووە دەربەندی ڕانیە. بەشێک لەپشدەرییەکان بەسەرۆکایەتیی (بابەکر ئاغا) لایەنگری ئینگلیزەکان بوون. ئەوانیتر بەسەرۆکایەتیی (عەباسی مەحموود ئاغا) و (غەفوور خانی ناودەشت) ناحەزی ئینگلیز بوون هێزی عەشایەری ناوچەی پشدەر و بیتوێن بەسەرۆکایەتی (عەباسی مەحموود ئاغا) و (غەفوور خان) لە لایەکەوەو (کەریم بەگ) و سوارەی هەمەوەند لەلایەکی ترەوە، بەرەو هێزی دوژمن لە دەربەندی ڕانیە لە ۱۹۲۲/۸/۲۳دا هێرشیان بردە سەر ئینگلیزەکان. مامۆستا ڕەفیق حلمی لەباسی شەڕی ڕانیە دەڵێ: (عەشایەرو ئەهالیی (ڕانیە) و (پشدەر) داوای ئەوەیان ئەکرد کە هەڵکوتنە سەر لەشکرەکانی ئینگلیز لە (دەربەند). هەر لەم ڕۆژانەدا (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند) و (سەیید محەمەدی جەباری) و (فەقێ محەمەدی هەمەوەند)یش بەدووسەد سوارێکەوە گەیشتە لای ئۆزدەمیر لەرەواندز. (پشدەری)یەکانیش بە ناوی خۆیانەوە، بۆ ئەم مەبەستە (بۆهەڵکوتان بۆ سەر دەربەند) ئەحمەد ئاغایان ناردبوو. ئەمانە هەمووی بوونە هۆی ئەوەی کە ئۆزدەمیر بتوانێ و بڕیاری شەڕی دەربەند بدا. ئەمەش لە دوو قۆڵەوە، واتا لە (شاور)ەوە بۆ سەر (ڕانیە)و لە (ناودەشت)ەوە بۆ سەر (شەهیدان) حەرەکەت کرا. هەمەوەندەکان لەگەڵ قۆڵی (ڕانیە)دا بوون.

ئینگلیزەکان هەچ هێزێکیان هەبوو (دەربەند)یان پێ ئُرتبوو. لەبەر ئەمە هێزەکانی کورد بەئاسانی لەهەردوو قۆڵەکەوە پێشکەوتن و (ڕانیە)و

(شەهیدان)یان گرت. ئینجا کەریم بەگی فەتاح بەگ بەخۆی و سوارەی هەمەوەندەوە لە رانیەوەو بەسەر (بیتوێن)دا رووی کردە بازیان و گەیشتە دەوروپشتی (سلێمانی). ئیتر راپەرین هەموو کوردستانی گرتبووەوە)«[1]».

هەواڵی شۆرش و سەرکەوتنی گەورەی شۆرشگێران کەبەدەستیان هێنا لەشەری (دەربەندی رانیە) لەهەموو کوردستان بڵاوبووەوە زۆربەی رۆژنامە جیهانییەکانی ئەو سەردەمە ئاماژەی پێداوەو باسی ئەو راپەرینە مەزنەیان کردووە لەمانگی ئابی/۱۹۲۲«[2]».

د. کەمال مەزهەر دەڵێ: (راپەرینی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو کوشتنی کاپتن بۆند و کاپتن ماکانت لەلایەن شۆرشگێرانی هەمەوەندەوەو گەلێک باسی بایەخداری تری وەک ئەوان دەخوێنییەوە. هەمان راپۆرت (مەبەستی د.کەمال لە راپۆرتی نێوان نیسانی ۱۹۲۲ هەتا مارتی ۱۹۲۳ کە ئینگلیز داویانەتە کۆمەڵەی گەلان)، بەدرێژی باسی ئەوەی کردووە چۆن لەژێر فشاری شۆرشگێران و نارەزایی جەماوەردا ئینگلیزەکان ناچاربوون رۆژی (٥)ی

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی دووەم، جزمی شەشەم، ل٥٥٦-٥٥٧.
هەروەها مامۆستا رەفیق حلمی لەهەمان بەرگدا ل٥٦٢ باسی ئەم شەرەی کردووەو دەڵێ [وەکی تر ئینگلیزەکانیش لەهەموو لایێکا لەشکستابوون بەرامبەر (کەریم بەگی فەتاح بەگ) و چەن سوارێکی، لەبازیان و (سەنگاو) و لەناوچەی (قەرەداغ). بەرامبەر بەشێکی (پشدەری)یەکان و هاوپەیمانەکانیان لە (دەربەندی رانیە) شکابوون و کشابوونەوە کۆیێ، سلێمانییان بەپەلە پەل بەفرۆکە بەجێ هێشتبوو].
٢- (رۆژنامەی الراصد)… بیروت- ژمارە ٣٧٦٦ رۆژی ٢٤-اب-١٩٢٢دا مامۆستا (تۆفیق وەهبی) لەژێر ناونیشانی وتارێکدا بەناوی [بیان من زعیم الاکراد الکولونیل توفیق وهبی بك نزیل بیروت الی الراصد القضیة الکردیة في عصبة الامم] لە برگە (ب)دا دەڵێت: لە ساڵی ١٩٢٢دا، لە کاتی حکومەتی عیراقیدا، کوردەکان بە رووی ئینگلیزدا راپەرین و داوای مافەکانی خۆیان کردو ئینگلیزیان ناچار کرد لە «دەربەندی بازیان» پاشەکشە بکات و لە سەرەتای ئەیلوول حاکمە سیاسییەکان فەرمانرەواکانیان لە شاری سلێمانی بە فرۆکە گەراندەوە، ئەمەش لە ئەنجامی دامەزرانی ئۆتۆنۆمیی کوردی لە سلێمانی.

ئەیلوولی ساڵی (١٩٢٢) شاری سلێمانی و هەموو ئەو ناوچەو مەڵبەندانە بەجێ بهێڵن کە کەوتوونەتە باکووری هەولێر- کەرکووک- کفرییەوە، ئینگلیزەکان ئەو رۆژە (٦٧) کاربەدەستی خۆیانیان لەسلێمانییەوە بەفڕۆکە گواستەوە کەرکوک و، بەڕێوەبردنی کاروباری شاریان سپاردە ئەو ئەنجومەنەی بەر لەماوەیەک نوێنەرانی دانیشتوانی شار هەڵیانبژاردبوو)«[1]» .

هەروەها مامۆستا رەفیق حلمی دەربارەی رۆڵی کەریم بەگی هەمەوەند لە هەڵگیرساندنی ئاگری شۆڕش لەوماوەیەدا دەڵێ«[2]» («کەریم بەگ» کەبەینێ بوو هێزەکانی ئینگلیز بە شوێنییەوە بوون (بۆند) و (ماکانت)ی کوشت، ناچارما خۆی گەیاندە ئۆزدەمیر. ئیتر ئاژاوە بەتەواوی کەوتبووە کوردستانەوە).

مامۆستا ئەحمەد تەقی دەربارەی ئەو ماوەیە دەڵێ«[3]»( ئیتر ئینگلیزەکان تەواو شپرزە بوون و لەهیچ لایەکەوە ڕێگایان نەما. ناچار بەپەرێشانی خۆیان گەیاندە (بیتوێن) و هەموو چەک و جبەخانەیان بەجێ هێشت و لەژێر پارێزگاری فڕۆکەدا بە هەزار شەرمەشەق خۆیان گەیاندە (سەرخومە)و چوونە کۆیەوە، بۆسبەینێ ئەویشیان بەجێ هێشت، پاش ئەمە هێزی ئینگلیز سلێمانیشی چۆڵ کرد.

هەر لەم کاتەشدا بوو کە ئیعلانی گەڕاندنەوەی شێخ مەحمودیان بۆ سلێمانی کرد) ئەم ڕاپەڕینە ئینگلیزی ناچارکرد، کە شاری سلێمانی و کۆیە و کفری چۆڵ بکەن و بکشێنەوە.

ئیش و کاری شاریان سپاردە (ئەنجومەنی میللی) کە شێخ قادری حەفید سەرۆکایەتیی دەکرد. کەریم بەگ هەر لەدوای شکاندنی ئینگلیزەکان لەرانیە یەکسەر گەڕایەوە ناوچەی سلێمانی و بەخۆی و سوارەکانی ناوچەکەیان کۆنترۆل کرد.

---

١- د. کمال مەزهەر، ج.ل.م، گەلی کورد، بەرگی یەکەم، ل. ١١٩
٢- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی دووەم، جزمی پێنجەم، ل٦٧.
٣- احمد تقی،یاداشتەکان، ل٦٤-. ٦٥

(مستەفا پاشا یامولکی)، هەروەکو مامۆستا رفیق حلمی دەڵێ[1] (لە ئەستەمبوڵ گەڕابۆوە، بەینێ بوو لە سلێمانی بوو، وەکو ئەیوت لەلایەکەوە بۆ بەربەست دانەوەی پروپاگەندەی تورک و پاراستنی سلێمانی لە هەڵمەتی (ئۆزدەمیر)، لەلایەکیشەوە بۆ تازەکردنەوەی گیانی نیشتمانی و هۆشی میللی بەکورد...).

لەراستیدا مستەفا پاشا ویستی کۆمەڵێکی کوردی دابمەزرێنێ بەناوی (کۆمەڵەی کوردستان) و خۆی بکاتە خاوەنی هەست و نەستی نەتەوەیی و نیشتمانی. بۆ ئەومەبەستەش ماوەیەک لاوە خوێن گەرمەکان و رۆشەنبیرەکانی سلێمانی لە دەوری کۆمەڵەکەی کۆکردەوە. هەر دوابەدوای دامەزراندنی کۆمەڵەکە لە ٢٢ تەمووز/١٩٢٢دا بڕیاری دەرکردنی رۆژنامەیەکیدا بەناوی (بانگی کوردستان). هەروەکو لەیاداشتەکانی مامۆستا رەفیق حلمی خۆیدا بەدەردەکەوێت کە ئەویش یەکێک بووە لەسەرکردە بەرزەکانی ئەو کۆمەڵەیە. دوایی دەرکەوتووە کە (مستەفا پاشا) سەر بە ئینگلیزەکان بووەو[2] ئەم هەوڵەی ئینگلیزەکان زیاتر بۆ دروست کردنی لەمپەرێک بووە لەبەرامبەر گیانی نیشتمان پەروەری و هێرشەکانی کەریم بەگ.

مامۆستا رەفیق حلمی لەبابەتێکدا لەژێر ناوونیشانی «گفتوگۆی نهێنی دوای نیوەشەو لەتەک (شێخ مەحموود) و (سمکۆ)دا[3] روونی کردۆتەوە کە مستەفا پاشا لەوکاتانەدا سەر بە ئینگلیزەکان بووەو (شێخ مەحموود)یش ئاگاداری ئەو کارەبووە».

رەمزی قەزاز لەبارەی شکستی ئینگلیزەکان لەدوای دەربەندی رانیە دەنووسێ(.... ئینگلیزەکان لەهەموو لایەکا لەشکستابوون بەرامبەر (کەریم بەگی فەتاح بەگ) و چەند سوارەیەکی لە بازیان و لەسەنگاو و لەناوچەی

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی دووەم، جزمی پێنجەم، ل، ٦٩.
٢- بڕوانە م.ر هاوار بەرگی دووەم بەشی دووەم ل٤٩٢.
٣- (رەفیق حلمی، یاداشت) بەرگی دووەم، جزمی پێنجەم ل٩٧.

قەرەداغ، هەروەها بەرامبەر بەشێک لە پشدەرییەکان و هاوپەیمانەکانیان لە دەربەندی (رانیە) کە شکابوون و رایان کردبوو....)»[١].

کەریم بەگ لەگەڵ گەڕانەوەی بۆ سلێمانی و لەکاتی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی میللیدا کە (مستەفا پاشا) لەوێ دەبێت لەناو کۆبوونەوەکە (مستەفا پاشا) دەگرێت و لەسەرا لە گرتووخانە توندی دەکات، لەسەر ئەو بنەمایەی کەسەر بە ئینگلیزەکانە. بەڵام دوایی لەسەر داوای خەڵکی شارەکە ئازادی دەکات، درێژەی بەسەرهاتی ئەم گرتنە لەژمارەی (٦)ی رۆژی ١٨ ئەیلوولی ١٩٢٢ی بانگی کوردستان بڵاوکراوەتەوە»[٢].

هەندێک ئەمە بەفیتی تورکان تێدەگەن، کەلەراستیدا کەریم بەگ بەفیتی هیچ لایەک ئەمەی نەکردووە و زیاتر دوژمنی ئینگلیزی داگیرکەری وڵاتەکەی بووەو هەرکەسێک گومانی بخستایە سەر کە سەر بەئینگلیزە بەدوژمنی میللەتەکەی دەزانی و لەسەرخۆی فەرزکردبوو ئیجرائاتی لەبەرامبەردا وەربگرێ.

هەتا پەنابردنیشی بۆ رەواندز نیشانەی دۆستایەتی و نزیکی لەسیاسەتی تورکەوە ناگەیەنێت. هەموو ماوەی مانەوەی لە رەواندز لەچەند رۆژێک تێنەپەریوە. مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ (ناچار بوو لەو رووەوە تورکخوازی بکاتە بەرنامە بۆ قوتارکردنی خۆی)

راپەرینە بەرفراوانەکەی ٢٣/ئاب/١٩٢٢ لە رانیەو پشدەرو تێکشکاندنی ئینگلیزەکان و بەهۆی نەمانی سام و هەیبەتی ئینگلیزەکان، ئەمانە وای کرد لە

---

١- رەمزی قەزاز، بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد، ل١٨١.

٢- (بانگی کوردستان) ١٩٢٢-١٩٢٦ کۆکردنەوەو لەسەر نووسینی جەمال خەزنەدار، بڵاوکراوەی وەزارەتی راگەیاندن - بەڕێوەبەرێتیی گشتیی رۆشنبیری کوردی، بەغدا ١٩٧٤.

ئاماژەی بەوەداوە کە [کەریم بەگ فەتاح بەگی هەمەوەندو محەمەد ئەمین ئاغا فەقێ قادر و فەقێ محەمەد حاجی، کەرەمێسی رەشەوەندو کوڕانی کاکە عەبدوڵڵا عەزیز خاڵە و داروودەستەیان داخیلی شاری سلێمانی بوون پاش ئەوەی ئینگلیزەکان بەفڕۆکە هەڵاتوون ل٦٨.

ئینگلیزەکان هەڵوێستیان بگۆڕن.

مامۆستا رەفیق حلمی دەڵێ"[1]"(... بۆ دامەزراندنەوەی حکومەتی کورد گەلێک مەزیەتە درابوو بە حکوومەتی ئینگلیز. بەتەواوی لەم وەختەدا بوو کە (کەریم بەگی فەتاح بەگ)یش دوو زابتەکەی ئینگلیزی کوشت و ئەوناوەی شێواند، ئینجا ئەمانە هەموویان یەکیان گرتەوەو بوون بە هۆی ئەوە کە ئینگلیزەکان بڕیار بدەن بە هێنانەوەی شێخ مەحموود...).

لەئەنجامی راپەرینەکەو باری کوردستان بەگشتی وەک مامۆستا محەمەد رەسووڵ هاوار لێی دواوەو دەڵێ( بەوجۆرە بەپێی ئەو یاداشت و دۆکیومەنتانەی لەم باسەدا لێیان دواین ئەنجامی ئەوانە هەمووی بەوەگەیشت کە ئینگلیز ناچار بێ بیر لە دووشت بکاتەوە:

١- سەرکردەو دەس رۆییوێکی کورد بکا بەحوکمدار بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوەوە بتوانرێ دەس بەسەر هەڵوێستدا بگیرێ.

٢- هێزەکانی لەوناوچە ئاڵۆزاوانە بکێشێتەوە"[2]".

باری گشتیی کوردستان لەوکاتانەدا بەم شێوەیەبوو وەک مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ: (... بەئاشکرا لەناو شاری سلێمانیدا سێ هێز لەکارابوو:

**چینی یەکەم:** بەپروپاگەندە خەریکی دامەزراندنی ئاواتی ئینگلیزەکان بوون بۆ رووخاندنی قەڵای هیوای کورد.

**چینی دووەم:** ئەمانیش خەریکی تورک خواهی بوون بەناوی ئیسلامییەتەوە بۆ رووخاندنی قەڵای هیوای کورد و رماندنی کەڵەکی درۆی ئنگلیز. بەبێ ئەوەی بزانن تورکیا جمهوورییەتە، هەربەناوی خەلیفەی ئیسلامەوە تێئەکۆشان.

**چینی سێهەم:** یەکسەر بەبێ پێچ و پەنا خەریکی نیشتمان پەروەری و گیان بەخت کردن بوون لەپێناوی کورد و کوردستانداو بەربەرەکانی دوو چینی

---

١- رەفیق حلمی، یاداشت، بەرگی سێیەم، ل. ٢٣

٢- (م.ر. هاوار)، بەرگی دووەم،ل٢٣٣ - ٢٣٤.

سەرەوەیان دەکردو بەدڵێکی پۆلایینەوە چەند ئینگلیزەکان تەنگاوبکرانایەو زیانیان ببینیایە دەستبەرداری شێخ مەحموود نەئەبوون. وایان ئەزانی بۆکاریان دەست ئەدا؛ بۆکاری ولایەتی مووسڵ"[1].

١- ئەحمەد خواجە، (چیم دی)، بەرگی یەکەم، ل١٤٣-١٤٤.

# بەشی شەشەم

---

## کەریم بەگ لە شۆڕشی دووەمی شێخ مەحموود-دا
## (١٩٢٣-١٩٢٦)

# کەریم بەگ لە شۆرشی دووەمی شێخ مەحموود-دا (١٩٢٣-١٩٢٦)

## گەڕانەوەی شێخ مەحموود لە هیندستان

لە ١٩١٩/٦/١٨ کاتێک ئینگلیز بەسەرۆکایەتیی ژەنەراڵ فرێزەر هێرشیان کردە سەر (دەربەندی بازیان)و ئەو کارەساتە خوێناوییە رووی دا، توانییان (حوکمداری) کورد لەو شەڕەدا بەبریندای بەدیل بگرن، حوکمی (نەفی)کردنی بەسەردا بسەپێن و بینێرن بۆ هیندستان و زۆربەی ناوچەکانی کوردستان داگیر بکەنەوە.

هەڵوێستی جوامێرانەی کەریم بەگ و پشتدەرییەکان بەڕاستی سەلماندیان کە کوردستان خاوەنی خۆی هەیەو نامادەن تا دوا دڵۆپی خوێنیان خۆیان بەخت بکەن و خۆیان شاهیدی ئەو ڕاستییەن کە چۆن هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارو سەرچاوە بیانییەکان لەڕووداوەکان دەدوێن، کە چۆن پارەو ماڵی دنیایان خستۆتە بەردەم دارو دەستەی خۆیان، ئەویش بە چەند تۆناخێک تاکو گەیشتۆتە سەد هەزار روپیەی ئەوکاتە. چەند قائیمقام و ئەفسەرو مدیری ناحییەیان دامەزراندووە بەتایبەتی بۆ لەناوبردنی کەریم بەگ و تواندنەوەی هێزو دەسەڵاتی بەتایبەت کە کەریم بەگ لە کۆتایی مانگی ١٩٢٢/٧ لە ڕێگای هەریر و باتاسەوە گەیشتە ڕەواندز، وێڕای ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەی دایان کە (کەریم بەگ) لەناوبەرن. بە گەیشتنی کەریم بەگ و هەڵگیرساندنی ڕاپەڕینی ٢٣/ئاب/١٩٢٢ لە ڕانیە تێکشکاندنیان بەرامبەر شۆڕشگێڕانی کورد، ناچاربوون بیر لەوە بکەنەوە کە (شێخ مەحموود) بگەڕێننەوە، هەربۆیە لە مانگی ئەیلول (شێخ مەحموود)یان لە هیندستانەوە گەیاندەوە سلێمانی.

لە ڕاستیدا کوشتنی ئەو دوو کاپتنە (بۆندو ماکانت)و (ڕاپەڕینی کورد لە

رانیه لە ١٣/ئابی/١٩٢٢) گەورەترین هۆ بوو بۆ هێنانەوەی شێخ مەحموود کە لە هەردوو خاڵەکەدا (کەریم بەگ) سەرکردەو دەست پێشخەر بووە تیایاندا»[1].

گەڕاندنەوەی (شێخ مەحموود) بۆ بەرەوپێش بردنی شۆڕشی کورد شتێکی بەهێزبوو، بەڵام ئینگلیزەکان لەگەڵ ئەوەدا کە فشاری زۆریان لەسەر بوو بۆ گەڕاندنەوەی لەهەمان کاتدا ویستیان چەند ئامانجێکی خۆیانی پێ بەدەست بێنن. لەوانە دەرکردنی تورکەکان لەرەواندز و رەواندنەوەی دەستی تورکیا لەسەر مەسەلەی (مووسڵ)و لەناو بردنی (کەریم بەگ)ی هەمەوەند لەتۆڵەی کوشتنی حاکمەکان کە ئینگلیزەکان زۆر قبنیان لێی بوو.

لە (٣٠ی ئەیلولی ١٩٢٢) شێخ مەحموود لەپێشوازییەکی جەماوەری گەرم و گوڕدا گەڕایەوە سلێمانی.

ئازاد کردنی شێخ مەحموود بەبێ مەرج نەبوو، وەک مامۆستا ئەحمەد خواجە ئاماژەی پێداوە دەڵێ»[2]« (لەگەڵ ئەوەدا کە شێخ مەحموودیان زۆر پێویست بوو کەچی.

١- لە هەولێر: بۆ ئەوەی پڕپۆڵەکەی کورد یەک نەگرێت، (ئەحمەد ئەفەندی) کاتبی شارەوانییان کرد بە (سەرۆکی شارەوانی) و متەسەرفی لیواو کردیان بەهۆی تێگەیاندنی کوردەکان کە لیوای هەولێریش داوای سەربەخۆیی بکات و لە شێخ مەحموود و سلێمانی دووریان بخاتەوە.

٢- لەکەرکووک.. مەجید یەعقووبی سەرۆکی شارەوانی بوو ئەویشیان کرد بە متەسەرف بۆ ئەوەی بەتەواوی لەسلێمانییان جیابکەنەوە، (مێجەر میلەر) ناوێکی تورکیزانیان دۆزییەوەو بەناوی حاکمی سیاسییەوە ناردیان بۆ کەرکووک، ئەم ئینگلیزە تورکیزانەو متەسەرف هانی کەرکووکییەکانیان ئەدا داوای سەربەخۆیی خۆیان بکەن و هەر بۆ ئەوەی لە سلێمانییان بپچڕێنەوە.

---

١- جلال طالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، دار الطليعة للطباعة والنشر - بيروت، سنة ١٩٧١، ص٢١٦.

٢- احمد خواجه (چیم دی)، بەرگی یەکەم، ل١٤٤-١٤٥.

٣- لە سلێمانیش بانگی مەلیکی کوردستانی بۆ شێخ مەحموود ئەدا.
٤- داوای کەریم بەگی هەمەوەندیان نەکرد کە شێخ مەحموود بەپەل بەستراوی بداتە دەستیان و لەخوێنی ئینگلیزەکانی کە لەڕێگەی مورتکە کوشتنی بیکوژنەوە.
٥- زۆر بەپەلە ئۆزدەمیر دەربکات و بەلەشکری کوردەوە جەنگ لەگەڵ تورکدا دابمەزرێنێت، بەڵام شێخ مەحموود پێی ئەوتن، سەربەخۆیی کورد بدەن. ئەبم بەسوێندخۆر و کارگوزارتان. ئەگینا نابم بە دوژمنی کەس لە سوودی بێگانەی بێ سووددا).

لە سەرەتاوە کە شێخ مەحموود گەیشتە شاری سلێمانی لە (٣٠ی ئەیلوولی ١٩٢٢) حکوومەتی بەریتانی و حکوومەتی پاشایەتی لەعێراق بەڵێنیان بەشێخ مەحموود دابوو بیکەن بەسەرۆکی ئەنجومەنی میللی لەسلێمانی، بەڵام لەدوای گەڕانەوەی شێخ مەحموود بەم ناوە ڕازی نەبوو هەتا کردیان بە (حوکمدار)و دواتر بە (مەلیک). ئینجا ئیدارەی حکوومەتەکەی بەسەرۆکایەتیی شێخ قادری برای و ئەندامیەتیی کۆمەڵێک لەناودارانی ناوشار دامەزرا. مامۆستا ڕەفیق حلمی لەم بارەیەوە دەڵێ[1] «(دووای ئەوە کە (مەراسیم)ی زیارەت تەواو بوو «شێخ مەحموود» وەکو ئومێد ئەکرا نەجوولایەوە و دەستی بۆ شتێ نەبرد. چووە (خەڵوەت)ەوەو ماوەی (دە) ڕۆژ خۆی لەکەس نەگەیاند. من وا بەتەمابووم کە دوای تەواوبوونی (مەراسیم) لێی دووربکەومەوە. بەڵام (حوکمدار) نەیهێشت و ئەمری پێ کردم لەلای بمێنمەوە. بەرۆژ- بە تایبەتی دوای نیوەڕۆ کە کەسی (غەیرە) نەئەما- ئەچوومە ژووری تایبەتی خۆی و گفتوگۆمان ئەکرد. بەتەواوی لەمەبەستی و لەم (خەڵوەت)ەی تێ نەئەگەیشتم بێ ئۆقرەو کەم باوەڕم ئەهاتە بەرچاو. لەسەر قەرارێ نەئەوەستا. شتی زۆری لەدڵا هەبوو. نەیئەزانی لەکوێوە دەس پێ بکات و چۆنی دەربخا. لەگەڵ ئەمەشا هەر چۆنێ بوو لەژێر ناوی (هەیئەتی روئەسا)دا (کابینە) واتە وەزارەت دانراو ناوی ڕەئیسەکان لەژمارەی

---

١- (رەفیق حلمی، یاداشت) بەرگی دووەم، جزمی پێنجەم، ل١٠٦-١٠٩.

(١٠)یەمی رۆژنامەی (بانگی کوردستان)دا بەم جۆرەی خوارەوە بڵاوکرایەوە:

| | |
|---|---|
| ١- رەئیس ئەلوزەسا | شێخ قادر حەفید |
| ٢- رەئیسی داخلیە | شێخ محەمەد غەریب |
| ٣- رەئیسی مالیە | عەبدولکەریم عەلەکە |
| ٤- رەئیسی مەعاریف | مستەفا پاشا |
| ٥- رەئیسی قیوای میللی (دفاع) | سالح زەکی صاحێب قڕان |
| ٦- رەئیسی مەحاکم و شەرع (عدلیە) | حاجی مەلا سەعید کەرکووکی زادە |
| ٧- رەئیسی نافعە | محەمەد ئاغای عەبدولڕەحمان ئاغا |

«سەیید ئەحمەد بەرزنجی، هەرچەند ناونیشانی (رەئیسی ئەمنیەتی عمومیە)ی درابووێ لەهەیئەتی رەئیسەکان نەئەژمێررا. چونکە رەئیسی داخلیە کە بەمانای وەزیر ئەهات دیارە کە (مەرجع)ی (ئەمنیەتی عمومیە) بوو. لەبەر ئەمە راست تر ئەوەبوو کە بە (مودیری ئەمنیەت) ناوبنرێ بەڵام، ئەحمەد بەگی فتاح بەگی رەئیسی گومرگ لەگەڵ بوونی وەزیری مالیەشا خۆی بە وەزیر دائەناو لەگەڵ هەیئەتی رەئیسەکان دائەنیشت و کۆئەبووەوە. ئەمەش هەڵەی ئەوی تیانەبوو وێنەی حکومەتەکە خۆی بەو جۆرە کێشرابوو.

«شێخ قادری حەفید» بەلای ریاسەتی هەیئەتەوە پلەی (سوپاسالار)یشی هەبوو کە بەمانای (قائدعام) ئەهات. هەرچی «سدیق پاشا»یە وەکو لە پێشەوە وتبوومان کرابوو بە سەرپەرشتیاری عموومیی حکومەتی کوردستان....).

حکوومەت لە شاری سلێمانی دامەزراو دەست بە ئیش و کار کرا.

ئینگلیزەکان لەسەرەتاوە (کابتن نۆئێل)ی کۆنە حاکمی سیاسییان دووبارە لەگەڵ شێخ مەحموود بەهەمان پایەی پێشوو گەڕاندەوە سلێمانی. بەڵام ئەمجارە زۆر خۆی نەگرت و (چپمن)ی لەشوێنی خۆی بەجێ هێشت. (چپمن) پیاوێکی دڵ رەق و دژ بەمساف و چارەنووسی گەلی کورد بوو بەڵام لە بەرامبەر شەپۆلی نیشتمانپەروەری و پروپاگەندەی تورک خوازی و ئەوبێ متمانەییەی کورد بە ئینگلیزەکان، بێ قەراربوو.

## کەریم بەگ لە دڵی شێخ مەحموود-دا

شێخ مەحموود لەبەغدا، بەر لەگەڕانەوەی، لەلایەن ئینگلیزەکانەوە ئەو مەرجەی بەسەر سەپێنرا کە کەریم بەگ بە پەل بەستراوی بداتەوە دەست ئینگلیزەکان، بۆ ئەوەی لە خوێنی ئەو ئینگلیزانەی کە لە ڕێگەی مۆرتکە کوشتنی، بیکوژنەوە"[1].

بەلام (کەریم بەگ) بەم هەواڵە بەرامبەر شێخ بێ متمانەبوو. هەروەها شێخ مەحموودیش ئەو مەرجەی زیاتر وەکو پلانێکی خۆ دەرباز کردن وەرگرتبوو. گەرچی ئەو بابەتە لەو سەروبەندەدا کە شێخ گەڕایەوە پێویستی بە دڵنیاکردنەوە هەبوو، بەلام بەهۆی پەیوەندیی نێوان ئینگلیزەکان و شێخ مەحموود کە لێڵ و ناڕۆشن بوو ئەو بەڵێنانەی ئەوان بەشێخ مەحموودیان دا بوو لێی پاشگەزبوونەوەو بەبێ بەرامبەر دەیانویست بیکەن بەگژ (تورک)دا. تورکیش لەناو عەشایەری ناوچەکە خاوەن نفووزی بەهێزبوو، لەو ناوەدا ئەو مەرجەش بزربوو.

ئەگەر چاوێ بەو پەیوەندی و خۆشەویستییە دووسەرەی نێوان کەریم بەگ و شێخ مەحموود-ە دا بخشێنین، هەمیشە هەست بەدڵفراوانی و خاوەن قەدرو خۆبەبچووک زانینی کەریم بەگ دەکرێ لەبەرامبەر شێخ، ئەمەش زیاتر لەبەر بەرژەوەندیی باڵای میللەتەکەی بووە.

ڕاستە کەریم بەگ جێگەی ڕێزبووە لەلای شێخ مەحموود، بەلام نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت کە کەریم بەگ بۆ شێخ مەحموود قەڵاو شوورەیەکی پۆڵایین بووەو بەڵێوەشاوەیی و جوامێری و دڵسۆزیی خۆی بۆتە ئەمری واقیع لەبەرامبەر شێخ مەحموود کە ناچاربێت حیسابی تایبەتی بۆ بکات. زۆرجار درزو کەلێن کەوتۆتە نێوان هەندێک لە ئەفرادی هەمەوەند و شێخ مەحموود، بەلام هەمیشە کەریم بەگ لەهەوڵی تەشەنە نەکردن و کۆنترۆڵی ئاژاوەدا بووەو نەیهێشتووە

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی). بەرگی یەکەم، ل١٤٤.

پەرە بسێنێ و پارێزگاریی لەو پەیوەندییە کردووە کە لەگەڵ بنەماڵەی (کاک ئەحمەدی شێخ) لە مێژوویەکی دووروودرێژدا هەیانبووە.

ئەدمۆندز باسی ئەو پەیوەندی و باوەڕییەی هەمەوەندەکان لەگەڵ (کاک ئەحمەدی شێخ)کردووە، ئەمەش بەڵگەیەکە کە هۆزی هەمەوەند زۆر (ئایین) پەروەرن و باوەڕیان بە شێخ و (سەیید)ەکان هەبووە. هەرچەندە دەبا سەربوردەی هەمەوەندەکانم لەکاتی گەڕانەوەیان لە تەرابلسەوە باس بکردایە، بەلام وا لێرەدا بۆ سوودی خوێنەران دەقەکەی ئەدمۆندز ڕادەگوێزم کە دەڵێ (هێزی هەمەوەند ئازایەتی و بەتواناییان گەیشتۆتە ئەوەی کە هیچ هۆزێک هاوتایان نەبێ، توانییان چۆک بە تورک و ئێرانی دابدەن و ڕاویان بنێن، بەلام حکوومەت بەفێڵ و تەڵەکەبازی توانی هۆزی هەمەوەند لە سلێمانییەوە، سەڵت و کۆمەڵ و ژن و پیاو و پیرو گەنجی وەک خێزان، نەفییان بکەن بۆ دورگەی (ڕۆدس) و هەندێکیان بۆ تەرابلسی ئەفریقیاو ئەوەکانی تریش هەریەکەیان بەلایەکدا لەناوچەکانی خۆیان دوورخرانەوە.

پاش چەن ساڵێک هەموو دوورخراوەکان هەڵهاتن بۆ شوێنەکانی خۆیان و لەکاتی گەڕانەوەیاندا تووشی چەندین شەڕو پێکدادان هاتن، بەتایبەتی ئەوانەی لە (تەرابلس) لەگەڵ هێزێکی گەورەی عەرەبدا، لەگەڵ ئەوەشدا عارەبەکان وازیان لە هەمەوەندەکان نەهێناو دوایان کەوتن بۆ ئەوەی بیانگرن. ئێوارەی هەمان ڕۆژ هەمەوەندەکان گەیشتنە کەناری ئاوی (فورات). هەوڵی پەڕینەوەیان دا بەلام هیچ بەلەمێک لەو ناوەدا نەبوو کە پێی بپەڕنەوەو خۆیان لە هێرشی عارەبەکان بپارێزن.

لە نێوان ئەم کاتە ترسناکەدا دەنگێکی بەرز بانگی هەمەوەندەکان دەکات پێیان دەڵێ: (وەرن بەشوێنما)، ئەو دەنگەش دەنگی (کاک ئەحمەدی شێخ) بوو، هەمەوەندەکان بەشوێنی دەنگەکەدا ڕۆیشتوون. کاتێکیان زانیوە دەنگەکە بردوویانیەتە بەردەم (قەیاغ)ێک، هەمەوەندەکان بەو (قەیاغ)ـە پەڕیونەتەوە ئەوبەری ئاوەکەو لەگرتن و کوشتن دەربازدەبن. کاتێک کە عارەبەکان دەگەنە لای

ئاوەکە دەبێن (قەیاغ)ـەکە لەو بەری ئاوەکەیەو هیچ شتێ نابێت پێی بپەڕنەوە بۆ ئەوبەری ئاوەکە. هەمەوەندەکان رزگاریان دەبێ و ملی رێ دەگرن و بۆ وڵاتی خۆیان دەگەڕێنەوە. هەر لەوکاتەوە (بیرو باوەڕی) هەمەوەندەکان زیاتر بووە بەرامبەر بنەماڵەی (کاک ئەحمەدی شێخ). هەمەوەندەکانیش هەموو کاتێ باسی ئەم بەسەرهاتەی خۆیان دەگێڕنەوە)»[1]. ئەو دەقەی ئەدمۆندز بە شێوەی تریش لەلایەن هەمەوەندەکانەوە باسی لێوە کراوە، بەڵام ئەمان ویست باسی بکەین هەر بەوەندەوە وازی لێ دەهێنین.

---

١- سی. جی أدمۆندز، کردو ترك وعرب/ ترجمة جرجیس فتح الله ص٧٥-٧٦.

# رۆڵی کەریم بەگ لەهەڵگیرسانەوەی شۆڕشی دووەمی شێخ مەحموود-دا

شێخ مەحموود لەدوای گەڕانەوەی، متمانەی بە ئینگلیزەکان نەمابوو. لەلایەکی تریشەوە، تورکخواکان زۆر دەوریان دەداو (ئۆزدەمیر) لە نامەو نامەکاریدا بوو لەگەڵیدا، بۆ ئەوەی سەرنجی بەلای (تورک)دا رابکێشێ ئەویش لەو بەینەدا لەبەرامبەر ئەو دوو هێزە تەماعکارەو خواست و ئاواتەکانی میللەتەکەیدا هەستی بە نائارامی دەکرد.

لەمانگی شوباتی ئەو ساڵە (سمکۆ خانی شکاک) هاتە سەردانی شێخ مەحموود. ئەمەش گوڕوتینێکی تری دا بەگیانی نیشتمانپەروەری لەلای لاوەکان.

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەربارەی ئاڵۆزبوونی پەیوەندیی نێوان شێخ مەحموودو ئینگلیزەکان دەڵێ: (پڕوپاگەندەی ئۆزدەمیر تەنیا لە کوردستاندا نەبوو، زۆربەگەرمی کەوتە ناو عەرەبستان و بەتایبەتی مووسڵ و بەغداد: هەروەکو تورکخواهی پەرەی سەند. پیاو خراپیش خۆیان خزاندە پەنای شێخ مەحموود. لەبەر ئەوەی لە لوتف و ژوانی ئینگلیز دەستی شتبوو و هەموو هیواو ئاواتی بەباچووبوو، نەینەوێرا پەلاماری تورکەکان بدات. وەنەبێت تورکیشی خۆش بوێت، بەڵام ناچاربوو بەراگرتنی هەردوولا.

جا ئەو پیاوانەی یەکسەر تورکخواهیی - خەلیفەی ئیسلامیان زیندوو نەکردەوە، بەهێزتربوون لەوانەی کە خۆشیانی نەدەویست.

١- تاهیر ئەفەندی ئەمین - سەرکاتبی ملووکانە.

٢- سەیید عەبدوڵڵا حاجی سەیید حەسەن - ئامۆزای شێخ مەحموود.

٣- ئەحمەد تەقی - ئەفسەرێکی عوسمانی ئیحتیاتی بوو.

٤- سەیید رەزا ئەفەندی - لە سوپای عوسمانیدا یوزباشی بوو.

٥- سەیید رەئووف ئەفەندی

زۆر پیاوانی تری ناسراو و دەست رۆیشتوو.

بەهۆی ئەمانەوە لەناکاو دوو ئەفسەری تورک لە ئەفسەرەکانی نۆزدەمیر، یوزباشی رەمزی لەگەڵ یەکێکی تریان بەناوی میوانییەوە هێناو خزانیانەماڵی شێخ مەحموود. لەم رۆژانەدا، مستەر چیمن خۆی بە نەخۆشی خست، بۆ پرسیارو چۆنێتی، فەرمانم پێدرا بچم. لەپێش ئەوەی پرسیاری لێ بکەم:

**وتی:** میوانەکانی شێخ مەحموود رۆیشتن؟

**وتم:** کام میوان.

- تورکەکان! بەتووڕەییەوە:

وتم، شتی وانییە. تورکی چی؟

دووبارە بەگرژییەوە، وتی: قەیناکات، من لەپێش ئەواندا ئەڕۆم.

گەڕامەوە چۆنێتی باسەکەم بەبێ کەم و زیاد گێڕایەوە، رۆژی دوایی میستر چیمن هات. شێخ مەحموود بەپیرییەوە چوو. چیمن وتی من ئەچم بۆ بەغدا.

**پێی وت:** تکایە. دوایی بەکارمان بهێنن. نازانین مەزبەتەکان بەچی گەیشت؟

**وتی:** باوەڕ ناکەم من بگەڕێمەوە. ئێوە بەلایەکی ترا کارتان تەواو ئەکەن. سەیید عەبدوڵلا وتی: ئەبێت پێی ئینگلیز لەولاتدا نەمێنێت. نوێنەری کەمال پاشا هاتووە»[1]، دەبێ بە ئیسلام بەڕاستی؟

**شێخ مەحموود:** ئێمە دوژمنی هیچ لایەک نین، ئەگەر میوان لەهەرچی لایەکەوەو لەهەرچی تیرەیەک بێت بەلای ئێمەوە بەرێزە. ئەگەر ئارەزووی چوونی بەغدات هەیە خوات لەگەڵ، بەلام فەرامۆشمان مەکەن.

**٢٥ی شوبات ١٩٢٣.**

مەندووبی سامی لە بەغدا داوای شێخ مەحموودی کرد کە بچێت بۆ بەغدا

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی یەکەم، ل١٤٦-١٤٧.

بۆلای. شێخ بابه عەلی شێخ مەحموود دەربارەی ئەو داواکردنەی مەندوویی سامی دەڵێ: (باوکم دەیزانی ئەگەر بچێت بۆ بەغدا بەسەلامەتی ناگەرێتەوە. بۆیە گوێی نەدایە ئەو هەرەشەیەی ئینگلیزەکان. وردە وردە ئەو ئەفسەرانەی لەگەڵ باوکمدا بوون خۆیان لەباوکم دزییەوە... باوکم ئاگاداری ئەوەبوو بەراسپاردەی ئینگلیز خۆیان ئامادە کردبوو بەدزییەوە سلێمانی بەجێ بێڵن و رووبکەنە بەغداد. بۆیە خرانە ژێر چاودێرییەوە...

حاجی مستەفا پاشای یاموڵکی بەشەو لە سلێمانی خۆی دزییەوە و چووە گردی سەیوان، بەڵام پێی زانراو هێنرایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا باوکم هیچی لێ نەکرد. کە باوکم سلێمانی بەجێ هێشت و چوو بۆ ئەشکەوتی جاسەنە، مستەفا پاشا یاموڵکی هەر لەسلێمانیدا مایەوە و کەس دەستی بۆ نەبردو لەدواییدا چووە بەغداد. دوای ئەویش عیزەت مەدفەعی و تۆفیق وەهبی یەک لەدوای یەک خۆیان دەربازکردو چوونە بەغداد)«[1]» .

هەر لەم بارەیەوە مامۆستا (تۆفیق وەهبی) لەساڵەکانی هەشتاکانا لەلای مامۆستا محەمەد رەسووڵ هاوار وتوویەتی(عیزەت مەدفەعی لەخەراجییانەوە رای کردو چووە بەغداو ئێمە لەورۆژانەدا هیچ ئومێدێکمان نەمابوو. ئینگلیز سیاسەتی بەرامبەر بەکوردو بەرامبەر بە شێخ مەحموود گۆڕیبوو و هیوای هیچ سەرکەوتنێکیش نەدەکرا بەسەر هێزی ئینگلیزو عێراقدا. بۆیە وازمان هێناو چووینە بەغداد)«[2]» .

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ: (رۆژی ۲۹ی شوباتی ۱۹۲۳ دوو فرۆکە هاتنە سەر سلێمانی، پڕیاسکەیەکیان فڕێ داو دوو بۆمبایش بەدوایدا. یەکەمیان لەچۆڵی شێخ جافرو دووەمیان لەناوەڕاستی سلێمانیدا بەرماڵی (کەریم بەگ خانزادە جوانی) نزیک بە سەرای حکوومەت، لایەکی رماند بەسەر خێزانەکەدا

١- (م. ر. هاوار)، بەرگی دووەم بەشی دووەم، ل٤٩٢.
٢- هەمان سەرچاوە، ل٤٩٣.

دووژن بەکوژراوی و سێ منداڵیان لە ژێر خاکدا مایەوەو لە دوایدا بە مردوویی دەرهێنران)»[1].

## اعلان بۆ شێخ مەحموود ئەفەندی و خەلق سلێمانی

«خەبەرتان بێت کە ئەگەر پێش نیوەڕۆی ڕۆژی یەکشەمە بیست و پێنجی ئەم مانگە (مطابق بیست و یەکی شەوال) شێخ مەحموود ئەفەندی لەچەمچەماڵ یان لەکەرکووک دەخالەت بکات بۆردومانی مەرکەزی سلێمانی ئەجرا ناکرێت بەڵام ئەگەر هەتا ئەو وەقتە دەخالەت نەکات بۆردومانێکی شەدید واقیع دەبێت».

مامۆستا محەمەد ڕەسووڵ هاوار دەڵێ: (لەگفتوگۆیەکما لەگەڵ شێخ بابە عەلی شێخ مەحموود دەربارەی ئەو خێزانانەی بەهۆی ئەو هەڕەشەو بۆردومانی فڕۆکانە لەسلێمانی کرا فەرمووی:

«دوای ئەوەی باوکم بڕیاری دا سلێمانی بەجێ بێڵێت و ڕووبکاتە ئەشکەوتی جاسەنە بۆ ئەوەی بیانوو نەداتە دەست ئینگلیزەکان و بەفڕۆکە ناو شار وێران بکەن، ئەو خێزانانەی کە ترسیان هەبوو ئینگلیزەکان تاوانیان بەرامبەر بکەن سلێمانییان بەجێ هێشت و هەر تاقمە رووی کردە شوێنێک و جارێکی تریش خێزانەکانی شێخان و خزمان و ناسیاو و دەست و پەیوەند بارمان پێچایەوەو ڕوومان کردە ناوچەی (دزڵی) لەهەورامان و لەهەواری (هانەساوا) ماینەوە هەتا ئینگلیزەکان جارێکی تر سلێمانییان بەجێ هێشت و ئەوسا گەڕاینەوە (وەکو لە باسێکی داهاتوودا لێی دەدوێین ئینگلیزەکان لە ١٩٢٣/٦/١٧ سلێمانییان بەجێ هێشت و شۆڕشگێرانی کورد کە پێشرەوەکەیان (کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند بوو لە ١١ی تەمووزدا دووبارە گەڕانەوە بۆ سلێمانی»)»[2].

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی یەکەم، ل١٤٧

٢- (م. ر. هاوار)، بەرگی دووەم، ل٥٠٠-٥٠١.

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ: (شەوی ٢/٣ی مارت ١٩٢٣ کات ژمێر نۆی پاش نیوەڕۆ: شاری سلێمانی چۆڵ کرا:

دوو ڕۆژ لەوەپێش لەترسی بۆمبابارانی و فڕۆکەی ئینگلیز و دیمەنی کەلاوەی خانووەکەی کەریم بەگ هەر کەس بەژن و منالییەوە تەنیا سەری خۆیان دەرنەکرد، خانووی پڕ لە کەلوپەل بەمۆڵی بەجێ ئەما).

هەروەها مامۆستا ئەحمەد خواجە لەدرێژەی باسەکەیدا (کەئەو جەماوەرە کێبوون لەگەڵیا شاریان چۆڵ کرد و چوونە جاسەنە دەڵێ (سوارەی عەشایر ١- پشدەری ٢- هەمەوەند ٣- جەباری ٤- سمایل عوزێری- تیرەکانیان)[*١]) بەم جۆرە پەیوەندی نێوان ئینگلیز و شێخ مەحموود تێک چوو و ناچار شاری سلێمانی بەجێ هێشت ئامادە نەبوو گەلەکەی بکاتە قۆچی قوربانی بۆ بەدی هێنانی خواستە گلاوەکانی ئینگلیز.

بەڵام هۆی تێکچونی ئەم پەیوەندییە هۆکاری بابەتی و ناڕاستەوخۆی زۆرن. دەگێڕنەوە هۆکاری ڕاستەوخۆی زیاتر ئەو پەیوەندییە پتەوەی شێخ بوو لەگەڵ کەریم بەگ، هەتا شێخ داوا لە کەریم بەگ دەکات ئەو مەرجەی کە ئینگلیزەکان بەسەریاندا سەپاندووە چارەسەری بکەن. کوڕەکانی کەریم بەگ بەتایبەتی (سابیر بەگ) هەست بە مەترسیی ئەمەدەکەن و حەزناکەن لەبەر ئینگلیزەکان بچێت بۆ سلێمانی، بەڵام کەریم بەگ متمانەی بە شێخ هەبوو و دەچێت بۆلای شێخ مەحموود. لە باڵەخانەی شێخ ئینگلیزەکان هەست بەم گفتوگۆیە دەکەن و دەزانن هەردووکیان بۆ ڕێگە چارەیەک دەگەڕێن. کەریم بەگ هەست بەخراپی وەزعەکە دەکات و سلێمانی بەجێ دێڵێ، دواتریش شێخ مەحموود خۆی سەردانی ماڵی کەریم بەگ دەکات لە (شەدەڵە). ئینگلیزەکان هەریەتەمای جێبەجێ کردنی بەڵێنەکەی شێخ مەحموود بوون، داواشی لێ دەکەن سەر لە کەرکووک بدات، بەڵام بەم سەردان و کۆبوونەوە دووقۆڵییانە ئینگلیزەکان

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم، ل٧-٩٠ .

نائومـێـد دەبن. بۆ دواجـار ئـیـنزاری حکوومـەتەکـەی و شـارەکـەی دەکـەن و دواتر بۆردومانی دەکەن»[1].

لەدوای چۆڵ کـردنی شـاری سلێـمـانی لەشـەوی ٢/٣-٣-١٩٢٣ شـێخ مەحموود فەرماندەیەکی گشتی لە ئەفسەرو پیاوە دەرەجەدارەکانی کورد دروست دەکـات بۆ سـەرپەرشـتـیی بەرەکـانی شـەڕ و رووبەڕوو بوونەوە. بەرەکـانـیش بەم شێوەیەی لای خوارەوە دانران. وەک مامۆسـتا ئەحمەد خواجە دەڵێ لە (... ٩) هێزی سوارەی عەشایر پێکهاتبوو:

ا- کەریم بەگ سوارەی هەمەوەند لە بازیان.

ب- خەلیفە یوونس سوارەی روغزایی جاف لەشارەزوور(١).

ج- حەمە عەلی رۆستەم روغزایی جاف لەشارەزوور(٢).

د- مەحموود خاتر سمایل عوزێری لە سەرچنار.

هـ- مەحموودی دەوڵەتیار هەمەوەند لە دەربەند، چەمچەماڵ.

و- سەیید محەمەدی جەباری سوارەی جەباری لەدەوروپشتی چەمچەماڵ.

ز- تۆفیق ئاغا سوارەی هەمەوەند لەدەوروپشتی سلێمانی.

ح- حەمە ئاغای عەلی ئاغا سوارەی پشدەر لەناحیەی مەرگە.

ط- سـوارەی تایبـەتی ٥٠ سـوپایی و ٥٠ عـەشـایری لەجـاسـەنە و قەمچوغە)»[2].

بارەگای شێخ مەحموود لە ئەشکەوتی جاسەنەبوو.

بەو شێوەیە هێزەکـان رێکخران و هەریەک سوارەکـانی خستـەڕێ بۆ ئەوەی لەدەرفـەتی گـونجـاودا گـورزی کوشندە لەدوژمن بدەن و لە ئامـادەکـاریدا بن بۆ

---

١- سـابیر بەگ لە دەس نووسـەکانی، ئەم باسـەی کردووە، دەڵێ: (لە ئەنجامی فشـار خستنە سەر شێخ مەحموود بۆ جێبەجێ کردنی مەرجەکان، چەن جارێک کە لەگەڵ باوکم دانیشتن دەکـەن بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەیەک تا کێشە بۆ حکوومـەتی کورد دروست نەبێت.

٢- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم، ل٢١.

گرتنەوەی شاری سلێمانی. لەو سەروبەندەدا بوو کە بارەگاکانی شێخ مەحموود لەسووداش کەوتەبەر بۆردومانی فڕۆکەی دوژمن.

مامۆستا ئەحمەد خواجە لە کتێبەکەی «چیم دی»دا باسی هاتنی ئۆزدەمیری کردووە کە بۆلای شێخ مەحموود هاتبوو بۆ ئەشکەوتی جاسەنە. پاش پێنج ڕۆژ میوانداری ئۆزدەمیر گەڕایەوە بۆ «کانی ڕەش»«[1]».

ئەدمۆندز باسی ئەوە دەکات کە ئینگلیز لەمانگی نیسانی ١٩٢٣دا خۆیان ئامادەکردبوو بەپێی نەخشەیەکی سەربازی هێرش بکەنە سەر شۆڕشگێڕان، هەروەها (ئۆزدەمیر)یش لە کوردستان دەربکەن«[2]».

ئەدمۆندز لە باسی ئەو هێرشەدا دەڵێ: (کارە سەربازییەکەمان لە ١٠٠٪ بەپشتیوانی هێزی ئاسمانی ئەنجام درا. پاش ئەوەی هەندێ شەڕمان تووش هات لە (بالیسان)، بەڵام لە ڕۆژانی ١٩-٢٠/نیسان١٩٢٣ سەرکەوتنمان بەدەست هێناو سپیلکمان گرت بەبێ ئەوەی ئۆزدەمیر و کۆمەڵەکەی (فیشەکێکیان پێ بتەقێ). لە ١٩٢٣/٤/٢٢ توانیمان ڕەواندز بگرینەوەو هەرچی دەست و پێوەندی ئۆزدەمیر هەبوو لەو ناوچانە نەمان)«[3]».

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەربارەی ئەم هێرشەی ئینگلیزەکان دەڵێ (ئینگلیز گەیشتە کۆیە - ڕانیەو مەرگەی سووتاند، دێهاتەکانی یەک بەدوای یەکدا بەبۆمبا سووتاندو تاڵان و کوشتن و پەرێشان کرد، کار ناخۆش بوو، شێخ مەحموود بڕیاری دا شەڕ رابگرێت چونکە، نەیدەویست ئەم جارەش خوێن بڕژێت)«[4]».

هەروەها مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ (لەبابەکر ئاواوە سوارە تیپ تیپ، پیادە بلووک بلووک کەوتە ڕێگا. فەرمان لەلایەن ڕەزا بەگەوە دەرئەچوو. لەگەڵ

---

١- چیم دی، بەرگی دووەم، ل١٦-١٩.
٢- ئەدمۆندز، کرد ترک عرب، ل٢٨٧-٣٠٣.
٣- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٢.
٤- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم، ل. ٢١

سەیید برایم بەیەکەوە ڕامان ئەبوارد. گەیشتینە (چنگیان) خواردمەنی بۆ پیادە ئامادە کرابوو. پاش نیو سەعات حەسانەوە: سوارە بۆ حاجی مامەند فەرمان درا، خێزانی مەلیک و دەستوپێیەکانیش لە (گەلاڵەوە) بۆ (دزلی) ڕۆیشتین. ٢٢-٢٣/نیسان/١٩٢٣)»[١]

لەوسەروبەندەدا بوو کە بارەگاکانی شێخ مەحموود لە سووورداش کەوتە بەر بۆردومانی فڕۆکەی ئینگلیز و بارو بارگەیان پێچایەوە بۆ ناوچەکانی شارباژێڕو پێنجوێن و هەورامان. شێخ مەحموود زۆر پێویستی بە کەریم بەگ دەبێت و هەست بە نارەحەتی دەکات. (کاوێس ئاغا)ی لاوک بێژی کورد بەم بۆنەوە لاوکە بەناوبانگەکەی دەهۆنێتەوە کە دەڵێ:

دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ..

دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ..

شێخێ من دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ..

بهارا من ب سەرێ سلێمانی-دا تێتێ دحالێ شەرادا ل عەسمانا خوشی تێ گرتنا تەیاران و گرەگرا مەتەریۆسا

---

١- ئەحمەد خواجە،چیم دی، بەرگی دووەم، ل٢٧..
هەروەها ئەحمەد خواجە دەڵێ، کە ئینگلیزەکان گەیشتنە کۆیەو ڕانیە ئیتر (مەرگە)یان سووتان و گوندەکانی تریشیان یەک لەدوای یەک بۆردومان کرد.
دوای ئەوەی سوپای ئینگلیز ڕووبەڕووی سوورداش بووەوە ئەفسەرەکانی پیادەی شۆڕش بڕیاریان دا واز لەشۆڕش بێنن و بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی و هەوڵێکی زۆریان لەگەڵدرا کە پەشیمان ببنەوە، بەڵام سوودی نەبوو. ئەوانەی وازیان هێناو گەڕانەوە ئەمانەبوون:
١-خالید سەعید ٢- ڕەشید سدقی غەفوور ٣- عەلی کوردی ٤- ئیبراهیم زوریە
٥- عەبدولعەزیز ئەفەندی ٦- فوئاد مەستی ٧- مەجید خانەقینی.
ئەحمەد خواجە دەڵێ: بە (ڕەشید سدقی)م وت: تۆ دەڵێی من برای شیریی شێخ مەحموودم ئەی چۆن لەم ڕۆژە تەنگانەدا بەجێی دەهێڵیت؟
لەوەڵامدا وتی: ئەم پرسیارە لەمن مەکە بەڵکو لەو فڕۆکانە بکە کە بەسەرمانەوەن].
چیم دی، بەرگی دووەم، ل٢١١-٢٢.

بەلێ شاهدێ شهوودێ شێخ مەحموود نەڤیێ شێخ قادر بابێ لەتیف.. ب سێ دەنگا گازی دکەت کەریمێ فەتاح وە گەلی عەگیدان مێرانییەکێ بکەن..

هەچی گاڤا دستێ خۆ بدەمە دارێ جامبێزارێ..

..........

دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. شێخێ منووا..

ئەزێ هندی هەواردکەم هەوارا تورکا گەلەک دوورە برانۆ... کورد خائینۆ..

دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ شەرەکا قەومی ل چیایێ سورداشێ ل بیرڤانێ..

هەسپێ شێخ مەحموود گەنجێ شێخ قادر بابێ لەتیف لاوێ کوردا دەنگداو.. شێخ مەحموود ب سێ دەنگا گازی دکەت کەریمێ فەتاح وەمشیرا ڕابن.. گەلی عەگیدا.. ئەڤرۆ دەست هەلاتەکێ ب من ڕا بکەهێن بەلێ شەرێ مە دچەپەرادا نامینیت ئەشهەدو بیللا گەلی برا شەرێ مە دێ خارکەفیت و بلاڤە بیت و کەڤتە چیاو چولی.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ..

شێخێ منۆ.. بەلێ باش هندێ هەواردکەم..

هەوارا تورکا دوورە.. بەلێ برا برانۆ کورد خائینۆ..

دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ شێخێ برا..

شەرەکا قەومی ل چیایێ سووورداشێ وا ب بەرا بەلێ سۆبا.. ڤێ سوبێ.. عەسکەرێ ڤی نەیاری.. فەلەڕمشکا[*] وا ب بەرا ڤێرێنە هاتە سەرا بەلێ شادو شودێ شێخ مەحموود گەنجێ شێخ قادر بابێ لەتیف ب سێ دەنگا گازی دکەت...

کەریمێ فەتاح تۆ ب گەلی عەگیدا ئەڤرۆ تەگبیرا ئەکێ بکە بەلێ چ گاڤا دەستێ خۆ بدەمە دارێ جەمبێزارێ بگرم شارێ کەرکووکێ.. شارێ بەغدایێ بارەکێ تێدا خەملا دلا.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ..

---

(*) فەلەڕمشکا: مەبەستی لەشکری ئینگلیزە

دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ شێخێ منۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ..

ئەزێ ئەڤرۆ هەوار بکەم.. هەوارە تورکا برانۆ.. کورد خائینۆ .. دەلۆیلۆ..
دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ شێخ مەحموودێ من..

زەری ل چیایێ سووروداشێ.. کانی وەردە خەلکانێ.. بەژنا شێخ مەحموود کەکێ شێخ قادر بابێ لەتیف نەباتا تاکێ روحانێ.

شێخ مەحموود ب سێ دەنگا گازی دکەت کەریمێ فەتاح بەگ ب گەلی عەگیدا.. بۆ من دەست هەلاتەکێ بکە ئەڤە سێ رۆژە وەمێ ئاسێ بین ل چیایێ سووروداشێ جیهادا ل مە رابی دەراڤێ وێ دادێ وانێ دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ.. دەلۆیلۆ

شێخێ منۆ.. بەلێ فایدەنینە.. هەرار بکەم..

هەوارا تورکا دوورە.. گەلی برانۆ.. کورد خائینۆ..»[1]

١- سترانێت کاوێس ئاغای، خرڤەکرن و بەرهەڤکرنا (شەعبان مزیری) ل١٢-١٤ چاپخانەی ئەسعەد- بەغدا ،١٩٨٨

## بارەگا لە برنجەی هەورامان

لەژێر فشاری هێزی سەربازی و فڕۆکەی ئینگلیز، شۆڕشگێڕان چوونە ناوچە سنوورییەکان. بارەگای سەرەکی لە (برنجە)«[1]» دانرایەوە.

سەرلەنوێ دەس کرا بەدامەزراندنەوەی دەزگا و سوپای سەربازی: بەم فەرمانەی لای خوارەوە تشکیلات کرایەوە.«[2]»

## پشت بەخوا

ژمارە/٨

ڕۆژ/ ٥-٥/١٩٢٣

**بۆ فەرماندەی سوارەو پیادەی سوپایی**

**رەزا بەگ**

بەپەلە و بەبێ وەستان ئیمڕۆ سوارەو پیادە، بنێرن بۆ ئەو جێگایانەی بڕیاری ئەدەن و وێنەیەکی دابەش کردنەکە دەست بەجێ بنێرن بۆ ئێمە:

**مەحموود**

**مەلیک و باش قوماندانی کوردستان**

لەلایەن ڕەزا بەگەوە ئەم تەرتیباتە کرا

---

١- برنجە، لەناوچیای هەورەماندا جێگەیەکی ناودار و خاکی ئێرانە.

٢- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم.ل٣١-٣٢.

**بەشی سوارە**

١- ماجید: سوارەی سوپایی- بۆ سەرچنار و تانجەرۆ (هەموو ئەفسەرەکان فەرمان لە ماجید وەرئەگرن) چونکە لە شێخ ئەلمارێن ئەمێنێتەوە. تا ئەشعاری دواییمان.

٢- کەریم بەگ و مەحموودی دەولەتیارو سەیید محەمەدو تۆفیق ئاغای هەمەوەند (فەرمان لە کەریم بەگ وەرئەگرن).

٣- خەلیفە یوونس و حەمە عەلی رۆستەم روغزایی بەدووپەل- شارەزوور.

٤- مەحموود خاتر، سمایل عوزێری (پێوەندیی بە ماجیدەوە ئەبێت).

٥- سوارەی تایبەتی و ئەمین حەمەی ئیمام هەمەوەندی لە بارەگا ئەبن.

ماوەی هێزی سوارە لەبارەگایەوە فەرمانڕەوەی گشتی تەماشایان ئەکات.

**بەشی پیادە**

١- عەزیز ئەفەندی زڕەو جەلال رەشید ئەفەندی و ٥٠ سوپایی پێنجوێن.

٢- رەشید عەبدولکەریم و ٥٠ سوپایی ناڵپارێز.

٣- رەمزی ئەفەندی و ٥٠ سوپایی مەلیکەوە

٤- عەبدوڵلا ئاغا و ٥٠ سوپایی شێخ ئەلمارین

٥- عادل ئەفەندی لەگوێژەوە و ٢٠٠ سوپایی شارباژێر تا پێنجوین.

٦- پیادەی سوپاییەکەی تریش لەبارەگاوە تا ناڵپارێز ئەمێنێتەوە"[١].

بەم جۆرە هێزی شۆڕشگێرانی کورد هەریەکەیان ناوچەیەکی پێ سپێردرا. لەکاتی ئەنجامدانی کۆبوونەوەیەک شۆڕشگێران بڕیاریان دا کە یەکێک بچێت بۆ تاران ملتۆزمی و بەدبەختیی ئینگلیزەکان بە سەفارەتەکانی بێگانە بگەیەنێت. نامەکەش بەزمانی تورکی نووسرا. مامۆستا ئەحمەد خواجە دەست نیشان کرا نامەکە بەرێت بۆ باڵیۆزخانەکان لە تاران.

---

١) ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم،ل٣٢-ل٣٣ .

ئەمەش دەقی نامەکەیە بە کوردی کە (کەریم بەگ و سابیر بەگ و ئەمین حەمەی ئیمام) وەک سەرۆکەکانی هەمەوەند ئیمزایان کردووە.

## بۆ باڵیۆزی«[1]»

ئەمریکا. تورکیا. رووسیا. ئیتالیا. فەرەنسا. ئینگلتەرە. سەرەک وەزیرانی ئێران

لەدوای جەنگی ١٩١٤و کوژانەوەی چرای برووزیی عوسمانی بەتەواو بوونی جەنگ نیشتمانی ئێمە کوردستانی خواروو لەسوپاو ئیدارەیان چۆڵ کرا هێزی سوپای ئینگلیز بەهەڵی زانی خۆی هاویشتە ولایەتی مووسڵەوە کوردستانی جنووبیشی داگیرکرد، بەڵام بەو پەیمانەی کەبەپێی پەیمانی (سیڤەر) هەموو حەقێکی قەومیمان بدەنێ و لەکوردستانی جنووبیدا حکوومەتێکی کوردی دروست بکات و هەموو چەشنە یارمەتییەکمان بدەن ئینجا بەتەواوی رێگەی ئینگلیز درا هاتن بۆ سلێمانی.

سێ مانگی بەسەرا نەڕۆیشت بە پێچەوانەی پەیمانەکەیان چ بۆ کاروباری سیاسی و چ ئیداری و چ ئابووری لە: ئینگلیزو ئێران و عەرەب و ئەفغانی و هیندی هەرە پیاو و مەئمورانی هێنا بەناو کیشوەرەکەماندا بڵاوی کردەوە، بەڵام کوردەکان هەر لە دوورەوە تەماشایان ئەکرد ئەو یارمەتییەی کورد بەهیوای بوو ئەو پەیمانەی دابووی کە حکوومەتێک بۆ کورد دروست بکات گۆڕا بەزۆرداری و بێ بەزەیی و ئەو هێزە بێشومارەی کە لە جەنگی گەورەدا بەرامبەر بە تورک و ئەڵمان بەکاری ئەهێنا بەری دایە وێزەی کورد بەکوشتن و سووتاندن، تالان کردن، وڵاتی وێران کرد بەچەشنێک دڵی هەموو ئادەمیزاد بگرییەنێت، زۆر کردەوەی زۆرداری و ناپەسندیان نواند تا هەموو کوردی ناچارکرد بۆ باسی خاک و دارایی و نامووس بەرامبەر بەو ئینگلیزەی کە بەدۆستی کورد خۆی پیشان ئەدا دەست بداتە چەک و داوای مافی خۆی (استقلال) بکات ئینگلیز خۆی کرد بەدوژمنی

---

١- ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی دووەم، ل٣٤-٣٦.

خوێنینی کورد.

لەرۆژی ٢٢ مایس ١٩١٩دا کورد بەچەک کەوتە بەربەرەکانی ئینگلیزەکان بەلام تەنیا بەچەکی تفەنگ و خەنجەر. ئینگلیزیش بێجگە لەتۆپ و فڕۆکە بە هێزێکی کوشندەی ٣٠ تا ٤٠ هەزار سوپاییەوە رۆژی ١٨ حوزیران ١٩١٩ کوردی پەرێشان کردو ئەو حوکمدارەی کە بەفەرمانی خۆیان بۆ کوردستان دانرابوو بەبریندار گیراوی لەگەڵ نزیکەی هەزار مرۆڤ و ئەفسەرانی کورددا کوژران و بەدیلی گیران و بران.

بەبریاری خنکاندنەوە بۆ دەساڵ بەندی حوکمداریان ئاوارەی هیند کرد سێ شەوو رۆژ شاری سلێمانی تالان کرا. لەکۆلانانندا کوژراویان فرێ ئەدا دێهات و کشتوکاڵ. پرد و مزگەوت بە بۆمبا وێران کرا ئاژەڵ بە متراليوزو فڕۆکە بەقڕ هێنرا ژن و پیاوو مناڵ بەهەزاران لەناو ئەشکەوت و سەر چیاکاندا کوژران و مردن، حوکمدار لە بەندییەکەی سێ ساڵ بەسەر نەچوو بەبێ داواو دەنگی کورد لە رۆژی ٢٢ی ئەیلوولی١٩٢٢دا دووبارە بەناوی بەجێ هێنانی پەیمانەکەیانەوە حوکمدار شێخ مەحموودیان لەهیندەوە هێنایەوەو بەناوی حوکمداری کوردستانەوە لە سلێمانی دایان نا ئەمجارەش پەیمانی دروست کردنی حکومەتی کوردستانی بلاوکردەوە.

بەلام ئەو داوایەی کە ئینگلیز لەکوردی ئەکرد لەتوانای کوردا نەبوو کە بەبێ پێویست لە تورکیاو ئێراندا شۆرش هەڵگیرسێنێت ئینجا دیسانەوە لە پاش شەش مانگ کەوتەوە بیانوو بە بۆمبا شاری سلێمانی و دێهات و چیاو دارستانەکان و باخ و رەزی سووتاند وێرانی کرد، لەئادەمیزاد و ئاژەڵ کوشتار لەژمارەنایەت خێزانی کورد بە پیاو - ژن - مناڵ و پیرەوە کەوتنە چیاو ئاوارەی ئەشکەوتەکان بوون. بە رووتی و برسیەتی و گەرماو سەرما ژیان تاڵ بوو. فڕۆکە ماوەو دەرەتانی پەیداکردنی ئازووقەی نەئەدا.

لەئادەمیزاد پەروەری و دڵسۆزیتان تکا ئەکەین، کە دڵسۆزیی خۆتان بەرامبەر بەم گەلە ئاوارەو پەرێشانە پیشان بدەن کە بەهەزاران خێزان لە

چیاکاندا بەبێ پیاوو بەسەختی گوزەران نەکەن و نەژین و پیاوەکانیان بەرامبەر بە بەد بەختی و جانەوەریی ئینگلیزەکان سنگیان ناوە بە بەرگوللەی ناگەهانیانەوە بەبێ بەزەیی لە کوشتاری کورد دەستپاریزی ناکەن چارەیەک بکەن.

کورد ئەیەوێت بگات بەمافی خۆی دەستبەرداری چەک، نابێت تاوەکو ئەم دوژمنەمان لێ دوورنەکەوێتەوە.

**١١/مایس/١٩٢٣**

| حەمە ئاغای عەلی ئاغا | حاجی رەسوول ئاغا | مەحمود |
|---|---|---|
| دیسان | سەرۆکی عەشیرەتی پشدەر | سەرۆکی نەرماندەی گشتی |
| **سابیر بەگ** | **سالەح ئاغای حەمە ئاغا** | **کەریم فەتاح بەگ** |
| سەرۆکی عەشیرەتی هەمەوەند | سەرۆکی عەشیرەتی پشدەر | سەرۆکی عەشیرەتی هەمەوەند |
| **ئەورحمان ئاغای ئەحمەد پاشا** | **سەید کەریم سەید ئەحمەد** | **ئەمین حەمەی ئیمام** |
| لە ئەشرافی سلێمانی | لەساداتی بەرزنجە | لە سەرۆکانی هەمەوەند |
| | **ئەحمەد مەدحەت** | **رضا بەگ** |
| | مەبعوثی رەواندووز | لە ئەشرافی سلێمانی |
| | ٢٨ ناوی تر | |

# ئازادکردنی شاری سلێمانی
# لە ١٩٢٣/٦/١٧

لەدوای نارەزاییەکی زۆر کە سەرۆک هۆزو عەشائیرەکان دەریان بڕی، ئەوە بوو نامەیەکی بایەخداریان دەربارەی ناوچەکەو کورد دا بەو سەفارەتانەی کە باسمان لێوە کرد. بەڵام بەوەندەوە نەوەستان و کەوتنە رقەبەرایەتییەکی توندەوە. هێزەکانیان یەک خست و لە بازیانەوە تا کەرکووک چوونە ژێر فەرماندەیی کەریم بەگەوە. هێزەکانیش ئەمانەبوون: ١- مەحموود دەوڵەتیار هەمەوەند ٢- سەیید محەمەد٣- تۆفیق ئاغای هەمەوەند. وەکو لە کتێبەکەی محەمەد رەسووڵ هاوار‌دا لە لاپەڕە/٥٢٢ هاتووە ئەمانە فەرمان لە کەریم بەگ وەرنەگرن دوای چەند شەڕی خوێناوی لەناوچەکەیاندا مانەوەو تاوەکو دواجار (کەریم بەگ) و هێزەکەی توانییان لە ١٩٢٣/٦/١٧ بچنە ناو شاری سلێمانییەوە، کاربەدەستانی ئینگلیز بەناچاری هەڵهاتن و شاریان بەجێ هێشت.

د. کەمال مەزهەر دەڵێ: (هەر ڕۆژە لەلایەکەوە مۆتەکەی شۆڕشی کورد خۆی نیشان دەدان تا ناچاری کردن دیسان دەست لە سلێمانی هەڵبگرن. ڕۆژی ١٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٣ هێزە چەکدارەکانی ئینگلیز شاریان بەجێ هێشت. ژمارەیەک سەرشۆڕی نیشتمان و رووڕەشی مێژووش کە زراوەتەرەکی تۆڵەی گەل بوون لەگەڵیان شار بەدەربوون. شۆڕشگێرانی کورد بەسەرکردایەتیی کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند بەناوی شێخەوە کاروباری شاریان گرتەوە دەست تاخۆی ڕۆژی ١١ی تەمووز بە سەربەرزی گەڕایەوە)"[١].

د. وەلید حەمدی لەوبارەیەوە دەڵێ:"[٢]" (هێشتا هێزەکانی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٣ سلێمانییان بەجێ نەهێشتبوو کە هێزەکەی کەریم بەگ کوڕی

---

١- د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل١٥٨.
٢- د. وەلید حمدی، کردستان في الوثائق البریطانیة. ص١٧٥.

فەتاح بەگ خۆی خستە ناو شاری سلێمانی و بەناوی (شێخ مەحمودەوە) بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک کاروباری شاریان گرتەدەست، کەریم بەگ جاڕی دا کە خۆی حاکمی سلێمانییەو بەیانێکی بۆ خەڵکی شارەکە بڵاوکردەوەو داوای لێکردن ڕێزی ئاسایش و نیزام بگرن، ڕێزی ئەوکەسانەش کە لەشار ماونەتەوە. هەڕەشەی سزادانی ئەوانەشی کرد، کە لەگەڵ ئینگلیزەکان هاوکاریوون. هەر لەوبەیانەدا داوای لە بازرگانانی تووتن کرد کە ئەوباج و پارانە بدەن کە فرۆشتوویانە یان ناردوویانە بۆ دەرەوەی لیواکە. هەتا شێخ گەڕایەوە لە ١١ی تەمووزی ١٩٢٣ کەریم بەگ توانی (یاساو ئیدارەی ئابووری) لەناوشاردا ڕێکبخاتەوە).

محەمەد ڕەسووڵ هاوار دەڵێ: (لەدواییدا ئەو سەرچاوانەی کەباسی چۆنێتی بەجێ هێشتنی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکان و گەڕانەوەی شێخ مەحموودیان کردووە بۆ سلێمانی هەموویان لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئینگلیز لە ٦/١٧/ ١٩٢٣دا سلێمانییان چۆڵ کردو لەپێشدا هێزێکی کورد بەسەرکردایەتیی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند هاتنە ناو سلێمانییەودو شێخ مەحموود خۆی لە ١٩٢٣/٧/١١دا هاتەوە سلێمانی کە وەکو ئەحمەد خواجە دەڵێ: لەکتێبەکەی ئەدمۆندزیشدا باسی کراوە)[١].

ئەحمەد خواجە دەڵێ: (دوور لە پەنجەو هەناسەی ئینگلیز لە سلێمانیدا حکوومەتێکی پوختی تازەی کوردستان دامەزرایەوە. کەس لەکەس نەنەکەوت. یاساو شەریعەت لە کارابوو. وڵات بووەوە بە بەهەشت. یەکێتی و دڵپاکیی کورد گەڕایەوە، ڕۆیشتووەکان هاتنەوە، لە ژیانێکی ئاسوودەدا ئەبوێران؛ وەزارەتەکەیش دامەزرایەوە.

لەو ڕۆژانەدا کە نرخی شت گران بوو بوو. مەلیک مەحموود بڕیارێکی دەرکرد کە پێویستە هەموو شتێک نرخی بۆ دابنرێت. ئەوانەی شت :ەشارنەوە پێویستە

---

١- (م. ر. هاوار)، بەرگی دووەم،ل٥٢٥-٥٢٦.

لەهەر تیرەیەک یەکێکیان بگرن و سزای بدەن. لە ماوەی دووڕۆژدا دائیرەکان پڕبوون لە فەرمانبەران، شەوگەڕ (چەرخەچی)، قازی، یاسا، حکوومەتی کوردستان هەمووی کەوتەوە گەڕو نیش و کاری خەڵک بەباشی بەڕێوە دەچوو«[1]»). بەم جۆرە بۆماوەیەک ژیان ئاسایی بوو لەشاری سلێمانی و دەوروبەری، مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ: (لەچوار پێنج مانگی دوواییدا ئینگلیزەکان زانییان کەدۆستە کوردەکانیان ناتوانن ئاژاوەو یا پشێوییەک بەریا بکەن جارجارێک، بۆ ژیان تاڵ کردنی دانیشتوان چەند فڕۆکەیەکی ئەنارده سەر سلێمانی و ژن و منداڵ ئەکەوتنە ترس و ئاوارەیی دەشت و کێو«[2]»).

وێڕای ئەوەش کەیان لەعەشایەرو هێزەکانی شێخ مەحموود ئەکرد حاجی شێخ عارف سەرگەڵوو ئاوێتەی پیلانەکانی ئینگلیزبوو بۆ دژایەتیی شێخ مەحموود.

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ: (بەراستی حاجی شێخ عارف، پیاوێکی بەڕێزو خاوەن جەوهەرو قۆناخ و پیرۆزە، کەڵکەڵەی، ئیستقلالی ناحیەی سوورداشیان خستە پێش، لەفەرماندەی شێخ یووسف، مدیری ناحیەی سوسێدا لەشکرێکی زۆری نارده (یالانقوز) و (قەرەچەتان) و داوای جیابوونەوەیان کرد بەم بۆنەیەوە نامەی شێخ مەحموود بۆ حاجی شێخ عارف لەگەڵ مەلا رەسووڵی خوردەلووکیدا بۆی ناردو راسپێرێکی زۆریشی کرد بەلام بێ وەلام مایەوە.

### زۆر محترم خاڵە شێخ عارف:

دەستتان ماچ ئەکەم، ئێوەم بەقەلایەکی بەرزو سەخت داناوە بۆخۆم، بەقسەی مامۆستاکەت بزووتنەوە مایەی رەچەڵەک براننەوەمانە بەهیوای گەلی کورد خستنە ژێر پێی ئەدمۆندز کار تەواونابێت، ئەبێت بەهەموومان کۆسپی بەدی

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم، ل٤٦-٤٧.

٢- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، ل٤٨-٤٩.

کورد لەناو ببەین مەبن بەهەوێنی خوێن ڕژاندنی لادێیی هەژار بفەرموون لەشکرەکە بڵاوە بکاتەوەو لەچ جێگایەک ئەفەرموون ئامادەم بێمە دەست ماچ کردنتان.
مەحموود

**٢٥ی مایس ١٩٢٤**

زۆر چاوەڕێی وەڵام کــــرا، دوایی بڕیار بەناردنی لەشکرێک درا بۆ بڵاوەکردنەوەی هێزەکەیان، ئەم لەشکرە بەم جۆرە نێررا:

سابیر کەریم بەگ هەمەوەند – بە ١٥٠ سوارەوە

مەحموود خاتر سمایل عوزێری بە ٣٠ سوارەوە

ماجد سوارەی سوپایی بە ٥٠ سواردوە و ٢٠ ئێستر سوار

ئەم ١٥٠ چەکدارە سوارەیە لەگەڵ ڕۆژا گەیشتە سەرمەکۆکەیان، پاش جەنگێکی دووسێ سەعاتی، بەبریندارکردنی برایەکی شێخ یووسف و گرتنی کوێخاکەی (یالا نقۆز) دوایی هات. جا ئەمە وێنەیەک بوو لەو کەسانەی کە ئینگلیزەکان ئەچوونە بن کلێشەیان بەپارە خوێنی ئەڕشتن و ئەیان توانی تەفرەیان بدەن"[1]). هەروەها دەڵێ (ڕۆژی ٢٣ مایس ١٩٢٤ فڕۆکەی ئینگلیز دەستی کرد بەهاتوچۆو هەڕەشە، ئاژاوەی خستەوە ناو وڵات و ئەم بەیاننامەیەی لەسەر سلێمانی فڕێ دا: کە چەشنی بەیان نامەکەی پێشوویەتی:

## اعلان بۆ شێخ مەحموود افندی
## و
## خلق سلێمانی

خەبەرتان بێت کە ئەگەر لەپێش ڕۆژی یکشەنبە، بیست و پێنج ام مانگە مطابق بیست و یکم شوال شێخ مەحمود افندی لچمچمال یان لکرکوک دخالت بکات بومباردنی مرکز لسلیمانی اجراء ناکرێت بلام ئەگەر حتی او وقتە دخالت نکات بومباردنێکی شدید واقع دەبێت.

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)بەرگی دووەم ل٥٦-٥٧.

بۆ ئەوەی بەبێ کەم و زیاد بکەوێتە پێش چاوی خوێندەوارە بەڕێزەکان، بە زینکغراف دەرهێنراو پیشان درا. جا بەدوای ئەم بەیاننامەیەدا چوار ڕۆژ پتر مۆڵەتیان دا، بەڵام ئەم هەڕەشەی گیان کێشان و وێران کردنە لەکوێ و لەلایەن کێ کراوە، نازانرێت. تەنیا فڕۆکەی ئینگلیز پەیام و نێرراو بوو، چونکە بەیاننامەکە بێ ناوبوو«[1]»). شێخ مەحموود ڕۆژی ١٩٢٤/٦/٢٦ گەیشتە سەنگاو بەنیازی ئەوەی بچێت بۆ چەمچەماڵ.

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ: (ڕۆژی ٢٦) گەیشتە سەنگاو کە هەموو شێخان و پیاوە ناسراوەکان یان مووچەخۆری ئینگلیز بوون. ئیتر ئەدمۆندز یا ئینگلیزەکان هەموویان بەهەلیان زانی و بەتوندی سلێمانییان بۆردومان کرد. کۆلانانیش پڕ بوو لەلاشە: بەبێ ماوەدان هەمیشە چوار فڕۆکە لەسەر شارە بێوڵەتەکە بۆمبای فڕێ ئەدا. ڕۆژی ٢٨،٢٧،٢٦ حوزەیرانی ١٩٢٤ سلێمانی لەژێر بۆمباو ئاگردا ئەژیا.

هەروەها دەڵێ: بەبیستنی بۆردومان کردنی سلێمانی شێخ مەحموود گەڕایەوە«[2]». لە تەنگیسەرەوە ئەم نامەیەی نارد.

**کوڕی خۆم ئەحمەد** «نووسەری چیم دی»

ئەوا ئەمجارەیش کەوتینەوە ژێر بۆمبا. زوڵمی ئینگلیز گەیشتە ئەوپەڕی بێ ویژدانی. ئەچمەوە بۆ شارەوێران و لێ قەوماوەکەمان. سبەینێ ئێوارە وەرەوە بم بینە)«[3]».

**مەحموود**

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم، ل٥٧-٥٨.

٢- شێخ مەحموود ئەچوو بۆ چەمچەماڵ و کەرکووک، ئەویش بەهۆی بۆردوومانی سلێمانی. هەر بۆیە لەرێگا گەڕایەوە.

٣- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم ل٦١.

## ١٣ی تەمووز ١٩٢٤

محەمەد رەسووڵ هاوار دەڵێ: (شێخ بابە عەلی شێخ مەحموود دەربارەی بۆردومانەکەی ئەو رۆژانە بۆی باس کردم کە: «لە هاوینی ١٩٢٤دا فرۆکەکانی ئینگلیز هەروەکو بۆردومانەکەی ساڵی ١٩٢٣ هەر لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە بۆردومانی ناوشاری سلێمانییان دەکردو خەڵکەکە ناچار بوون لەبەیانیی زووەوە ناوشاریان بەجێ دەهێشت و روویان دەکردە گردی سەیوان و دێهاتەکانی دەوروپشتی سلێمانی. هەتا وای لێ هاتبوو سەگەکانی ناوشاریش فێربوو بوون لەگەڵ خەڵکەکەدا کە فرۆکەی ئینگلیز دەهات ئەوانیش رایان دەکردە دەرەوەی شار».

شێخ رەئووفی شێخ مەحموود لەیاداشتەکانیا دەربارەی ئەو رۆژانە دەڵێ:

«کە فرۆکەکانی ئینگلیز پەیتا پەیتا دەستیان کرد بە بۆردومانی سلێمانی ئیتر باوکم چاری نەماو بڕیاری دا بچێتە دەرەوەو لەدەرەوەی شار رووبەڕووی ئینگلیزەکان ببێتەوە. شێخ قادری مامم و حەپسە خانی نەقیبی ژنی، چوونە گوندی (تەنگیسەر) لە قەرەداغ «هەندێک لەوانەی کەسەر بەئینگلیزەکان بوون لەگەڵ خۆیانا بردیاننە تەنگیسەر. حەپسەخان بڵاوی کردەوە کە سەر بەشێخ مەحموود نییەو لەگەڵیا نییەو شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەم: شێخ عەبدولقادری گۆیتەپە گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان و شێخ عەبدولڕەحمان لەگوندەکەی خۆیدا خۆی توند کرد، بەڵام جووڵەی نەکرد بۆ هاوکاری کردن کە ئەمانە لەساڵی ١٩١٩دا هەموویان لەگەڵ باوکما بوون و ئەوسا تەنها بابەکری سەلیم ئاغا هەبوو کە دژی بێ لەگەڵ خانمی ژنی وەسمان پاشای جاف)»[١].

دەربارەی داگیرکردنی شاری سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە مامۆستا عەلائەددین سەجادی دەڵێ: (هێزی حکوومەتی عێراقی بەهێزی عەسکەری لیوی و هێزی هەوایی بەریتانییەوە رووبە وڵاتی سلێمانی کەوتنە جمەجووڵ. سەرەتای شەڕ هەر لەدەوروبەری (چەمچەماڵ و دەربەندی بازیان) دامەزرا. لەبەر

---

١- (م. ر. هاوار)، بەرگی دووەم، ل٥٥٠.

ئەوە دەستێکی نهێنیش لەژێرەوە لەوڵاتی سلێمانی ئیشی هەر ئەکرد. لەشکری (شێخ مەحموود) لەگەڵ ئەوەشدا کە پیاوانی وەکو کەریم بەگی فەتاح بەگ و سابیری کەریم بەگیشی هەبوو هەر توانای گێڕانەوەی ئەو هێزانەیان نەبوو.
لە دواییدا لە (١٩ی تەمووزی ١٩٢٤)دا شێخ مەحموود سلێمانیی بەجێ هێشت و عەسکەری عێراقی و ئینگلیزی سەر لەنوێ شاری سلێمانییان گرتەوەو ئەم جارە بەهەموو توانایەکیانەوە کەوتنە قایم کردنی وڵاتی سلێمانی و دەرەوەی و وردە وردە رەگی خۆیانیان تیا داکوتا. ئەمجا هەر بەقسەی ئینگلیز حکوومەتی عێراق موڵکەکانی (شێخ مەحموود)ی هەموو زەوت کردو بەیانی دەرکرد کە ئەم موڵکانە مافی (شێخ مەحموود)یان پێوە نییە.
(شێخ مەحموود) کە سلێمانیی بەجێ هێشت رووی کردە وڵاتی (جاسەنە). لەبەر ئەوەی شێخ مەحموود ئەو مەرجانەی کە بۆی دانرابوو جێبەجێی نەکردن و نیازی خراپەکاریی هەبوو، لەبەر ئەوە بڕیاردرا لەم لاوە تا پێنجوێن هەر بەناوی حوکمدارییەوە دەستی بۆ نەبرد، کە هێزی حکوومەت ئەچووە سەری لەشکرەکەی ئەچووە ئەشکەوتەکانەوە و ئیتر ئەوان هیچیان پێ نەئەکرا)»[1].
هەروەها ئەدمۆنز دەربارەی رووداوەکانی و هەڵوێستی ئەو رۆژانە دەڵێ: (کەرکووکم بەجێ هێشت و چوومە کفری، لەوێ تەلەگرافێکی مەندووبی سامیم پێ گەیشت کە وتبووی: لەبەر ئەوەی بڕیاردرا بەهێزی ئاسمانی سلێمانی بۆردومان بکرێ کە من (ئەدمۆنز) دەمێک بوو لەسەر ئەو باوەڕە بووم کە دەبوایە زۆر زوو ئەمە بکرایە کە بڕیاروابوو لەجەژنی میلادی ١٩٢٣/١٩٢٤دا بکرایە. بەڵام ئەم جارە بۆ بۆردومانی سلێمانی فڕۆکەکانمان لەهەولێرەوە هەڵدەستان نەک لە کەرکووکەوە کە کارەکە زۆر بەنهێنی دەکرا.
دوو فڕۆکەمان لەکیس چوو، یەکەمیان ناچاربوو لەنزیک سلێمانییەوە بنیشێتەوە لە (تاسڵووجە) بەڵام توانرا فڕۆکەوانەکە بەهۆی فڕۆکەوانی

---

١- عەلائەددین سەجادی، مێژووی کوردو کوردستان، ل١٠٤-١٠٥.

فرۆکەیەکی ترەوە هەڵکێشرێ و رزگاری بکرێ (...) بێجگە لەو دوو فرۆکەیە، دوو سێ فرۆکەی تریشمان لەو عەمەلیاتەدا ناچار بوون بگەڕێنەوە بۆ بنکەکەی خۆیان.

(کنید)ی فڕۆکەوان توانی ماڵی شێخ مەحموود بۆردومان بکا و بۆمباکە بەردەرگاکەیان کەوتبوو و بەسەر سلێمانیدا بەیاننامەی بڵاوکردەوەوە. لەو بەیانەدا ئاگاداری شێخ مەحموود کرا کە بەرپرسیار دەبێت بەرامبەر ئەو دوو تەیارەیەی کە نیشتبوونەوە کە لەدواییدا یەکێکمان دەست کەوتەوەو ئەوی تر کەریم بەگی هەمەوەند سووتاندبووی. بەو جۆرە دەس بەسەر سلێمانیدا گیرا)«[1]».

## بۆردومانی شاری سلێمانی

لەسەر بۆردومانی شاری سلێمانی و رۆڵی کەریم بەگ لەم بۆردومانەو بەرگری لەبەرامبەر تەیارەی دوژمن ئەدمۆندز بەروونی باس دەکات«[2]».

خوا لێ خۆشبوو شێخ لەتیف کوڕی شێخ مەحموود لەیاداشتەکەیدا دەڵێ (دوای ئەوەی کە شێخ و پێشمەرگەکانی سلێمانییان چۆڵ کرد، ئێمەی منداڵ و ئافرەتان خرابووینە ناو ئەشکەوتی (وێڵەدەرە)وە. من بۆ ئەوەی باوکم ببینم بەبێ پرسی دایکم و شێخ سەمەدی دایەنم هاتمە سلێمانی. کاتێک گەیشتمە قەراغ شار، ماڵ و کۆچێکی زۆرم بینی شاریان بەجێ دەهێشت. گریانی ئافرەت و هاواری منداڵ، تابلۆیەکی ترسناک و غەمناکی نەخشاندبوو. شارەکە دوای چۆڵ کردنی جگە لە سەربازانی کوردستان و پاسەوانان کەسی دیی تێدانەبوو پاسەوانەکان منیان بردە لای سەرۆکی هێزەکە کە سەید محەمەدی موفتی و کەریم بەگی فەتاح بەگ بوو. پاش ماوەیەک دایەنەکەم و چەند چەکدارێک هاتن بەشوێنمدا بەڵام من بۆ باوکم دەگریام دەموت ئەچم بۆلای باوکم. کەریم بەگ

---

١- (ادمۆندز، ک. ت. ع) ل٢٣٨ .

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٨.

وتی: پێویستە ئەم منداڵە لەشاردا نەمێنێت چونکە بەیانی هێزی پەرەشووت دادەبەزێت و ئێمەش ئامادەی شەڕێکی گەورەین. منیان بەرەو (جێشانە) رەوانەکرد. بەیانی ٣١ مایسی ١٩٢٤ سەعات شەشو نیوی سەر لەبەیانی، هەژدە فڕۆکە بەرەو سلێمانی هاتن و دەستیان بە بۆردومان کرد. ئەو فڕۆکانە کە دەگەڕانەوە ئەوەندەی‌تر دەهاتنەوەو، بۆردومانیان دەکرد. بەم شێوەیە سێ ڕۆژ بۆردومان دەوامی کرد. ژمارەیەکی زۆر پیاوی پیرو منداڵ و ئافرەت کە نەڕۆیشتبوونە دەرەوە بەرکەوتن و کوژران. دوای چەند ڕۆژێک بەلای شاردا گەڕامەوە بۆ (وێڵەدەر) بۆ ئەوەی بڕۆم ئەو شارەی کەسەرچاوەی ئازایەتی و ئەدەبیات بوو. زۆر لای رووخابوو. ماڵێک نەدەبینرا کە زیانی پێ نەگەیشتبێ. ئەمەش یەکێک بوو لەو دیارییانەی ئینگلیز بۆ گەلی کوردی هێنا)»[1]

دەربارەی ئەم بۆردومانە و خۆڕاگریی کەریم بەگ، شاعیری نیشتمان پەروەر (حاجی میرزا عەبدوڵلا)ی سەقزی ئەم پارچە هۆنراوەی داناوە کە دەڵێ:

**یاران بەخودا ئەمڕۆ کە ئەوقاتی دوعایە**
**بۆزاتی (مەلیک) چونکە شەو و رۆژ لە غەزایە**
**تەییارە هەموو لەحزە لە کەرکووک و لە بەغدا**
**بۆ کۆمەکی ئینگلیزە بەچەرخە لەسمایە**
**هەردێت و دەچێ خۆی دەنوێنێ بەهەموو رەنگ**
**قابیل نییە ئەم ئیشە هەموو مەیلی خودایە**
**بۆ دەفعی بەلا حەزرەتی (عوثمانە) دوعا کۆی**
**دڵ دۆزی (عەدو) تیری عەلی شێری خودایە**
**بۆ چەتری سەری حەزرەتی کاک ئەحمەدە دایم**

---

١- شێخ مەحموود شێخ کاوە حەفید، یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل١١٧-١١٨.

دوژمن بە مەلیک دوژمنی دۆستانی خودایە
بۆ کۆمەک و یەک رەنگی خودا حەقیقە کەریم بەگ
بێ میسل و نەزیر بوو لە جیهاندا کە وەهایە»[1]

پاش ئەنجام دانی زنجیرەیەک هێرشی تر بە فڕۆکە، ئینگلیزەکان توانییان رۆژی ١٨ی تەمووزی ١٩٢٤ شاری سلێمانی داگیر بکەنەوە»[2].

مامۆستا محەمەد رەسووڵ هاوار دەڵێ (لەو راپۆرتەی کە حکومەتی بەریتانیا ناردبووی بۆ (عصبة الامم) کە تەرخان کراوە بۆ ماوەی نیسانی ١٩٢٢ هەتا مارتی ١٩٣١ باسی بۆردومانەکانی سلێمانی و دەوروبەری هەڵەبجە و هەندێ شوێنی تر دەکاو لەو راپۆرتەدا دان بەوەدا دەنێ کەبەهۆی ئەو بۆردومانانەوە لە ٢٥ی مایس ١٩٢٤دا دانیشتوانی شاری سلێمانی کە بیست هەزار کەس بوون تەنها حەوت سەد کەسی تیادا مابووەوە)»[3].

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ: (شێخ مەحمود پرۆگرامێکی پێ سپاردم کە بیگەیەنم بەم ناوانەی ژێرەوە. بەبێ وەستان لەماوەی ٢٤ سەعاتدا بەجێ هێنرا. پرۆگرامەکەیش بۆ مەبەستی بەرگری بوو لەشاری سلێمانی لەبەرواری

---

١- د. کەمال مەزهەر دەڵێ: خاتوو (بێل) کە ئەوساکە لەساڵی ١٩٢٢ سکرتێری نوێنەری باڵا بوو لە بەغدا بەبۆنەی کریسمس و جەژنی سەری ساڵی نوێوە نامەیەکی بۆ باوکی ناردووە لە لەندەن باسی ئەوەی کردووە چۆن سەرکردەی هێزی ئاسمانیی بەریتانی لە عێراق مارشاڵ (موهیب روکن) سێرجۆن ساڵمۆن ویستوویەتی سەری شێخ مەحموود بکاتە دیاریی دەستی خۆی بۆ لەندەن بەبۆنەی سەری ساڵی نوێوە کە زۆر بەنزمی چۆتە سەر ماڵی شێخ مەحموودو بۆردومانی کردووە، وای زانیوە بۆردومانەکەی کاریگەر بووەو بە دڵخۆشی گەڕاوەتەوە.
خاتو بێل لەنامەکەیدا دەڵێ: شێخ مەحموود خۆی رۆژی داهاتوو بەبرووسکە بەغدای ئاگادار کردووە کە لەسایەی خواوە تەندروستی باشەو تێ ناگات بۆچی سلێمانی بۆردومان کرا. بڕوانە: گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢٦، ساڵی ١٩٩٥، ل٨. وتارێک بەناونیشانی گاڵتەوگەپ و گەمەکانی نێوان شێخ مەحموود و فڕۆکەوانە ئینگلیزەکان.
٢- بڕوانە: شێخ مەحموود لە شیعری کوردیدا، ئامادەکردنی لەتیف بەرزنجی، ل٩٢.
٣- (م. ر. هاوار)، بەرگی دووەم، ل٥٥٢.

١٤ی تەمووز ١٩٢٤ کە بەم شێوەیە بەرگری بکرێت:
١- ماجید بەسوارەی عەسکەرییەوە: پشتی تەپەشوانکارە. تاسڵووجە
٢- سابیر بەگ بەسوارەی هەمەوەند: پشتی ئەلایی. تاسڵووجە
٣- محەمەد خاتر بەسوارەی سمایل عوزێری: پاشداری ماجید
٤- حەمە ئاغاو خەلیفە یوونس بەسوارەی
پشدەری و جافەوە: پاشداری سابیر بەگ.
٥- ئەحمەد خواجەو میرزا شەل بە سوارەکانی
خۆی و مەندمی لەگەڵ هەموو پیادەی بازیان لەدەروێشان و گردە سپی پێشدار ئەبن و یەکەمین جار
بەرەنگاری دوژمن ئەبن.

هەروەها دەڵێ: (بۆجێبەجێ کردنی پرۆگرامەکە لەشکر ئامادەکرا و ئێوارە گەیشتینە تەپەشوانکارە و مەلا عەلی و دوو سوارم نارد بۆ تاسڵووجە داخەکەم کەس نەهاتبوو) هەروەها دەڵێ: (کەبازیانم بەجێ هێشت گەیشتینە شارباژێر - دێی سیتەک - زانیمان بارەگا لە قەڵاچوالان: ماجیدو سوارەی سوپایی: لەتەکەران، چووم ماجیدم بینی و هۆی گۆرینی پرۆگرامەکە چی بوو پرسیارم لێ‌کرد.
وتی: لەسەری تاسڵووجە جەنگ کردن لەناوچوونی هەموومان بوو چونکە سوارە بەرامبەر بەپیادەو فرۆکە ناتوانێت بجەنگێت، چیاکە رووت و بێ پەنایە، من چووم بۆ ئەشکەوتەکانی، (کەڵەوانان): شەو لە : کەندەکەوە گاڵەمان پێکردن لەدوایشدا ئاگرمان نا بە پووشەکەوە، زۆر شپرزەی کردن، ئێمە بە ئاسۆرەوە گەڕاینەوەو ئەوانیش بە ئاواتەوە گەیشتن و چوونە سلێمانی. قەیناکا تۆفیق ئەفەندی برینداره)[١].

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم ل ٦١-، ٦٤

## بارەگای شۆڕشگێڕان لە ١٦ی تەمموزی ١٩٢٤ گواسترایەوە بۆ قەڵاچوالان

ڕۆژی ١٦ی تەمموز/١٩٢٤ شێخ مەحموود سلێمانیی بەجێ هێشت"[١]" هەموو ئەوانەی لەگەڵ شێخ مەحموود بوون بنکە و بارەگایان لەقەڵاچوالان و دەوروبەری دامەزراند.

ئەحمەد خواجە دەڵێ: (لە قەڵاچوالان چاوم بە شێخ مەحموود کەوت فەرمووی: بەهێزین سوپامان یەک ڕەنگە ئەو گەلەی گیان نەدا ماف ودر ناگرێت. تا چەمچەماڵ بەسوارە و چیاکان بەپیادە تەنراوە تا دواکەس، نەجەنگین، ئێمە لە ئیمڕۆوە مێژووی کورد دا ئەنێین. چش لەڕابوردوو).

پاشان دەست کرایەوە بەڕێکخستنەوەی هێزەکان، بەپێی برووسکەی ژمارە (١) لە ١ی ئاغستوسی ١٩٢٤ سابیر بەگ کرا بە فەرماندەی ناوچەی بازیان"[٢]".

هەروەکو لە ڕۆژنامەی ژیاندا هاتووە بەم شێوەیە (شەوی ١٥ی مانگ تاقمێک چەکدار لەژێر فەرمانی سابیری کەریم بەگ و ئەمین حەمەی ئیمامدا لەتاوبرسێتی چوونەتە (قەرەتۆغان) لەپاش نان خواردن لە (ئولوبە) وە تێدەپەڕن لەوێ تووشی وڵاغەکانی (ڕەشید حاجی فەتاح) دێن کە لەچادردا بوون لەم فرسەتەدا وڵاغەکان ئەدەنە پێش خۆیان و ئەچنە (هەزارمێرد) حکوومەت هەر کەبەمەی زانی و لەحاڵ ئاگاداربوو دەست بەجێ لەسەر ئەمری عالی (متەسەریف) مەفرەزەیەکی پۆلیس لێرەوەو قووەتێکی تریش لەمەرکەزی ناحیەی سەرچنارەوە هێرش ئەکەنە سەریان ئەم دوو مەفرەزەیە چواردەوریان ئەگرن

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم ل٦٤.
٢- هەمان سەرچاوە، ل٦٥ - ٦٦.

و نەیان دەنە بەر دەستڕێژی گوللەو لەنەتیجەی پێکدادانەدا بەشێک لە ولاغەکان ئەگێڕنەوەو دووانی ناوداریان لێ ئەکوژرێ لەپۆلیسەکانیش یەکێ ئەکوژرێ چەکدارەکان کە ئەبینن تەنگیان پێ هەڵ چنراوە ئیتر بەرگرییان پێ ناکرێ و بەرووکاری (بەرانان)دا رائەکەن لەلایەنی هێزەکەوە بەتەعقیب لەدەوری (خێوەتە) ئابڵوقە دران، لێرەوە دیسان بەشێکی تەواو لەعەسکەرو پۆلیس رەوانە کران، ئومێدی هێزەکە وابوو کە کەسیان رزگار نەبێت و هەموویان بگیرێن و خاتیمە بە حەیاتیان بێت) تاوەکو ئێرە لەرۆژنامەی ژیاندا هاتووە بەداخەوە لەبەر کۆنی و رزیویی رۆژنامەکە ژمارەو مێژووەکەمان نەزانی؟.

حاجی ئەحمەد فەتاح هەمەوەند کە تەمەنی هەشتاو پێنج ساڵەو لە هەولێرە بەتەواوی باسی ئەم شەڕەی بۆم کرد کە خۆی ئەوکاتە ماڵی باوکی لە سلێمانی بووە، ئەو هێزەی سابیر بەگ لەگەڵ ئەمینی حەمە ئیمام لەگەڵ ئینگلیزەکان شەڕیان کردووەو ڕەشید حاجی فەتاح سەربەوان بووە دەڵێ بەڵێ لە هێزی سابیر بەگ حەمە شەریف ئەریمان کوژرا لەوان کوشتار زۆربووە شەش بار ئێستر بەفیشەک و کەلوپەل کەوتە دەست سابیر بەگ دوو کوژراویان بەتفەنگەوە بەجێما لە دێی (خێوەتە).

# شەڕی بناری گۆیزە لەساڵی ١٩٢٤ دا

هێرشە دووقۆڵییەکانی عێراق و ئینگلیز بۆ ناوچەکانی کوردستان و بەردنگاری قارەمانانی کورد بەرامبەریان خۆی لەخۆیدا لەخۆڕا نەبووە، بەڵکو بۆ رزگاریی کورد بووە. هەربۆیە بە یەک دڵی و یەک گیانی خۆیان بەخت کردووە. کەریم بەگی فەتاح بەگ و سابیری کوڕی لەشەڕەکاندا سەرکردەی مەیدانی بوونە بەڕێز ئەحمەد خواجە خۆی لەڕووداوەکانا بووە بۆیە بەگرنگمان زانی وەکو خۆی بڵاوی بکەینەوە.

لەم شەڕەدا (سوارەی سوپایی و عەشایر هەر تیپە لە جێگا پێسپێرراوی خۆیدا بەرامبەر بەهێزو دەسەڵاتی حکوومەت ئامادەو چاوەڕێی لێدانی دوژمن بوون.

لەشارەزوورو قەرەداغ، لەهەر چوار لای سلێمانیدا ماوەی دامەزراندنی حکوومەتیان نەئەدا و دەسەڵاتداریان، هێزە ئاشوورییەکەی لیڤی لەچوارتا بەدڵ شکاوی و سەرشۆڕی قەتیس مایەوە داوای فڕۆکەیان کرد تاکو لە ژێر باڵیدا بۆ سلێمانی بگەڕێنەوە.

فەرماندە ئینگلیزەکە بە قوماندانی لیڤییەکەی وتبوو: «ئایا ئێوە بەبەرگی کوردییەوە هاتن بۆ گرتنی شێخ مەحموود و دوایی پێهێنانی شۆڕشی کورد، یان بۆ فێربوونی چەکبازی لە کوردەکانەوە؟!».

لەگەڵ گزنگی هەتاودا دوو فڕۆکەیان بۆ هات بەنیگەهداریی فڕۆکەکان روو بە سلێمانی چوارتایان بەجێ هێشت، لەبناری گۆیژەدا بەرەنگاری سوارەی هەمەوەند(سابیر) بوون گاڵەیان پێکردن. چونکە فڕۆکە توانای هیچ کارێکی پێنەئەکرا تانزیکەی بانگی ئێوارە جەنگ بەگەرمی درێژەی بەست لەتاریکیدا سوارەکان کشانەوە بۆ (سیتەک)و ئەوانیش لە (ئەزمەڕ)ەوە سەریان دەرکرد، لەهەمەوەندەکان ٤ بریندارو ٦ ئەسپ کوژرا، لە ئاشوورییەکان: بریندارو

کوژراویان بەجێ نەما: بەڵام بەپێی نامەی باوەڕپێکراوان لە سلێمانی ٢٠ کوژراو و ٣٠ برینداریان هەبووەو لە پاشدارەکەیان ١٠ ئێستر لەباری فیشەک و کەلوپەلەوە گیرابوو، لەم جەنگەدا خوێن ڕژاندن و ترسناکە فرۆکە نەیتوانی هیچ چەپۆکێک بوەشێنێ)»[1].

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم، ل٨٩-٩٠ .

## بڕیارێکی ئەنجومەنی وەزیران لە ١٩٢٥داو هەڵوێستی بەریتانیا بەرامبەر بەکەریم بەگ

د. عەبدولسەتار تاهیر شەریف لە گۆڤاری (ڕەنگین)ی ژمارە (٣٧)ی ساڵی (١٩٩١) لەڕوونکردنەوەیەکدا چەند بڕیارێکی ئەنجومەنی وەزیرانی ساڵی (١٩٢٥) کە بە فیتی (نوێنەری حکومەتی بەریتانی) بۆ کوشتنی (شێخ مەحموود و کەریمی فەتاح بەگ و سابیری کوڕی کەریم بەگ) داویانە بەم شێوەیەی خوارەوە روون دەکاتەوە:

(«ڕۆژی شەمە ڕێککەوتی (١٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٥) ڕێکەوتی (٢١)ی ذی القعدە ساڵی ١٣٤٣ی کۆچی ئەنجومەنی وەزیران لەکاتژمێری دوانزەی نیوەڕۆ لەدیوانی ئەنجومەنی وەزیران کۆبووەوە. بەسەرۆکایەتیی خاوەند (فەخامە) جەنابی یاسین پاشای هاشمی سەرەک وەزیری بەرگری، لەم کۆبوونەوەیەدا ئەم وەزیرانە بەشدار بوون:

ساسۆن ئەفەندی حزقێل وەزیری دارایی، ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری وەزیری ئەوقاف، موزاحم بەگ پاچەچی وەزیری ئیشوکارو هاتوچۆکردن و جێگری وەزارەتی دادپەروەری، حاجی عەبدولحوسێن چەلەبی وەزیری زانیاری، لەم کۆبوونەوەیەدا جەنابی مستەر (کۆرنوالیس) ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆش ئامادەبوو. لە ئەنجامی کۆبوونەوەکەدا ئەم بڕیارانە دران:

بڕیاری یەکەم....

بڕیاری دووەم.....

بڕیاری سێیەم....

بڕیاری چوارەم: نووسراوی جەنابی ڕاوێژکار (موعتەمەدی سامی) لە عێراق ژمارە «بی. ئۆ ٢٢»ی (٨)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ خوێندرایەوە دەربارەی خەڵاتەکانی کەتەرخان کراون بۆ ئەو کەسانەی کە هەندێ کەس لە سلێمانی بکوژن یان بیانگرن، خەڵاتەکانیش سەد هەزار ڕوپیە، ئەم سەد هەزارەش دابەش دەکرێ بەم جۆرە: شەست هەزار ڕوپیە بۆ ئەو کەسەی شێخ مەحموود بگرێ و بیست هەزار ڕوپیەش بۆ ئەو کەسەی کەریم بەگی هەمەوەند بگرێ، هەروەها

بیست هەزاریش بۆ ئەو کەسەی (سابیر بەگ) بگرێ، یان چوار یەکی ئەم خەڵاتە بۆ کوشتنی هەر یەکێ لەمانە. دانیشتنەکە کات ژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ تەواو بوو لە لاپەڕە (٦٤-٦٥)ی مەحزەری ئەنجومەنی وەزیراندا تۆمارکراوە)»[١].

لەو سەردەمەدا لەهەمووی پڕ ماناتر ئەوەیە کە مەجید یەعقووبی[٢] نامەیەکی هەڕەشەی تایبەتیی لە کەریم فەتاح بەگی هەمەوەندو سەیید ئەحمەدی جەبارییەوە بۆ هاتووە کە تێیدا ئاگاداریان کردووە بێت و شار بەجێ نەهێڵێ ئەی کوژن. مەجید یەعقووبی لەتاوا بەخاوو خێزانەوە ڕۆژی ٢١/ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٥ کەرکووکی بەجێ هێشت و بەپەلە پرووسکێ گەیشتە بەغدا. ئەم جۆرە هەڵوێستانە خوێنی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو سابیری کوڕی لای ئینگلیز کردە کاسەوە، بەڕادەیەک بەتایبەتی بۆ کوشتنیان بەفڕۆکە کەوتنە تاقیبی هەردووکیان. ئەمە دەقی بروسکەیەکی بنکەی هێزی ئاسمانیی بەریتانییە لەسلێمانی کە ڕۆژی ٢٦ی ئەیلوولی ١٩٢٥ لەوبارەیەوە داویە بە فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە بەغداد. چالاکییەکی فڕۆکەوانی سەعات پێنج و چل و پێنج دەقیقە بەکاتی ناوخۆ پێنج فڕۆکە چوونە سەر خانەقین و ناوچەی ڕووباری تانجەرۆ بۆ گەڕان بەدوای کەریمی فەتاح بەگ و سابیردا. هیچ وەدی نەکرا. سەعات حەڤدەو نیو بەکاتی ناوخۆ سێ فڕۆکەی تر چوونە سەر کانی گوڵەو جێشانەو هەزارمێرد، دیسان بۆ گەڕان بەدووی کەریمی فەتاح بەگ و سابیردا. لەهەزارمێرد سێ ئەسپ بینران، دەس ڕێژیان لێ کراو یەکێکیان پێوەبوو»[٣].

---

١- گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە ٣٧، ساڵی ١٩٩١، ل (٣٨-٣٩) - ڕوون کردنەوەیەکی د. عەبدولسەتار تاهیر شەریف.

٢- لەبواری سەرکوت کردنی کوردا لەوڕۆژانەدا میری مەجید یەعقووبی کردبووە (موتەسەریف)ی کەرکووک کە وەک باوە کوشتەی شێخ مەحموود وابوو. بڕوانە، کەمال مەزهەر، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٦)، ساڵی ١٩٩٥، ل٩.

٣- د. کەمال مەزهەر، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٣٦، ساڵی ١٩٩٥، ل٩-١٠.

# کەریم بەگ لە میانەی ساڵی ١٩٢٥دا

(مامۆستا محەمەد رەسووڵ هاوار لەباسی دۆکیۆمەنتی ژمارە:

C.0.730-78 رۆژی ١٩٢٥/٩/٣ برگـە ٤٨١ تیـادا هاتووەکـە: یاخی بووەکـان لە قـەرەداغ و سـەنگاو هێـرش دەبەنە سـەرناحـیـەی (گل) لە ١٩٢٥/٦/٢٧دا. سەید مـحـەمەد جەباری بەخۆی و (٥٠) سوارو پیادەوە هێرشی بردە سەر (گل)، بەڵام زیان نازانین چیـبووە. شەوی ١٩٢٥/٩/٢٩ نزیکەی (٣٠٠) سوار کە سەید محەمەدی جەباری و کەریم بەگی هەمەوەند و شێخ مـستەفـا کوڕی شێخ عەبدولقادری سەنگاو هێرشیان بردە سەر گوندی (قەرەخاودر) کە مەرکەزی ناحییەی گل بوو.

کـار بەدەسـتـان لە کەرکـوک عـەشـیـرەتی تاڵەبانیی دۆسـتـیـان کۆکـردەوە و ناردیانن بۆ ئەو ناوەو هێزی ئاسمانیمان بۆردومانی یاخی بووەکانی کرد) .

لە بەڵگەنامەی: ژمارە 730-78 . ٢٠٥ رۆژی ١٩٢٥/٩/١٧ برگە ٥٧٤: لە ١٩٢٥/٩/٢٥دا هێزێکی سوپایی بەسواری حوشتر لە کەرکووکەوە لەگەڵ سەربازی عێـراقیدا ڕووی کردە چەمچەماڵ و لەرێگا شەڕێکی گەورە ڕووی دا، کوشتار لە هەردوولا هەیە بەڵام هێزەکانمان گەیشتە چەمچەماڵ)»[1]».

ئەوی راسـتی بێ لەوڕۆژانەدا وەک دکـتـۆر (نووری) باسـیـان دەکـا فـڕۆکـە جەنگییـەکانی ئینگلیز لەئاسـمـانی کـوردسـتـاندا تاڕادەیەکی زۆر لە جموجووڵ کەوتبوون لەناو فایلە تایبەتییەکاندا ئەو راستییە روون و ئاشکرایە لەسەرەتای پایزی ساڵی ١٩٢٥دا فڕۆکەکانی ئینگلیز دیسان بەخەستی کەوتنەوە راوە کورد بەتایبەتی ڕابەرە لێهاتووەکانی هێزە چەکدارەکانی شێخ مەحموود، لەسەرووی هەمووشیانەوە کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمـەوەندو سابیری کـوڕی کەوا دیارە لەوڕۆژانەدا وەجاخی باو و باپیرانی بەشیاوی روون کردبۆوە[2]».

---

١- (م. ر. هاوار). بەرگی دووەم، ل٥٧٧- ل .٥٧٨-٥٧٧ .

٢- د. کەمال مەزهەر، رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٣٦ی ساڵی ١٩٩٥، ل٩.

# شەڕی بناری گۆیژە و ئەزمەڕ

مامۆستا محەمەد رەسووڵ هاوار لەباسی بەرگری شۆڕشگێڕان لەم شەڕەدا دەڵێ: (بارەگا لە (کانی سارد)ەوە گوێزرایەوە بۆ (هەرمێلە) لە (کانی ئێستر)ەوە لەوێشەوە گوێزرایەوە بۆ (کەناروێ).

لە (کەناروێ) هێزێکی لیڤی ئاسووری بەشەل و شەپکی بادینانەوە نێرران بۆ ئەوەی شێخ مەحموود بگرن، بەڵام لەشەڕێکدا کە لە (چوارتا) رووی دا زۆریان لێ کوژرا و لەشکری لیڤیی ئاسووری بەشکاوی لەچوارتاوە گەڕایەوە بۆ سلێمانی. لەبناری (گۆیژە)و لە (ئەزمەڕ)دا سوارەی هەمەوەند بە سەرکردایەتیی کەریم بەگی هەمەوەند بەرەنگاری ئەو هێزەی لیڤیی ئاسووری بوونەوەو ژمارەیەکی‌تر لەو ئاسوورییانە کوژران و (١٠) باری ئێستر فیشەک دەسگیری شۆڕشگێڕان بوو.

لەشەڕی (گرێژە)شدا حکوومەت زیانێکی زۆری لێکەوت و دەستی کرد بەهەڕەشەکردن لەخێڵەکان کە نابێ یارمەتیی شێخ مەحموود بدەن)»[1].

دەربارەی ئەم شەڕە لە یاداشتەکانی شێخ لەتیف - دا هاتووە کە دەڵێ: (لەسەرەتای بەهاری ١٩٢٥دا سوپای لیڤی هێرشی هێناو لە کەناروێ سوپای دوژمن شکاو بەرەو (چوارتا) هەڵهاتن. (کەریم بەگی هەمەوەند) و (شێخ محەمەدی بچکۆل)ە سێ رۆژ شەڕی خوێناوییان گێڕاو جادەی (ئەزمەڕ)یان گرت، لەشکری دوژمن (کەناروێ)ی سووتاند و لەشکری کوردستان پاشەکشەی کرد لەسەر جادەی (ئەزمەڕ))»[2].

---

١- (م.ر.هاوار)، بەرگی دووەم، ل. ٥٦٣

٢- شێخ مەحموود شێخ کاوە، یاداشتەکانی شێخ لەتیف،ل. ١٢٠

## شەڕی کۆزەڕەقە[1]

دەربارەی ئەم شەڕە مێژووییە مامۆستا (ئەحمەد خواجە) دەڵێ: (لە سوارەکانی خۆم و (تۆفیق ئاغا) بە ١٩ سوارەوە چووینە (کۆزەڕەقە) من لە ماڵی کوێخا مەولوود میوان بووم، لەلایەن ئێشک گرو پاسەوانەکانەوە کوڕێکی لاو گیراو هێنایان وتی: کاک ئەحمەد من جاسووسم ناردوومیان بە شوێن تۆدا بگەڕێم بزانە (سوپای میری پیادەو سوارەو جاش پۆلیس و پۆلیسی پیادەو سوارە) بەکۆمەڵ دوێنێ لەشار دەرچوو ئێستا لە (قرگە)و دار بەڕوولەن، لەگەڵ گزنگدا ئەگەنە سەرتان ئیتر خۆتان کاری خۆتان ئەزانن. ئینجا ئێوە من بەستنەوەو بەجێم بهێڵن.

من ئەم قسانەم بە فڕوفێڵی ئاوایی زانی بۆ ئەوەی رانەکانیان لە ژمارە رزگاربکەن کە لە پێش ئاوایی مۆڵ درابوون، بەڵام دیسان لێکم دایەوە پێویست بوو کە کار ئامادەییەک بکەم نەوەک راست بێت. سوارەکانم دەنگ دا ئالیک بە ولاغ دراو خۆیان ئامادەکرد لەگەڵ ئەوەی کە هەموومان (١٩) سواربووین و سوارەکانمان زۆر دوور بوون بڕیاری جەنگ و بەربەرەکانییان دا منیش بەباشم نەبینی پێچەوانەی ئارەزوویان بکەم، چونکە هەموویان بڕیاریان دا کە ڕێگەیان نەدەن و تا مردن بجەنگێن.

لەگەڵ (تۆفیق ئاغا) بڕیارمان دا کە خۆی و (٨) سوار بۆ گردەکانی (بۆتانە) و منیش لەگەڵ (١٠) سوار بچم بۆ شینکەکانی خەراجیان. لە پێش گزنگدا سوار بووین. پێشداری حکوومەتیش نزیکەی (١٠٠) سوار گەیشتنە سەرکانی و گۆڕستانەکەی ئاوایی لەگەڵ یەکەم دەستڕێژا گەڕانەوەو ئێمەش گەیشتینە سوپێرەکان.

---

١- (کۆزەرەقە) گوندێکە دەکەوێتە رۆژهەلاتی سلێمانی نزیک شارۆچکەی (عەربەت).

ولاغەکانمان دا بە دەست (مەجید قادر) لەکاتژمێری ٥.٢٠ی بەیانی گەیشتینە ئاسوورگەی پشت ئاوایی. ئێمە تەنیا ئەمانتوانی بەتاکە تەقە نەیەڵین خۆیان و متراڵیۆزیان دامەزرێنن، بەڵام تا سەعات ١٠.٣٠ جەنگی بەرامبەریمان بێسوود بوو. پاش ئەوەی (نادری حەمە ئیمام) زامداربوو، بۆمان دەرکەوت کە هێزی سوارەی سوپایی پۆلیس لەلای خواروومانەوە ئەیانەویست ئابڵووقەمان بدەن. ئیتر بەخۆی زیاتر لە دوو سێ کەس کە نەهات بەدەنگمانەوە ئێمەش ناچاربووین بەخۆ دەربازکردن بۆ (بۆتانە).

١- فیشەکمان هاتە کزی.

٢- نادر بریندار بوو.

٣- هێزەکەمان زۆر کەمەو ئەیانەوێ ئابڵووقەمان بدەن و زۆر شتی‌تر.

بەو ناچارییە جێگەمان بەجێ هێشت و تێکەڵ بەهێزەکەی تۆفیق ئاغا بووینەوە لە (بۆتانە)

سوپای حکوومەت هاتنە ئاوایی. ماوە دوور بوو، دووره تەقەش بێ‌سوود بوو. ئێمە هیوامان بری، زۆر ترسی فرۆکەمان هەبوو، چونکە جێگاکەمان رووتەن و بە بەرزییەوە بوو. پاش ماوەی یەک سەعات (ماجید) بە سوارەکانی خۆی و سوارەکانی تریشمانەوە هاتن. هەروەها (کەریم بەگ)یش گەیشت چونکە لە (موان)*[1]* کۆبووبوونەوە.

سەرۆکایەتی درا بە (کەریم بەگ) بەم پێیە سوارە دابەشکرا لە هەموو سوارەکان کە ١٢٠ سوار بوو نزیکەی ٦٠ سواری هەڵبژارد بەناوی ریتاڵییەوە. ئەو سوارانەی کە بێکارەبوون لەچەک و ولاغ - دا نێرران بۆ بووشێن: تا چایخانەکەی (قرگە) سوارەکان دابەش کران بەسەر گردەکانی پشت رێگاو ئاواییەکاندا و سەعاتی هەمووومان هێنرایە سەر (-ر٢)ی پاش نیوەڕۆو فەرمان درا لەکات ژمێری(-ر٤) پاش نیوەڕۆدا هەر کەسە لەڕاستی خۆیەوە هێرش

---

١- (موان) گوندێکە دەکەوێتە نێوان سەید سایەق و عەربەتەوە لەدەشتی شارەزوور.

بکات بۆ سەر ئاوایی و سوپاکەی ناو (کۆزەڕەقە). ئەم پرۆگرامە بە تەواوی بەکارهێنرا. ئەو سوپا پڕ چەک و زۆرە بەو مەرجەی مریشکی ناو مەنجەڵی لە سەر ئاگر بەجێ بهێڵن بەسواری یان پیادەیی بەدرێژایی ڕێگاکە بەرەنگاری چەند سوارێکی ئێمە نەبوون. لەکوشتن و تاڵان زۆریان لێ بەجێ ئەماو ئەیانگرتن. لەناکاو (حەمە شەریف مەرگەیی )بە (ماجید)ی وت پاش ئەوەی دەمانچەیەکی زۆری پێوەنام (ڕەشید جەودەتم) کوشت ئیتر بۆ دۆزینەوەی (ڕەشید جەودەت) شەش سواربووین تا گومەزەکەی گردی (حاجی عەبدوڵڵا) هاتین، بەڵام بێسوود بوو. دانیشتوانی سلێمانی هەموو بەسەربانەوە بوون سوپاکە بەپاڕانەوە ڕانەبووردن، زۆر پەرێشان بوون. پاش چەند ڕۆژێک تێگەیشتین کە (محەمەد جەودەت) بریندار کرابوو.

## جۆنێتی جەنگەکە

شەو لە (کۆزەڕەقە) کۆبووینەوە. تاڵانێکی زۆر گیراو بەجێ ماو دەست کەوت. لەلایەن (سابیری کەریم بەگ)ەوە (١٨) سوپایی پیادە گیرابوو. ئەسپ زۆر بوو. ماینێکی زۆر جوان و نایابی فەرماندەی ئینگلیزەکەش گیرابوو. کوژراویان زۆر بەجێ هێشت. دێهاتەکانمان نارد بۆ کۆکردنەوەو بردنەوەیان بۆ (سلێمانی). لەگەڵ گزنگدا چووینە (سەرای سوبحان ئاغا) کە بارەگاو مەلیک دوو ڕۆژ لەوە پێش گەیشتبوون، بەڵام بەڕاستی جەنگی وا مەگەر بەدەگمەن ڕووی دابێت چونکە هێزی ئێمە بەفەرماندەکانەوە (٦٤) کەس بوو بەتێکڕایی فیشەکی هەریەکێک لە (٦٠) دانە پتر نەبوو، بەڵام ئەوان لە ٣ هەزار چەکداری سوارەو پیادە کەمتر نەبوون. بەتفاقی جەنگی حکوومەتییەوە ئەوە لەیەکتری جیای نەکردینەوە تەنیا دلێری و یەک دڵی و پاکی بوو بۆ نیشتمان. هەڕەمەیی و ترس بۆ پارە لەوان جیای کردبووینەوەو. ئەم جەنگە لەو جەنگانە بوو کە لەیادی مێژوو دەرنەچێت. پاش دوو ڕۆژ هەرکەسەمان گەڕاینەوە بۆ سەرکاری پێشپێرراومان و تەواومان کرد ١٩٢٥.

با مەردیی سوارە عەسکەرییە کوردەکەش ون نەبێت کە نەگەیشت ناوی خۆی

بلێت. بە پاشداری ئەو سوپا گەوردیە رەش سواریّ بەربەستی کردین. وەکو برووسکە سەرەوژێرو سەرەوژوور بە قیرقاچ شەنوکەوی پێ ئەکردین. بەتاو گوللە بارانمان وەکو باران پەرش و بلاوی ئەکردینەوە تا کەوتەبەر قامچ و لوولەی تفەنگی (سابیر کەریم بەگ)، ناچاری پیادەبوون بووە لەوکاتەدا سوارێکی (هەمەوەند) گەیشت و گوللەیەکی لێیداو کەوت. وتی کوردم، گەڵباخی گوڵی ژیانی وشک بوو بوو، بەلام بەرامبەر بەم قسەیە زانرا کوردە. سوارەی عەشایر هەموویان فەقیانەکانیان بڕی و فڕێیاندایە سەر لەشەکەی و کرا بەهەراو شیوەنێک کە هەرگیز نەبیستراوە. کابرا رای کرد ترسا بیکوژنەوە کۆتەڵەیان بۆ دروست کرد تا ٣ رۆژ بەولاتا گێڕایان. کاتێ جەنگ بوو بە شیوەن، بەو بۆنەیەوە هێزەکەی میری رزگاری بوو، بەلام بەپەرێشانی بەراستی بەنووسین باسی ئەو دلاوەرە کوردە تەواو ناکرێت)«[1]».

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم، ل٩٩-١٠٢.

# گەشتی سابیر بەگ بەرەو کەرکووک

لەو کـاتەدا کـە دەنگوباسی بەرهەم هێنانی نەوتی بیـرەکـانی کـەرکـووک بڵاوبووەوە کـە ئینگلیـزە داگیـرکـەرەکان ئەو کارەیان بۆ بەتاڵان بردنی سـامـانی وڵاتەکەمان ئەنجام دابوو، سابیر بەگ لە دەوروبەری بازیانەوە هێزێکی (٢٥٠) سوارەی هەمەوەند دوای خۆی دەخات و گەشتێک بەرەو ناوچەکانی جەباری و قـەرەحەسـەن دەکات و لە کـەرکـووک نزیک دەبێتـەوە بەمەبەسـتی ترسـاندنی ئینگلیزەکان بێ ئەوەی گـوێ بداتە مەترسیی فڕۆکەکـانی ئینگلیـز کە بەردەوام بەسەر ئاسـمانی ئەو ناوچانەدا دەسـووڕانەوە. بۆ پاراستنی بیره نەوتەکان. سابیر بەگ مـاوەی چەند ڕۆژێک لەو دەوروبەرە مـاوەتەوە و کـارەکـانی خـۆی بەپێی بەرنامە دارێژراوەکانی ئەنجام داوە. دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی تێگەیاندووە کە: لەبەر ئەوەی ئەوان کوردن و ناوچەکەشیـان کـوردستـانە دەبێ باج نەدەنە میـری و باجەکانیان بدەنە حکوومەتی کوردستان کە شێخ مەحموود مەلیکێتی. د. کەمال مەزهەر لەم بارەیەوە دەڵێ: (کـارگـەیشت بەوەی کـە سـابیـری کـەریم بەگی فـەتاح بەگی هەمـەوەند ئاگاداری تایبـەتی بەناو دانیـشـتـوانی قـەرەحەسـەن و گـوندەکـانی دەوروبەریدا بڵاو بکاتـەوە. سـەرپەرشـتـیـاری کـەرکـووک کـە (ئەدمـوندز) بـوو ڕۆژی ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٢٥ دەقی ناوەڕۆکی ئەو ئاگـادارییـەی ناردووە بۆ ڕاوێژکـاری وەزارەتی کـاروباری ناوخـۆ (کـوورنوالیس) و وێنەی داوە بە سکـرتێـری هێـزی دوبسی نوێنەری باڵا لە بەغدا. سـەرەتای ئاگـادارییـەکە بەم جۆرەیە: بۆ گـشت دانیشتوانی قەرەحەسەن ئاگادارتان دەکەم کەمن سابیر بەگی کوری کەریمی فەتاح بەگم لەلایەن مـەلیکی کـوردستـانەوە نێـردراوم، ئەو هێزەی لەگەڵمدایە بریتییە لە(٣٠٠) سـوارە لە هیـچ مـەترسن، من بۆ کـۆکـردنەوەی کـۆدە باج هـاتووم. لەکۆتاییشـدا دەڵێ: ئەم ڕاگەیاندنەم گـونداو گـوند بنێـرن تا دەگاتە کـەرکـووک. ئیمزا سابیر فەرماندەی بەتالیۆنی کوردستان)«[1]».

---

١- د. کەمال مەزهەر گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە ١٣٦ - ساڵی ١٩٩٥، ل٩.

# شەڕی کەندەکەوە

مامۆستا (ئەحمەد خواجە) دەڵێ: «هەوڵێکی‌تر دراو بڕیاردرا نامەیەک بنێررێ بۆ (کۆلۆنێل لاین) کە موفەتیشی ئیداری بوو بەم جۆرەی لای خوارەوە:

ئێمە لە مەوقف و عەدالەتی بەریتانیا دڵنیاین کە بەچاوێکی دڵسۆزانە ئەم گەلە ئاوارەیە دەبینێت کەدوای ئازادی کەوتوون، ئیتر بامالۆێرانی و خوێنڕژاندن دوایی پێ بهێنرێت، لەگەڵ دانی مافی کورد و عەفووی عام بڵاوکردنەوەی هەستی ئادەمیزادیتان هیواداریین.

**کانوونی یەکەم/ ١٩٢٥**

بەڵام هەموو وەڵامەکەی نوێنەری بەریتانیای گەورە (کۆلۆنێل لاین) کە موفەتیشی ئیداری بوو، بریتی بوو لەمەی خوارەوە:

«سەگی هار چل شەوی عومرە»

**ئیمزا مفتشی ئیداری/لاین**
**شوبات ١٩٢٦**

## بۆ پێشگاهی مەلیک و باش قوماندان دەستان ماچ دەکەین

دوێنێ لە کەندەکەوە لەگەڵ پۆلیس و عەسکەری (لیڤی)دا دوو سەعات لەشەڕدا بووین تا گردی (شێخ محیەددین)- (سلێمانی) شکان و لەسەریان چووین. (٥) بریندار و (٢) کوژراویان بەئەسپ و تفەنگەوە بەجێمابوون، لەئێمەش (حەمە شەریف نەریمان) و (٣) ئەسپ کوژران- ئێستا لەدێی (کەڵەکن) و (خێوەتە)ین - فڕۆکەمان نەبینیوە.

سابیر
قوماندانی سوارەی هەمەوەند
٢٨/شوبات/١٩٢٦

* * *

### بۆ حەضرەتی مەلیکی کوردستان

خاکپاتان ماچ ئەکەین، لەنزیک (تەیناڵ) دامان لە مەفرەزەی ئەقلیات. (٥) ئێستر بەبارە ئازووخەوە لەگەڵ یەک ئەسپمان دەست کەوت. (٦) عەسکەر دووانیان کورد بوون گیران، بە مەرقەدی (کاک ئەحمەد) ئەوەندە بەنازایی و دلێری ئەجەنگان دڵم ئەهات بیانکوژم. ئازا ناکوژرێت، بەرم دان. هەموومان سەلامەتین و خاکی بەرێتان ماچ ئەکەین.

ئەمین حەمەی ئیمام
خزمەتکارت»[١]

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم ل. ١٣٢

## هەوڵێکی لەناوبردنی شێخ مەحموود

شێخ رەئووف لە یاداشتەکانیدا دەڵێ («لە ساڵی ١٩٢٦ کە لە (وێلەژێر) بووین کابرایەکی ئەرمەنی هات بۆ (وێلەژێر.) دوای ئەوەی کە (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند) لێکۆڵینەوەی لەگەڵا کردبوو بۆی دەرکەوت کە بۆ کوشتنی باوکم نێررابوو. بۆیە (کەریم بەگ) کوشتی. بەڵام باوکم ئەوکارەی (کەریم بەگی) بەدڵ نەبوو. هەرچەند لە دواییدا وەکو (عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی) لە کتێبەکەیدا (تاریخ الوزارات العراقیة) باسی کردووە، کە ئەو کابرایە هەر وەکو (کەریم بەگ) بۆی چووبوو بۆ کوشتنی (شێخ مەحموود) نێررابوو».

(شێخ رەئووف) لە یاداشتەکانیا باسی چۆنێتی چوونی ئەو کابرا (ئەرمەنییەی) نەکردووە بەڵام مامۆستا (محەمەد رەسووڵ هاوار) دەڵێ: من لەکاتی خۆیدا لە (قادر ئاغای مووبرە)ی خزمم بیستبوو کە لەو رۆژانەدا لەخزمەتی (شێخ مەحموود)دا بووە. ئەو کابرا (ئەرمەنییە) بە (شێخ مەحموود)ی وتبوو کە ئەو ناوچانە (ئاڵتوونی) تێدایەو ئەگەر رێگەی بدا دەتوانێ سوودێکی چاک بەشێخ بگەیەنێت و ماوەیەک هەوڵیدا بەو بیانووەوە خۆی لە شێخ نزیک بخاتەوەو ئەوە بوو دەرکەوت کە بۆ کوشتنی شێخ چووبوو بۆیە کوژرا)»[١].

---

١- (م.ر.هاوار)، بەرگی دووەم، ل٥٧٤-. ٥٧٥

# سابیر بەگ لە چەند شەڕێکی سەختدا
# لە بەهاری- ١٩٢٥دا

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەڵێ: شەو خۆمان گەیاندە (دمرکان) چونکە لە ڕێ سوور - قەرەداخەوە - گەڕانەوەمان بەباشتر بینی.

لەکاتی نیوەڕۆژە کردندا پیاوێکی دوکانی هات و وتی: نۆردوویەکی زۆر لە سەرکانییەکەی: خەراجییانە: و سوارەکان کە تێ گەیشتن زۆرداخیان هەڵکێشا کە زۆر کەمن و توانامان نییە، بەڵام لەوکاتەدا نادر و حەمە عەلی ئیمام و دە سوار پەیدابوون.

ئیتر سوارە قوتە قوتیان تێکەوت و داوایان کرد کە شەو بدەن بە سەریاندا. من چەند لێکم نەدایەوە هیچ بەدروستم نەئەزانی بە (١٦) سوار لەگەڵ نۆردوویەکی حکوومەتیدا بجەنگین، بەڵام بێسوود بوو ناچار بووم بە ئاوێتەی بیریان لەگەڵ تاریکەی ئێوارەدا لەگۆڕستانەکەی (عەربەت)ەوە بە تاو بە ٣ تیپ پەلاماری ئاواییمان داو نەمانزانی سەرباز لەئاواییدایە تاماوەیەکی زۆرکەم لەبەر ئاواییدا. دراینە بەر دەستڕێژی تفەنگ و مترالیۆز. ئیتر ماوەی گەڕانەوەمان نەما بێجگە لەو وروژمە کە بیگەیەنینە ناو ئاوایی. ئەو هێزەی سوپاییە کە لە بۆسەو سەنگەرابوون ناچاری راکردن بوون لەئاواییدا یەکێکیان لێ کوژرا. مەجید و نادر پەلاماری گردەکەیان داو لەپێش ئەواندا کە پیادە بوون گرتیان. ئیتر ڕێگەی رزگارییان تەنیا خۆگەیاندنەوەیان بوو بە نۆردوودکەیان. بەڵام چەکی کوژراو بەفیشەکەوە گەیشتە (٩) تفەنگ یەک مترالیۆزیان پێ بوو دەریان کرد. پاش دوو سەعات سابیر بەگ هات ئیتر توانیمان زۆر زیاتر تەنگاویان بکەین. لەکاتی گەڕانەوەماندا وڵاغەکانمان کە بەدەست مەجید قالەوە بوو عەربەتییەکان گەمارۆیان دابوو کە وڵاغەکانیان لێ بسەنن. دووانیان گیران لەپاش نەختێک ئەشکەنجە بەرەڵام کردن. شەو بوو سابیر بەگ وتی ئیمرۆ فرۆکە بەیاننامەی زۆری فڕێداو ئەم دانەیەی دایە دەستم تاریک بوو خستمە باخەڵم.

**بۆ عموم اهالی ناحیەی تانجەرۆ و قضای هەڵەبجە**

لەئێوە مەعلوم بێ کە ئەگەر زەرەرێک و ئەزیەتێک واقع ببێ بۆ ئەم ئۆردووە کەوا لەناحیەو مەحللی ئێوەوە مروورئەکات هەر فلاکەت و مصیبەتێک کە لەوڕووەوە بەئێوە بگات مسئولیەتی لەسەرخۆتانە

**بۆ عموم اهالی قضای هەڵەبجە**

ئەوا تبلیغتان ئەکرێت بۆ ئەوەی تأمین ادارەی قضا چاکتر بکرێت. ئەحمەد بگ قائیمقام و حمید بگ معاون لەگەڵ مامورانی کە ایجاب بکا نێررانەوە بۆ هەڵەبجە. ئەبێ لە اجرای وەضائفدا معاوەنەتی مامورەکان بکەن و مطیعانە ئەوامری رەسمییەی حکوومەت بەجێ بهێنن

ئەمە سەیر نییە؟ لەلایەکەوە داوای یارمەتی لەگەڵ ئەکەن و لەلایەکی تریشەوە هەڕەشە؟!

ئەم بەیان و هەڕەشەیە لەلایەن حکوومەتی سلێمانییەوە لەگەڵ ئەکرێت دەرکەوت کە خۆیان ئەو توانایەیان نییە کە ئۆردوویەک لە سلێمانییەوە بگەیەننە هەڵەبجە، داوای یارمەتی لەلادێ و عەشایر ئەکەن، بەڵام لەوترسە رزگار نەبوون.

**سابیر وتی:**

ئەوا تۆ هەگبەیەک پارەت پێ هەیە ئێستا ئەچینە ناو جافەکان ماڵی کوێخا ئەحمەد ئەجەشەلی رۆغزایی: هەموویان لەگەڵ سلێمانیدا رێکن. ئەڵێن شێخ مەحموود ناردووینی بۆ ناونووس بەپێی سوارەو چەکدار مانگانە ئەدات. جار جارێک هەگبەکە بلەرێنەوە تاکو بزانن پارەیشمان بۆ هێناون ئیتر کارمان ساز ئەبێت. چووین دوو سێ مەرمان بۆ سەربڕاو پرۆغرامان بەکارهێنا لەجیاتی (١٠) چەکدار (١٠٠) ناویان ئەنووسی هیوای پارە وەرگرتن خەوی لەچاوی وردو درشتیان بڕی. لەکاتژمێری بەیانی ٧،٣٠دا لە (بێکەسە)وە تۆزی سوارە بینرا. وتمان عەشرەت ئەوە سوارەکەی سلێمانییە ئیتر زەلام و چەکدار لەناو ماڵا

ئەما لە هەموو خێڵێکەوە وەکو ڕێچکەی مێروو لەچەکدار کەوتەڕێ: لەبەر ئاوایی گرێزەدا بەرەنگاریان بوویین. سوپای میری (سوپای لیڤی)، لەژێر فەرماندەی فەرمانداری ئینگلیز (کۆلۆنێل لوانس)دا لەهەر چوارلاوە خرانە ژێر لوولەی تفەنگی کورد.

لە سەعات (٨،٣٠)ەوە ئۆردووی لیڤی چەسپێنرانە ناو شێوەلی بەردی گرێزەو لەهەر چوار لاوە گوللەیان بەگژا ئەکرا. خۆم بینیم جافەکان بە پیادەییەوە بە ڕاکردن خۆیان ئەکرد بەبارخانەکەیاندا و بەکۆڵ کەلوپەلیان ئەفراندو هاواری قەمچییە ڕەشیان (شێخ عەبدولکەریم کربچنە) یان ئەکرد، بەلام لیڤییەکان زۆریان کورد بوون تیپ تیپ هێرشیان ئەهێنایە قەیارەی رووتەوە پەلاماریان ئەدا کوشتار زۆر بوو خەلیفە یوونس لەگەڵ ٣٠ سوارا پەلاماری تیپێک سواریان دا لە پشتیانەوە تیپێکی تری لیڤی پەلاماری خەلیفەی داو خستیانە ناوانی دووهێز. لەوکاتەدا ئێمەش بەنزیکەی (٣٠) سوارەوە لەگەڵ سابیر بەگدا پشتی تیپە لیڤییەکەمان تەنی. خەلیفە لەوێدا گەیشتە ئێمە، هەلی دەستکەوت بە شپرزەییەکی زۆر خراپ لەناویاندا رزگاری بوو و ناوێتەی ئێمە بووەوە. لەم پێکدادانەدا بەڕاستی جەنگێکی سوارەی خوێن ڕێژانە روویدا. لیڤییەکە نەیویست بەقەیارە شمشێر بگاتە سەرمان و بەبێ تەقە دامان پاچێت. بەلام دوورەپەرێز کوشتاری زۆریان دا. مەشقی شیربازییان زۆر جوان بوو و بەڕاستی لەجەنگاوەر ئەچوون. پەرێزی جەنگیان ئێجگار ڕەنگین بوو، بەلام لەگەڵ جەنگی چەتەیی ئێمەدا دەسەلاتیان نەبوو. تا سەعات ٤ی پاش نیوەڕۆ جەنگێکی سامناکی خوێن ڕێژ رووی دا. لەم کاتەدا چوار فڕۆکە گەیشتە سەر کۆڕی جەنگ ئیتر لەو دەشتە ساکارەدا ئێمە هێزی جەنگیمان نەماو لیڤییەکە لەژێر فڕۆکەکاندا ڕۆیشتن بۆ هەڵەبجە. سەرەڕای کوشتار، تالانێکی زۆریش دەست جافەکان و دێهاتەکان کەوت.

لەگەڕانەوەدا فڕۆکەکان بەمەترالیۆز گاڵەیان کرد. عەشایرەکە لەدەشتی شارەزووردا بلاو بوو بوونەوە. پیاو ژن، مناڵ ئاژەڵ وەکو یەک ئەکوژرا. بە بۆمبا

ڕەشماڵی خێڵەکانی نەهێشت. لەژێر ڕەشماڵی کوێخا محەمەدی باشۆکیدا ٩ کوژراوم بینی لەکوڕو کچ و ژنی کوێخا کە داپۆشرابوون. ئێمە شەو چووینە (محەمەد خانی)، (لادێیەکان) نان و دۆیان بۆ هێناین قورئانێکیان هێنا وتیان ئێرە بەجێ بێڵن نەوەک بۆمباران بکرێن. چوینە: دەسکەرە: دێی خەلیفە یوونس. سوارەکانی ئێمە پێنج تفەنگی ئینگلیزی ٢ شمشێر و ٢ صندوقی گەورە بەبارگیرییەکەوە و چوار ئەسپ سوار بەتفەنگەکانیانەوە دەسکەوتیان بوو بوو. چونکە ماوەمان نەئەدا بچن بۆ تالآن. کەمیان دەستگیربوو بوو لەناو صندوقەکاندا ویسکی و زۆر لەخواردەمەنی نوقڵ و بسکویت و قوتووی خواردەمەنیی زۆری تێدابوو. لەکاتی گەرمەی جەنگ و ئاگرباراندا لەسەرکانی و ئاوەکەی موان تووشی میرزا غەفووری حاجی مارفی عەنبەرخان بووم بەتوێی کراس و دەرپێیە بەڕووت کراوی بینیم. ناوی سوارەکانی ئەزانی کە ڕووتیان کردبۆوە چووم بە تەواوی تا کیسەی پارەکەیم بۆ ساندەوەو دامەوە، بەلآم لێم نەپرسی چی گەیاندووتییە ناو ئەم ئاگرە)[١]

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم، ل١٠٢-١٠٧.

# شەڕی گوندی مۆریاس

مامۆستا (ئەحمەد خواجە) دەربارەی ئەم شەڕە دەڵێ: ( لە ئەوتی دسواری (هەمەوەند) لەگەڵ (کەریم عەزەی ڕەحیم دۆینە) میوانی (کوێخا فەرەج) بوون و ئاویتەی ئێمە بوون. ئەو شەوەمان رابوارد. پێش تاریک و روونی بەیانیدا سواربووین بۆ ئەوەی بچین بۆ (سیتەڵان) و (شارەزوور). سوارەی (هەمەوەند) بەقەتارو ئەڵلاوەیسی وتن پێش ئێمە کەوتن. بەرامبەر دێی (مۆریاس) لە ئاسۆگە تەقە دامەزرا. بە شەڕ جێگا بڵندەکانمان گرت و بەسەر جێگای تەقەو جەنگییەکاندا زاڵ بووین جەنگ تا نزیکەی نیوەڕۆی خایاند. دوژمن تەقەی وەستاند، بەڵام دوژمن کێیە نازانین. بۆمان روون بووەوە کە کشاونەتەوەو چوونە جێگاکەیان، بۆمان دەرکەوت کە لیڤی: ئاسوورین. لەدێی سیتەلانیش ئاوەستین. خەریک بوون لە رووباری تانجەڕۆ دەپەڕینەوە. بەڵام ئەمجارەش (کەریم عەزەی ڕەحیم دۆینەی هەمەوەند) کە بەڕاستی گوڵی لەشکرو بێ وێنەی ئازایی و لەشکر گیربوو، بەخۆی و ئەسپەکەیەوە کوژران و هەر لەجێگەی خۆیدا بەجلە خوێناوییەکانی نێژرا، ئیتر بەتەواوی زانیمان کە لیڤی ئاسووری و فەرماندەی ئینگلیز بوون کە لەپاش جەنگی (گرێژە) لەگەڵ لیڤییەکان ئەم تابوورەیان هێناوەتە ئەو جێگە گرنگەی ڕێبازەکان بۆ تۆڵە سەندن)»[1].

---

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)بەرگی دووەم ل١٠٨-١٠٩.

# سابیر بەگ لە شەڕی تاسلووجە دا

سابیر بەگ لە ڕووی ئازایەتی و خۆگرییەوە شوێنێکی تایبەتی و ناوێکی دیاری هەبووە.

مامۆستا ئەحمەد خواجە دەربارەی ئەم شەڕە نووسیویەتی دەڵێ: (لە کۆزەڕەقە، خەلیفەم بەجێ هێشت، شەوێ مابوو گەیشتمە بارێزیی گەورە- بازیان-. پاش چەند ڕۆژێک سابیر بەگ و خالۆ نەمین حەمە ئیمام هاتن. پەلەیان بوو وتیان سبەینێ بۆ نیوەڕۆ سوپاکەی - لیڤی- ئەگاتە بازیان بۆ سلێمانی. بڕیارمان داوە لەپێش هاتنیاندا بکەوینە خۆمان تاوەکوو بەخۆشی نەگەنە سلێمانی. من فەرمانم پێ نەدرابوو هاوکاری جەنگ بیم. پێنج سوارم لەگەڵ بوو، نەمویست تێکەڵیان ببم، بەڵام ناچار بووم لە چەکدارانی بازیان پتر لە ۱۰۰ چەکدارم کۆکردەوەو لەسەری تاسلووجەوە تا پشتی (بیبی جەک)مان بەپیادە گرت. سوارەیش لەنێوان (بیبی جەک) و (تەپەشوانکارا) دامەزران.

پێشداری لیڤیی یەکەم بەچیادا هات کەوتە ژێر لوولەی پیادەکەمان و پەرێشان کران سوپاکەیش کە لە شەقامەوە ئەهات کەوتنە ناوانی چەکداری سوارە، بەڵام لیڤییەکە زۆر دلێرانە ئەجەنگان بەبێ ترس بەرامبەر بە لەشکرەکەمان ورووژمیان ئەهێنا. بەڕاستی زۆر ئەترساین کە ئەوان سەرکەون. بەڵام پێشدارەکەیان پشتی شکاندن چونکە هێزەکەی ئێمە لەبەرزێوە دەسەڵاتی خۆی پیشان دان. من ویستم تەقە ببڕین و ڕێگەیان بدەین چونکە زۆر پەرێشان کران. بەڵام لەناکاو چوار فڕۆکەهات بە متراليۆز و بۆمبا، ماوەی ئێمەی بڕی، ئیتر ئۆردووەکەی خۆی دەرکردو چوو بە دیوی سلێمانیدا. ئینجا بەرەنگاری لەشکری عەشایەری دیوی سلێمانی بوون کە بەهاواری ئێمەوە هاتبوون. فڕۆکە لەسەر ئێمە جیاوازی نەئەکرد. ئۆردووەکە کەوتبوونەوە تەنگو چەڵەمە تا ڕۆژ ئاوابوو فڕۆکە لەسەرمان لانەچوو تفەنگ و تالان زۆر بوو، کوژراوو بریندار لەلایەن دێهاتەکانەوە کۆکرانەوە. بەڵام ئێمە زۆر داخدار بووین کە نەمانتوانی

چاردیەکی بریندارەکانیان بکەین و ئەو شەوە بەچۆڵەوە مانەوە چونکە وامان ئەزانی کە زریهلییان دێت و ئەیانباتەوە بەلام، تا ڕۆژ لە چۆڵیدا مانەوە)»[1]

١- ئەحمەد خواجە (چیم دی)، بەرگی دووەم، ل١٢٠-١٢١.

# شۆڕش لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٦

لەم ڕۆژانەدا ماڵ و منداڵی هەمەوەندەکان ئاوارەی سەرسنوورەکانی ئێران ببوون.

پاش ئەنجامدانی زنجیرەیەک شەڕی خوێناوی وەک باسمان کرد دوژمنانی گەلی کورد بەتۆپ و فڕۆکە و هێزی لیڤی و عەشایەری عارەب و پۆلیس پەلاماری ناوچەکانی کوردیان دا. جگە لە تەرخان کردنی خەلات و دیاری بۆ کوشتنی سەرکردەکانی کورد، جار ناجاریش زەمینەی گفتوگۆیان لەگەڵ شێخ مەحموود خۆش دەکرد بەمەبەستی فریودانی، بەڵام هەموو ئەو هەوڵانەی ئینگلیز سەری نەگرت.

ئەمەش نموونەیەکی (گفتوگۆیە) لەنێوان شێخ مەحموود و ئینگلیزەکان کە مامۆستا عەلائەددین سوجادی باسی کردووە. ( لە دەوروبەری سەرەتای ساڵی (١٩٢٦)دا ساڵح زەکی بەگ ئەچێ بۆ بەغدا، لەولاشەوە مستر (ئەدمۆنز)، (کۆرنوالیس)تێئەگەیەنێ لەکەین و بەینی نێوان ساڵح زەکی بەگ و «عەبدولموحسین سەعدوون» وەزیری ناوخۆیی و (مستر کۆرنوالیس) ڕاوێژکاری ناوخۆیی، لەوەکالەتی (شێخ مەحموود)ەوە چاوی پێ ئەکەوێ کە ئیش و کار هەموو لەدەست کۆرنوالیسا بوو. قسەوباس دێتە سەر ئەوە کە شێخ مەحموود وازبێنێ لەهەموشت و لە (عێراق) بچێتە دەرەوە، کارێکی بەسەر سیاسەتی عێراقەوە نەبێ. یەکێ لە کوڕەکانی بنێرێ بۆ بەغدا بۆ خوێندن، ملکەکانی پێ بدرێتەوەو خۆی یەکێکی بۆدانێ بۆ چاودێری کردنیان.

«ساڵح زەکی» ئەم قسانەی هەڵگرت و هێنایەوە بۆ شێخ مەحموود. شێخ مەحموود لەمە زۆر تووڕە بوو بەڵکو هەندێ شتیشی دایەپاڵ «ساڵح زەکی بەگ» و حەپسیشی کرد. «شێخ مەحموود» زووتر قسەی دابوو بە وڵاتی مەریوان و پێنجوێن کە بچێت بۆ ئەو ناوە. بەرە بەرە وڵاتی جاسەنەو ئەشکەوتی بەجێ

هێشت و ڕووبەڕووی دەوروبەری پێنجوێن بووەوە کە لەوێوە بچێت بۆ «پیران» لە مەریوان)»[1].

شێخ ڕەئووف لەیاداشتەکانیا دەربارەی ئەم ڕۆژانە دەڵێ: (بەهاری ١٩٢٦ باوکم لە گوندی (کەندە سوورە)وە چووە شارباژێڕ (لە ڕاستیدا شارباژێڕ هەتا دوایی بنکەیەکی بە هێزی شێخ مەحموود بووە و زۆربەی چەکدارەکانی لەگەڵیابوون)، دووبارە ژمارەیەک چەکداری لەدەور کۆبووەوە و ڕوویان کردە هەڵەبجە، بەڵام باوکم (ماجید مستەفا) و (هەمەوەند)ەکانی لەشارباژێڕ هێشتەوە.

لەڕاستیدا باوکم لەو ڕۆژانەدا زۆر شپرزەو دەست کورت بوو، لەبەرئەوە دووبارە لەزستانی ١٩٢٦،١٩٢٧ چووە (مەریوان).

مامۆستا محەمەد ڕەسووڵ هاوار ئاماژەی بە دۆکیۆمەنتی ژمارە 105-730.٥.٠٢ ڕۆژی ١/٤/١٩٢٦ لە برگەی (١٩٠)دا هاتووە:( ئەو چەتانەی لەقەرەداغەوە رایان کردو لە تانجەرۆدا پەڕینەوەو گەیشتنە ناوچەی هەڵەبجەو دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی باج لە هەندێ دێهاتی شارەزوور، زۆربەی ئەوانەی لەگەڵ شێخ مەحموود - دان جگە لە چەند کەس و خزمێکی تایبەتی خۆی ئەوانی تر بڕیاریان داوە لە شارباژێڕدا بمێننەوە و شێخ مەحموود وتوویەتی چۆتە زیارەتی شێخ حوسامەددین لە (تەوێڵە). شێخ حوسامەددین نەسیحەتی شێخ مەحموودی کردبوو خۆی تەسلیمی ئینگلیز بکا. لەئەنجامی ئەوەدا شێخ مەحموود نامەیەکی نارد بۆ مەلیک فەیسەڵ کە ئامادەیە نوێنەرێکی خۆی بنێرێت بۆ بەغدا، بەڵام نووسیبووی لەم کاتەدا خۆی ناتوانێ بچێتە بەغداد)»[2].

هەروەها لە برگە (٢٢٥)ی هەمان دۆکیومەنتدا هاتووە (جگە لەو نامەیەی

---

١- علاء الدين سجادي، مێژووی کورد و کوردستان، ل١٠٧-١٠٨.

٢- (م.ر.هاوار)، بەرگی دووەم، ل٥٧٣ - ٥٧٨-٥٧٩ .

که شێخ بۆ فەیسەڵی ناردبوو نامەیەکیشی ناردبوو بۆ مەندووبی سامی.

بەڵام تێگەیەنرا ئەگەر خۆی تەسلیم بکا بە فەیسەڵ پێویستە بەر لەوە لێبووردنی بۆ دەربچێت و جگە لەوە دەبێ بۆ ماوەی (٤) ساڵ لە بەغداد بمێنێتەوە، ئەوسا حکوومەتی عێراق بریاری گەڕانەوەی دەدا بۆ کوردستان.

حکوومەتی عیراق بریارێکی دەرکرد کە دەست بەسەر هەموو مولک وماڵی شێخ مەحموودا بگرێ و بەپێی برگە (٧)ی نیظامی/ دەعاویی عەشایر بیفرۆشێت.

مەئمووری ضەریبە لە سلێمانیدا ئاگاداری شێخ مەحموودی کرد ئەگەر لەماوەی دەسنیشانکراو کەبۆی دانرابوو خۆی نەدا بەدەستەوە هەموو مولکەکانی دەفرۆشرێ)»[١].

لە دۆکیۆمەنتی ژمارە 105-730. ٥ .٢٠ رۆژی ١٩٢٦/٦/٢٤ (راپۆرتی ژمارە/١٣)، برگەی ٤٠٨ دا هاتووە (ئەو هێزە بچووکەی کە نێررابوو بۆ یارمەتیدانی جافەکان کە بە ئاسانی بگەنە کوێستان ئەو هێزە لە ١٣/٦/ ١٩٢٦دا بەرەنگاری چەکدارەکانی کوردی ئێران بوونەوە کە چەکداری ناوچەی هەورامان و مەریوانن و ژمارەیان (٣٠٠) چەکدارە کە هێزی دوژمن بەسەرکردایەتیی (ئەحمەد بەگی باڵەک) بوو کە یەکێکە لە خزمەکانی مەحموود خانی کانی سانان، بەڵام هێرشی دوژمن وەستێنرا.

لە ١٩٢٦/٦/١٤ پەلاماری هێزی شێخ مەحموود دراو شکێنران و (٣٠) کەسیان لێ کوژرا.

زیانی ئێمە تەنها چوار بریندارو هێزی ئاسمانی ئێمە پاڵپشتیکی چاکی حکوومەتی کرد لەو شەڕەدا، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوچەی شەڕ دارستان و شاخاوییە، بۆردومانی ئەم جارە زۆر کاریگەر نەبوو.

دوژمن دوای ئەوە هەموو هێزەکانی خۆی کۆکردەوە کە ژمارەیان (١٠٠٠)

---

١- (م.ر.هاوار)، بەرگی دووەم، ل٥٧٨-، ٥٧٩.

چەکدارێک دەبێ. ڕۆژی ١٩٢٦/٦/١٩ دوژمن هێرشێکی تری هێنایە سەرمان بەڵام شکێنران و هێزی حکومەت بەپاڵپشتی هێزی ئاسمانیی ئێمە توانی پێنجوێن داگیربکا. مەندووبی سامی داوای لە حکومەتی ئێران کرد کە ڕێگا نەدا بە عەشایرە کوردەکانی ئێران یارمەتیی شێخ مەحموود بدەن، بەڵام بڕوا ناکرێ ئێران دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ ڕێگا لەوەبگرێ.

مەندووبی سامی بڕیاری دا ئەو کۆچەرییانەی کە باجیان بە شێخ مەحموود دابوو، لەکاتی گەڕانەوەیان لە کوێستاندا هەموو سزا بدرێن).

لە بڕگەی (٤٣١)ی هەمان دۆکیۆمەنتدا هاتووە (هێزی حکومەت لە ٢١/٦ تا ١٩٢٦/٦/٢٤ لە پێنجوێندا مایەوە. شارەکە چۆڵ کرابوو. هەموویان بەدیوی ئێراندا چووبوون. لەدەوروبەری پێنجوێندا چەند سوارێکی دوژمن بینراو هێزی ئاسمانیمان بۆردومانی کردن و دانیشتوانی ئەو گوندانەی بەشداریی شەڕیان کردبوو سزادران. دوای ئەوە هێزەکەمان رووی کردە خورماڵ و لە ٢٦/١٩٢٦/٦دا گەیشتە خورماڵ. ئەو ناوچەیە نزیکی (٦٠) چەتەی لێبوو و لەشەڕێکدا لەو ناوچەیەدا کاپتن **Bordie** بریندارکراو بڕیاردرا بنکەیەکی سوپایی هەمیشەیی لەخورماڵدا دامەزرێنرێ). هەروها لە بڕگەی (٤٣٢)ی هەمان دۆکیۆمەنتدا هاتووە (شێخ مەحموود چووە ئەودیو سنوورو لەوە دەچێ پیاوەکانی لە (بانە) و (مەریوان)دا جێگیربێن)"[١].

کەریم بەگ وەک سەرکردەیەکی بەوەفا لەوڕۆژە تاڵ و ڕەشەدا هەر لەگەڵ شێخ مەحموودا مایەوە و بەماڵ و منداڵەوە ئاوارەو دەربەدەری ئەودیوی سنوور بوون.

---

١- (م.ر.هاوار). ل٥٧٩-٥٨٠.

# شەهید بوونی کەریم بەگی فەتاح بەگ

هەر لەو بەشدارییە کاریگەرییەی کەریم بەگ لە شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحموود و دواتر کوشتنی حاکمەکان (کاپتن بۆندو ماکانت)، ئینگلیزەکانی بە جارێک بەرامبەر ئەو کەڵەپیاوە رق ئەستوورو بێزارکرد، بۆیە کەوتنە دانانی پیلانی شەهیدکردنی و بۆ ئەو مەبەستە پارەو ماڵی دونیایان خستە بەردەم داردەست و نەفس نزمەکانی خۆیان. دیارە ئەمەش لەدوای نائومێد بوونیان بووە لەوەی کە ئەم ئامادە نییە خۆی تەسلیم بەوان بکاتەوەو کۆڵ بدات کەبەر لە کوشتنی حاکمەکان لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٢ز، ئەم بێ ئومێدییەیان لە کەریم بەگ و کوشتنی حاکمەکانیش هاتە سەر ئەمانە، ئینگلیزەکانی زیاتر پەست کرد کە چیتر دڵیان بڕوایی ئەدا بزووتنەوەی رزگاریخوازی لە کوردستان واپەرەبستێنێ و کەوتنە دارشتنی بەرنامەی فیعلی بۆ تواندنەوەی.

هەوڵی کوشتن و سەنگەر پێ چۆڵ کردنی کەریم بەگ نیشانەی دوژمنکارییە لە تواندنەوەی هەستی رزگاریخوازی و نەهێشتنی جەنگی پارتیزانی لە کوردستان کە لەسەر دەستی ئەو پیاوە ئازایە بەرپا بووە"[١].

لەوکاتەی کە شۆڕشی دووەمی شێخ مەحموود لەکپ بوونەوەدا بوو شۆڕشگێرانی کورد لە ئەفسەرانی سوپاو هەندێک لە سەرۆک هۆزە ئازاکانی لەناو ئەوانە (کەریم بەگ) لەدیوی ئێران لە گوندی (وێڵە ژێر) سەر بە مەریوان بە سەرۆکایەتیی شێخ لە نائومێدی و دڵتەنگیدا دەژیان و بۆ فشار خستنە سەر دوژمن بڕیاریان دا مەفرەزە بنێرنەوە کوردستانی عێراق. لەم کاتەدا کەریم بەگ

---

١- د. عیزەددین مستەفا رەسووڵ لەوبارەیەوە بەراشکاوی دەڵێ: (کەریم بەگ ئەو قارەمانەیە کەسەرەتایەکی بلیمەتانەی بۆ شەڕی (پارتیزانی)ی پێشمەرگایەتیی کورد دانا.

بڕوانە: رۆژنامەی برایەتی. ژمارە (٣٩)ی ١٩٧٣/٢/٢١.

بەخۆی و بەسوارەکانییەوە خۆی گەیاندەوە بازیان و چەمچەماڵ هەتا بیسەلمێنێ ئەم وڵاتە داگیرکەر هەڵناگرێ»[1].

کەریم بەگ بەخۆی و «سابیرو عەبدوڵلای کوڕی و سوارەکانییەوە دەگەڕێنەوە بازیان و دواتر دەچێتە گوندی (قەرەتاموور)و لەکاتی نزیک کەوتنەوەی لەگوندەکە تەقەی لێ دەکەن بەتەنها گوللەیەک بەر ئەو دەکەوێت و بریندار دەبێت. هەر بەو برینەوە دەیگەیەننە گوندی (نوورە)و لەوێ گیانی سپاردو بۆ دواجار ماڵئاوایی لە وڵاتە شیرینەکەی کرد.

کەریم بەگ لەسەرەمەرگا وەسیەتی کوڕی و جەماعەتەکەی دەکات لەتۆڵەی ئەو کەس ئازار نەدەن. ئەوانیش بەهەموو هەوڵ و کۆششیان توانییان لاشەکەی بپارێزن بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەستی ئینگلیزەکان کە پارەی زۆریان بەخەڵات دانابوو بۆ خوێنی کەریم بەگ هەتا لاشەکەی بدزن و بازرگانیی پێوەبکەن.

خزم و کەس و سوارەکانی بۆ پاراستنی لاشەی کەریم بەگ لە دەستی ئینگلیزەکان دێن و لە هەموو گوندەکانی کانی مستەفاو ژاڵەو سەرئاوی باسەڕەو دواتر گوندی (دێلێژە) گۆڕی بۆ هەڵ ئەکەنن. بەڵام بە بەتاڵی گۆڕەکان پڕدەکەنەوە. ئینجا لەپاڵ مەرقەدی شێخ ڕەزای دێلێژە گۆڕ هەڵدەکەنن و لەوێ بەیەکجاری بەخاکی دەسپێرن، هەتا ئینگلیزەکان نەتوانن وا بەئاسانی لاشەکەی بدۆزنەوە. ئەو گۆڕانەی کە بە فێڵ و بۆ بزرکردنی لاشەکەی هەڵکەندرابوون، دیسانەوە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە هەڵکەندرانەوە، بەڵام نەیاندۆزییەوە. بەڵام ئەوەی ئێستا گۆڕی هەقیقی کەریم بەگەو لاشەکەی تیا شاردراوەتەوە پاڵ مەرقەدی (شێخ رەزای دێلێژە)یە.

ئینگلیزەکانیش لەدوایی دێن ئەو بڕە پارەی دایان نابوو بۆ بەخشینی ئەوانەی کەریم بەگ دەکوژن هەر (١٠٠) هەزار ڕوپیەکە بەسەر خەڵکی گوندی قەرەتاموور دەبەشنەوە.

---

١- بڕوانە: یاداشتەکانی شێخ لەتیفی شێخ مەحموود، ل١٤٤-١٤٦.

ئینگلیزەکان لەدوای کوشتنی حاکمەکان بەئاشکراو بەبێ پەردە رایان گەیاند هەرجی کەریم بەگ و سابیری کوڕی بکوژێ (١٠٠) هەزار رووپیە لە حکوومەت وەردەگرێ ئەم برپارەشیان بەناوی (مەندووبی سامی لەعێراقەوە دەرکرد هەرئەم خەلاتەش بوو دایان بە خەلکی گوندی قەرەتاموور.

ئینگلیزەکان لەوەش بێ ئومێدبوون کە کەریم بەگ بەشێخ مەحموود بە کوشت بدەن کە کردبوویانە مەرجی بەردانی لە دیلی. هاتن بە بڕیاری ژمارە ١٢٢ی رۆژی ٨ حوزەیرانی ١٩٢٥ کە مەندووبی سامی داوا لە مەجلیسی وەزارەتی عێراق دەکات جائیزە دابنێن بۆ ئەوکەسانەی ئەتوانن شێخ مەحموود و کەریم بەگ و سابیری کوڕی بکوژن. ئەوانەی کە ئەم ئیشە ئەنجام دەدەن سەد هەزار رووپیە لە حکوومەت وەردەگرن و داوادەکا ئەوانەی کە ئەم ئیشە دەکەن نابێ لە سوپای لیوی بن»[١].

کەریم بەگ لە ١٩٢٦/٦/٢٩ شەهید دەکرێ و محەمەد رەسوول هاوار بە پشت بەستن بە بەلگەنامەی ئەرشیفی بەریتانی لەکتێبەکەیدا دەلێ: (دۆکیۆمەنتی ژمارە C.O.730-15 . ٢٠٥٠ رۆژی ١٩٢٦/٧/٢٠ ئیستخبارات رقم ١٥ کردستان. برگە٤٦١- کەریمی فتاح بەگی هەمەوەند کە تائێستا چەند جارێک لە کوشتن رزگاری بووە، شەوی ١٩٢٦/٦/٢٩ لەکاتی هێرش بردنیان بۆ سەر گوندی (قەرەتاموور) زۆر خراپ بریندار کرا (کەریم بەگ لەو شەڕەدا کوژرا) کە نزیکی چەمچەمالە، هەرچەندە هەردوو کوڕەکەی هێشتا راکردوون، بەلام مردنی کەریم بەگ دەبێتە مایەی پەیدابوونی ئاسایش لەناوچەکانی نێوانی کەرکووک و سلێمانیدا. کەریم بەگی فەتاح بەگ ئەوەبوو کە (بۆند) و (ماکانت)ی کوشت و لەوساوە بەچاکترین شەرکەری چەتەگەری دەناسرێ»[٢].

١- بڕوانە رەمزی قەزاز، بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد، ل. ٢٣٠
٢- بڕوانە محەمەد رەسوول هاوار، دەولەتەکەی خوارووی کوردستان و شێخ مەحموودی قارەمان، بەرگی دووەم، ل٥٨٠-. ٥٨١

# بەڕێز کاک سەید کاکە

بەڕێز سەیید کاکە سەیید ئیسماعیل دەڵێ: (لە ساڵی ١٩٦٧ لەگەڵ خوالێ خۆش بوو بەرزانی چووین بۆ دۆڵی سووورداش لەوێوە چووین بۆ بازیان ٣ لێ بووین.

١- عەریف عوسمان.
٢- ئەحمەدی حاجی عەلی.
٣- سەیدکاکە سەید ئیسماعیل.

لە گوندی (ورمزیار) چاوم بە شێخ لەتیف شێخ مەحمودی حەفید کەوت، کە بەیەکەوە لە ماڵێک دەعوەت بووین. پێم وت ئێوە خەباتێکی زۆرتان کردووە لەرێگای ئەم کوردستانە ئێستا بۆ وا بەساردی لەگەڵ شۆڕش دەڕۆن.

وتی لەپاش هەرەس هێنانی شۆڕشی بابم چووینە ئێران، لەپاشان عەفوکراین و گەڕاینەوە عێراق. ئێمە دوو برا بووین، من و بابە عەلی و دایکم (عایشەخان) هاتینە داریکەلی. من و بابەعەلی منداڵ بووین چووینە ناو بێستانێک، بێستانچییەکە هەندێ بەردو شتی تێگرتین ئێمەش بەردێکمان بۆی هاویشت و پێیکەوت. لە چەمچەماڵ لای حاکمی سیاسی ئینگلیز شکاتی لێ کردین. ماوەی دوومانگە(دایکم) و(من) و(بابەعەلی) یان دەبردە چەمچەماڵ و لەوێوە بۆ سلێمانی. دایکم زۆرجار دەگریاو دوعای لێ دەکردن و کەس لەکورد بەهاوارمانەوە نەهات و کەسیش رێزی نەدەگرتین. ئێمەش لەبەر ئەوهۆیە دڵمان لەهەموو کورد شکاوە.

خوا کردی کەریم بەگ، حاکمی سیاسی و یەکێکی تریشی لەگەڵ ئەودا کوشت، ئەویش سەرلەشکری لیڤی بوو. ئیتر ئێمە، رزگارمان بوو. هەر کەریم بەگی هەمەوەند بوو لەدوای بەدیل گرتنی شێخ مەحموود لە شاخ مابووەوە. پێش کوشتنیان شەوێک هاتە ماڵمان و زۆر پەرۆشی ئێمەی بوو، وتی حاکمی سیاسی چەمچەماڵ لەناوچەی هەمەوەندو بازیان زۆر دەست درێژی دەکات، من نایەڵم بەسەریەوە بڕوات. ئیتر ئەوەبوو ئەوان لەدیوی سەنگاوەوە هاتن بۆ شاخی هەنجیرە لەوێ کوشتیان. هەر کەریم بەگیش بوو خۆی و ماڵ و منداڵی کرد بەقوربانی لەرێگای گەلی کورد)«[1]».

---

١- ئەم وتانەم لە کاک سەیید کاکە سەیید ئیسماعیل وەرگرت لەماڵی خۆیان لەرۆژی ١٩٩٨/٧/١ هەولێر.

# نەوەکانی کەریم بەگ و ڕۆڵی شۆڕشگێڕییان

یەکێک لە ئەو فاکتەرە گرنگانەی دەبووە هۆی بەهێزکردنی کەریم بەگ و مەرکەزی سەرکردایەتیی هۆزەکەی و شۆڕشگێڕانی میللەتەکەی کە هەمیشە لایەنگران و هاوسەنگەرانی زیاتر دڵیان خۆش بێت و دوژمنان و ناحەزانیش نیگەران و پەست بن، پشتیوانی و هاوسەنگەریتی بنەماڵەو نەوەکانیەتی، کەبەڕاستی نەوەکانی کەریم بەگ دەرچووی قوتابخانەی باوکیان بوون و لەگەڵ ئەودا یان لەدوای ئەو هاوسەنگەر و هاوباوەڕ و سەربازی بەوەفای کەریم بەگ بوون. ئەمەشیان بە عەمەلی سەلماندو لەوپێناوەدا کەریم بەگ ئاسا، یان شەهید یان دەربەدەرو یان ئاوارەی شـــاخ و داخی وڵاتی کـــوردەواری بوون لەپێناو پاراستنی کوردستان لەدەست درێژیی بێگانە.

هەریەک لە سابیر بەگ و عەبدوڵلا بەگ و ئەوانیتر هاوشان و هاوسەنگەر لەسەردەمی خۆیداو دوای خۆی، چ لە سەردەمی داگیرکەری ئینگلیزو یان دەسەلاتداری پاشایەتی و شۆڕشی ئەیلول، ئاگرو بڵێسـە بوون بەڕووی داگیرکەری کوردستاندا.

مێژوو هەتا ئێستا زوڵمی زۆری لە هەمەوەند کردووە بەتەنها کەریم بەگ و نەوەکانی کە قوتابخانەیەکن لەئازایەتی و بوێری و نەبەردی و هەڵوێست و ئارام گری لەپێناو پاراستنی کوردستان لەدەست داگیرکەران.

ئەوەی خســتـــمــانە ڕوو بەتەنهـا پەردە هەڵدانەوەیەکی سـەرپێـیی بوو لەهەڵوێست و ڕۆڵی کەریم بەگ و هۆزی ئازاو بەجەرگی هەمەوەند. دەبێت ئەوەش لەبیرنەکەین کە سابیر بەگی کوڕی و عەبدوڵلای کوڕی کەریم بەگ هەر لە کوشتنی حاکمەکانی ئینگلیزەوە هەتا شەڕەکانی بازیان و دەربەندی ڕانیە و دواتر شەڕەکانی شۆڕشی دووەمی شێخ مەحموود لەگەڵ باوکیان ڕۆڵی جوامێرانەیان گێڕاوە و پێکەوە مێژووی هەمەوەندیان ڕازاندۆتەوە. مێژووی

هەمەوەندیش بەشێکە لە مێژووی ئەم گەلە ستەمدیدەیە. بەڕێز د. فوئاد حەمە خورشید دەربارەی هۆزی هەمەوەند دەڵێت (.... دەبێت مێژوو چی بڵێت دەربارەی ئازایی و جوامێریی ئەم خێڵە؟ ئایا ئەمانە گشتی نەبەردی و جوامێری کورد پیشان نادەن دژی هێزی داگیرکەران؟ ئایا ئازایی و شاسواری بەنموونەیەک دانانرێ لە بەجەرگی و کۆڵ نەدان و بوێری ئەم گەلە؟ ئایا ئەمانە هەموو بەشێک نین لە مێژووی پڕشانازیی ئەم میللەتە ڕەسەن و دێرینە؟)"[1].

کەریم بەگ (پێنج) کوڕی هەبوو هەریەک بەم ناوانەی خوارەوە:

١- سابیر بەگ ٢- عەبدوڵلا ٣- عەزیز ٤- وەهاب ٥- ئەحمەد.

---

١- د.فوئاد حەمە خورشید، گۆڤاری رەنگین ژمارە (٨٤)، ل(٨) ساڵی ١٩٩٥،.

# سابیر بەگی کوڕی کەریم بەگ

لە ساڵی ١٨٩٣ لەدایک بووە و شوێنی لەدایک بوونی هەتا ئێستا نەزانراوە بەڵام لەوساڵە بووە کە هەمەوەندەکان لە باکووری ئەفەریقیاوە سەرگەرمی گەڕانەوە بوون. دەتوانین بڵێین سابیر بەگ لەدایک بووی ساڵانی میحنەت و کوێرەوەری و دەربەدەری هەمەوەندەکانە کە بنەماڵەکەی ئەمیش سەرهەنگ و سەرقافڵەی بووە. سابیر بەگ هەر لە منداڵییەوە بەشداری نەبەردو قارەمانێتیی هۆزەکەی بووە لەدژی تورکە ئیتحادییەکان و دواتر لە دژی ئینگلیز و بەشداریی کاریگەری هەبووە لە کوشتنی حاکمەکان و دواتر لەشەڕە یەک بەدوای یەکەکان و تەنانەت لە هەڕەشەی ئینگلیزەکان و بەخشینی خەڵات بۆ هەر کەسێک کەریم بەگ بکوژێ ناوی سابیری کوڕیشی لەپاڵدا باس کراوە.

لە شۆڕشی دووەمی شێخ مەحموود، سابیر بەگ ڕۆڵی کاریگەری بینی. نووسەری کتێبی (شاری سلێمانی) دەڵێ: (یەکەم عەشیرەت کە لە سەرەتای شۆڕشەوە بەشداریی کردبێ لەزەمانی تورکەکانەوە هەتا دوایی شۆڕش و بەئازایی و بەوەفایی ناوی دەرکردبێ، عەشیرەتی هەمەوەندە بەسەرکردایەتیی (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند) و کوڕەکانی (سابیر) و (عەبدوڵڵا بەگ))«[١]».

د. کەمال مەزهەر لە هەڵدانەوەی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز بۆ کۆمەڵەی گەلان لە ساڵانی ١٩٢٧-١٩٢٨ کەتیایا باسی کەریم بەگ و کوڕەکانی کراوە دەڵێ (بۆ باسی کورد و گەلێک باسی ئەوسای عێراق ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٢٧ هیچی لەوانی تر کەم نییە ..! هەر بەوجۆرەش ڕاپۆرتەکە ناوی سابیر و عەبدوڵڵای کوڕانی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند دەبات، ئەوانیش لەورۆژانەدا، بەپیشەی باو و باپیرانیان دلێرانە بەرەنگاری داگیرکەر هاتبوون. بەڵکو

---

١- ئەکرەمی مەحموودی ساڵحەڕەشە، شاری سلێمانی، بەرگی دووەم، ل. ١٢٤

ئەوساکە، وەکو ڕاپۆرتەکە بۆخۆی دەڵێ، تەنها ئەوان لە کۆڕی خەباتدا مابوونەوە و ئینگلیزەکان کوناو کون بەفڕۆکە و سوارە و سەربازی لیڤی دوویان کەوتبوون)»[١].

هەموو کوڕەکانی کەریم بەگیش شوێن پێ هەڵگری ئەو سەرکردەیە بوون و لەم پێناوەشدا گیانی خۆیان بەخت کردووە. لە دۆکیۆمەنتی ژمارە 15-730 . ٥ . ٢ ڕۆژی ١٩٢٦/٧/٢٠ ئیستخبارات ڕەقم ١٥ کردستان:

لە بڕگەی ٤٦٣دا هاتووە (شێخ مەحمود هێشتا هەر لە (وێلەژێر)ە کە نزیکی (٣٠٠) سوارو (١٥٠) پیادەی لەگەڵە. سابیری کوڕی کەریم بەگ بە (٥٠) چەکدارەوە هاتۆتە ناوچەی بازیان. سەید محەمەدی جەباری کە لەگەڵ شێخ مەحمووددا لەسەر ئەوە تێکچووە کە هێرش برابووە سەر (گڵ) لەوساوە وازی لە شێخ مەحمود هێناوەو خۆی تەسلیمی متەسەریف کردووەو لێ خۆش بوونی بۆ دەرچووە). سابیر بەگ لە دۆکیۆمەنتی ژمارە c.o. 730-95 ڕۆژی ١٩٢٦/٨/١٨ دەربارەی ڕۆڵی شۆڕشگێڕانی کورد لە پێنجوین لە ١/٦/ ١٩٢٦ هەتا ١٩٢٦/٧/١١دا کە سابیر بەگ و سوارەکانی هەمەوەند ڕۆڵیان دیاربووە لەباسی ڕۆژی ٦/١٨، لەو دۆکیۆمەنتەدا هاتووە (لە ٦/١٨ ئاگادار کراین کە جافەکان شێخ مەحمودیان بینیوە و بڕیاریان داوە باجی بدەنێ چونکە ترسی ئەوەیان لێ نیشتووە کە دوا بکەون و بەوهاوینە نەگەنە کوێستان. سابیری کەریم بەگ و چەکدارەکانی لەوە دەچێ ڕوو بکەنە دەشتی (قزڵجە))»[٢].

---

١- د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لەمێژووی گەلی کورد، ل١٢١-١٢٢.

٢- (م.ر.هاوار)، بەرگی دووەم، ل٥٨١- ل٥٨٢.

# شەڕی شیوی قوڕاوە

سـابیـر بەگ دوای شـەهیـدبوونی باوکی لە ناوچەی پێنجـوێنەوە بەسوارەکـانییـەوە دێتە ناوچەی بازیان و دەوروبەری. ئەو دەربەندبازیانەی کە باوکی ئازایەتی و نەبەردی و مـەردایەتی تیـا تۆمـارکـردووە، لەبەرامـبـەر داگیرکەران. سابیر بەگ نیـازی وابوو لێدانێکی گەورە لە دوژمن بدات، بەڵام دوژمن ئاگادار دەبێ و لەکـاتی هاتنییـەوە بۆ ئەو شـوێنە هێزێک دەنێـرن بۆ سەریان، هێزەکـەی دوژمن دەگـاتە (تەکـیـەی کـاکـەمـەند) پاشان لە (حـاجی ئەلیاس)ەوە دەگەنە مـاڵی (کوێخا بارام) کە لەقەڵایەکدا بوو بەدیار شیوەکەوە. (کوێخا بارام)یش بەنهێنی (فەتاح)ی کوڕی بەپەلە دەنێرێ بۆلای (سابیر بەگ) بۆ ئەوەی خۆیان دەرباز بکەن، (فەتاح) بەڕاکردن دەگاتە لای و دەڵێ: فریاکەون دوژمن گەیشتە سەرتان.

(شیوە قوڕاوە) شوێنێکی ستراتیژییە و گردو تەپۆلکە و حەشارگەی سەختی تیـا هەڵکەوتووە و چەندین ملەی بەرزی وەک (حـوشـتـر مل- بەلاڵوک- کرۆسک- بێژنگ بەسەر)ی تێدایە. (حوشتر مل) بەرزترین ملەیانەو (١٥٠٠) پێ لەئاستی چەمەکە بەرزە. لەشکرەکەی دوژمن لێیـان نزیک دەبێتەوە و شەڕ لەنێوانیـاندا دەست پێدەکـات. سابیر بەگ سێ گـوللەی بەردەکەوێ و بریندار دەکـرێ، خۆی دەگـەیەنێتە سـەر پشـتی ئەسـپەکـەی لەئەنجامی هەڵمـەت برندندا ئەسپەکەشی بریندار دەکرێ، لەتاوا ئەسپەکەی مل بە بەرزایی (حوشتر مل)ەوە دەنێت. سابیر بەگ دەگەیەنێتە سەر ملەکەو گوللەیەکی تر بەر سەری ئەسپەکە دەکەوێ و دەکوژرێ. دەست دەکـات بەشەڕ کردن لەگەڵ ئۆردووەکە. چەند جارێ هێرش دەبەنە سەری، بەڵام سەرکەوتوو نابن. تا رۆژ ئاوا دەبێت بەرگری دەکەن لەپاشان شەڕ تەواو دەبێت. ئۆردووەکەی دوژمن دەگەڕێنەوە بۆ چەمچەماڵ.

(سابیر بەگ) بەهۆی سەختیی برینەکەیەوە کەس بەتەما نابێت کە بمێنێت سوارەکـانی دەیبەنە مـاڵی (کـوێخـا عـەزیزی تەوەکەل)، کە چارەیەکی بکات و خۆشیـان دەگەڕێنەوە سنوورەکانی ئێران.

(کوێخا عەزیز) زۆر خزمەتی سابیر بەگ دەکات و دەیباتە ماڵی (شێخ عیسا) و لەوێشەوە دەیباتە ماڵی (مەلا مارفی قشلاخ)«[1]» دەیشارنەوە، کاتێ هەواڵی کوژرانی ئەسپەکەی و بریندار بوونی سابیر بەگ دەگاتە دوژمن هێزێکی گەورەتر کۆدەکەنەوە گوند بەگوندی ناوچەکە بەدوویدا دەگەڕێن تەنانەت ئەشکەوتەکانیشیان پشکنی بوو (شێخ حەسەن)ی کانی چنار«[2]» پیاوێکی بەناوبانگ و ئیمانداری ناوچەکە لەڕێگای دۆستەکانییەوە (سابیر بەگ) بە برینداری دەهێنێتە ماڵی خۆیان و لەشاری سلێمانییەوە داوو دەرمانی بۆ دەهێنێ و چارەسەری برینەکانی دەکات، لەدواییدا لەلایەن خزمەکانییەوە دەگەیەنرێتە ناوچەی هەورامان و دزڵی«[3]»، لەو دەمەدا ڕێککەوتنێک هاتەکایەوە شێخ مەحموود لەگەڵ ئینگلیزەکان خورماڵیان دیاری کرد کە وەفدی هەردوولایان بێنە ئەو جێگایە مامۆستا عەلائەددین سوجادی نووسیویەتی (ئینجا لە ٤/ئەیلوولی ١٩٢٦دا مستر کورنوالیس ڕاوێژکاری ناوخۆیی (کاپتن هۆڵت) سکرتێری مەندووبی سامی بەغدا و پشکنەری ئیداری سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەوە بەڕێکەوتن بۆ (خورماڵ) و لەولاشەوە شێخ مەحموود بەخۆی و چەند پیاوێکەوە هات و کۆبوونەوەکەیان (٣) سەعات درێژەی کێشا، لەم کۆبونەوەیەدا قسەیان لەگەڵی شتەوە کرد. لەئاخرا لەو شوێنەدا لەسەر ئەم شتانەی خوارەوە ڕێککەوتن: (ڕێککەوتنەکە بریتی بوو لە شەش خاڵ، مەبەستمان لەخاڵی شەشەمە کە ئەمەش دەقەکەیەتی).

حکوومەت لە هەندێ لەژێردەستەکانی خۆشبێ بەرانبەر بەچەند پەیمانێک،

---

١- (قشلاخ) گوندێکە دەکەوێتە باکووری تەکیەی کاکە مەندەوە ئەم گوندە کانزاییەکی گەچی زۆری تێدا هەیە.

٢- (کانی چنار) گوندێکە دەکەوێتە بنار شاخی دەربەندبازیان ئەم گوندە هەر لەکۆنەوە مەڵبەندێکی ئاینی بوو و کەلێ جار بۆتە جێگەی پاراستنی خێزانی هەمەوەندەکان لەکاتی شەڕو شۆڕدا لەدژی دوژمنانی کەلی کورد.

٣- سەروەر ئەحمەد کەریم چەند لاپەڕەیەکی شاراوە لەمێژووی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند ل٤٢.

بەڵام ئەوانەی کە تاوانەکانیان زۆر گەورەیە لەوانە خۆش نابێت. (مەبەست لەو تاوانبارانەش: (کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند) و (سابیر بەگی کەریم بەگ) و (شێخ عەلی قەڵبەزە) و (شێخ محەمەدە بچکۆلە) و (خەلیفە یوونس) بوو»[1]).

لەکاتی ئەم ڕێکەوتن نامەیە (کەریم بەگی فەتاح بەگ) شەهید کرابوو، بەڵام ناویشی لەلیستی (گوناحبارە زۆر زلەکاندا) هاتووە، وادەردەکەوێ کە بەرواری ڕێکەوتنەکە هەڵەبێت کاتێ ئەم دانیشتنە کرابێ پێش شەهید بوونی (کەریم بەگ) لە ١٩٢٦/٦/٢٩. یان ئەو لیستە کۆن بووە.

مامۆستا محەمەد ڕەسووڵ هاوار لەکتێبەکەیدا ئاماژە بەوە دەدات نووسیوبەتی (ج- ئەوانەی لەگەڵ شێخ مەحموود- دان و دەیانەوێ بگەڕێنەوە دەبێ ئەوانیش شتێکیان بدرێتێ تەنها (سابیر کەریم بەگی هەمەوەند) نەبێ، وابزانم چارسەرکردنی ئەویش شتێکی گران نییە»[2]).

ئەمانەش بەڵگەی مێژوویی ترن کە خۆڕاگری و ئەبەزی ئەو قارەمانە دەسەلمێنن کە بەهیچ جۆرێک ئامادە نەبووە سەنگەری خەبات بەجێ بهێڵێ و خۆی بەدەستەوە بدات. بۆیە ئینگلیزەکان ناچاربوون نەخشەیەک دابڕێژن بۆ کوشتنی. ئەوە بوو لەساڵی ١٩٢٧دا کە شێخ مەحموود و هەندێ لە فەرماندەو سەرکردە سەربازییەکانی لەشاری (مەریوان) ئاوارەبوون و دەستی ئینگلیزیان پێ نەدەگەیشت، سابیر بەگیش بە ماڵ و منداڵەوە دەچێتە گوندی (مرانە)ی نزیک مەریوان.. دووکەس کە برای یەکتر دەبن لەلایەن ئینگلیزەوە تەرخان کراون بۆ کوشتنی شێخ مەحموود و سابیر بەگ، دەچنە مەریوان و داوا لە شێخ دەکەن کە ڕێگەیان بدات لە خزمەتیدابن.. سابیر بەگ زانیاری تەواوی دەربارەی نیازی گڵاویان دەست دەکەوێت بۆیە دەنێرێت بەدوایاندا بۆ ئەوەی دەسگیریان بکات.. یەکێکیان دەگرێ و ئەوی تریان خۆی دەشارێتەوە، شێخ مەحموود ئاگادار

١- عەلائەددین سەجادی مێژووی کورد و کوردستان، ل١٠٨-١٠٩.
٢- (م.ر.هاوار)،ل٦٩٦.

دەکاتەوە لەبارەیانەوە ئەویش فەرمانی کوشتنیان دەدات.. بەندکراوەکە دەکوژرێ و ئەوی تریان کە خۆی شاردبۆوە پاش چەند رۆژێک لەکاتی نوێژی شێواندا بەنهێنی سەردەکەوێتە سەر باڵەخانەی سابیر بەگ و لەوکاتەدا کە سابیر بەگ نوێژ دەکات دەرفەتی لێ دەبینێ و تەقەی لێ دەکات و دەس بەجێ شەهیدی دەکات و خێزانەکەشی بریندار دەکات.. کابرا هەڵدێ بەڵام لەرێگە دەگیرێ و دەبرێتە خزمەت شێخ مەحموود. شێخیش فەرمان دەدات کە گوللە بارانی بکەن و دەستبەجێ دەیکوژن.

سابیر بەگ دەسنووسێکی بەجێ هێشتووە کە بەشێکی زۆر لە ڕووداو و شەڕو شۆڕو بیرەوەریی خۆی و کەریم بەگی باوکی تێدا تۆمارکراوە. کە زۆر بەکەڵکە، پشت بەخوا لەداهاتوودا سوودی لێ وەردەگیرێت.

# عەبدوڵڵا بەگ
# کوڕی کەریم بەگی هەمەوەند



لە ساڵی ١٨٩٠ز لەدایک بووە، کە ئەو ساڵە هەر دەکەوێتە ساڵانی دوورخراوەیی و ئاوارەیی هۆزەکەیەوە لەتەمەنی لاوێتیدا لەگەڵ باوکی بووەو لە زۆربەی زۆری داستان و شەڕەکان بەشداریی کردووە دووجاریش بریندار بووە پاش شەهیدبوونی سابیر بەگی برای سەرپەرشتیی چەکدارەکانی کردووە، لە شاخ ماوەتەوە هەتاکو شۆڕشەکە وردە وردە بەرەو کزی چووە، خۆیشی پیر بوو بوو توانای شەڕی نەمابوو هەتاکو دواجار لە ساڵی ١٩٧٩ لە تەمەنی ٩٠ ساڵیدا لە چەمچەماڵ کۆچی دوایی کرد لەپاش خۆی یەک کوڕی بەجێ ماوە بەناوی (کەریم).

# عەزیز بەگ کوڕی کەریم بەگ

مام عەزیز هەر لە منداڵییەوە چاوەکانی دووچاری نەخۆشی بووە لە ساڵی ١٩٢٢دا لەگەڵ دایکی و براو خوشکەکانی ئاوارەی ناوچەکانی سەر سنووری ئێران بووە لە دواییدا لە ناوچەی شێخ بزێنی لە گوندی کانی (هەنجیر) نیشتەجێ دەبن لە دووریی گوندەکە لە رەزێکی هەنجیردا خۆیان دەشارنەوە لە ترس گرتنی ئینگلیزەکان لەو رەزەدا ژوورێکیان بە بەردو قوڕ بۆ دروست دەکەن.



مام عەزیزو ئامینەی خوشکی بە هۆی ئاوی هەنجیرو سەرماوە تووشی نەخۆشی دەبن مام عەزیز چاوی بەتەواوی دێتە کزی. کەریم بەگ مام عەزیزی کوڕی زۆر خۆش ویستووە هەرچی نامەو نووسراوی کەریم بەگ بووە مام عەزیز بۆی پاراستووە لە دوای شەهیدبوونی کەریم بەگ هەرچی نامەو بەڵگەنامەیەکی لامابوو بە شێوەیەکی جوان پاراستبوووە هەتاکو ساڵی ١٩٧٥ مام عەزیز زۆر لە بیردوەرییەکانی کەریم بەگ و سابیر بەگی لەلابوو، ئێمەش کە لەو ئاستەی رۆشنبیریدا نەبووین کە بیپارێزین و هەڵی بگرین زۆر جاریش داوامان لێ دکرد پێمانی نەدەدا، دەیگوت ئەوە باوکم بەمنی داوە، ئێمەش بێ دڵیمان نەدەکرد، بەڵام بە ناوی خوێندنەوە هەندێ جار نامەو بەڵگەنامەمان لێی ئەشاردەوەو هەڵمان ئەگرت هەندێ نامەو بەڵگە نامەی تریش لای باوکی خوا لێ خۆش بووم بوو لە کاتی خۆیدا لەگوندی باینجان لەگەڵ ئەو نامانەی مام عەزیز هەتاوەکو ساڵی ١٩٧٥

هەڵی گرتبوو، لە ساڵی ١٩٧٦ بە هۆی بارودۆخی ناوچەی چەمچەماڵەوە مام عەزیز ترسابوو هەموو ئەو نامەو بەڵگە نامانەی فڕێ دابووو فەوتاندبووی ئەوانەی لای ئێمەش کە لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا باسم کردووە هەر بەو دەردە چوون.

ساڵی ١٩٨٢ مامۆستا عەبدولڕەقیب یووسف بەدوای ناوبانگیی کەریم بەگ و هەمەوەندەوە دێت بۆ چەمچەماڵ کە زۆر بە پەرۆشەوە دەگەڕا بە دوای بەڵگە نامەو نووسراو و کەلەپووری کۆندا لە چەمچەماڵ سەردانی مام (عەزیز) دەکات کاتێک بەم حاڵەتە دەزانێت زۆری پێ ناخۆش دەبێت بە فەوتاندنی ئەو بەڵگە نامانەی کەریم بەگ.

مامۆستا عەبدولڕەقیب یووسف دەڵێ: (لەم ڕووەوە نموونەی زۆرو کارەساتی گەورە ڕووی داوە بەوێنە بەڵگە نامەکانی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند کە قارەمانێکی کورد بووەو دەیان نامەی شێخ مەحموودو ئینگلیزەکان و گەورەپیاوانی وەک مەحموود خانی دزڵی و نووری باویلی بۆچووەو تەنانەت ٣-٤ کاغەزو نامەی (مستەفا کەمال)یشی لە نێودابووە کە بۆی ناردووە، یەک تەنەکە لەم جۆرە بەڵگەنامانەی کەریمی فەتاح بەگ پاش شەهیدبوونی لە لایەن نۆکەرەکانی ئینگلیزەوە کەوتۆتە لای عەزیزی کوڕی کە بەزگماک کوێرە ئەویش دوای چەند ساڵ هەڵگرتنی لە ساڵی ١٩٧٦ لە شاری چەمچەماڵ فڕێی داوەتە دەرەوەو فەوتاندوویەتی ئەو چەمچەماڵەی کە دەکەوێتە سەر ڕێگەی هەمیشەیی نووسەران و شاعیران و چیرۆک نووسانی کورد کە لە ئەیلوولی ١٩٨٢دا بە نیازی دەست خستنی هەندێک بەڵگە نامەی ئەم قارەمانە کوردەو وەرگرتنی زانیارییەکی فراوان و زیندوو لەو کەسانەی کە لەگەڵیدابوون چووینە چەمچەماڵ ئەوسا بەم کارەساتە دڵ تەزێنەمان زانی و بە عەزیزمان گوت: بۆچی ئەو تاوانە گەورەیەت کردووە گوتی: لە ترساندا ئەم سووتاندووە نەشم ئەزانی ئەو نووسراوانە ئەوەندە بەنرخن کەسێ نەبوو لێیان بپرسێ و هەتاوەکوو خوێندەوارێکیش پێی ڕانەگەیاندم بیان پارێزم کەواتە تاوانەکە تەنیا هی من

نییە گوتمان راست دەکەیت ئێمەیش هەر تاوانبارین ئیدی بەداخێکی گرانەوە گەڕاینەوە»[1].

---

١- عەبدولڕەقیب یوسف، بانگەوازێک بۆ ڕووناک بیرانی کورد ساڵی ١٩٨٥ چاپخانەی کامەران سلێمانی، ل١٠ .

# حاجی وەهاب بەگ کوڕی کەریم بەگ

مام وەهاب هەر لە سەرەتای تەمەنی منداڵییەوە ژیانی تێکەڵ بە ئازارو ئەشکەنجەی ئەندامانی خێزانەکەی دەبێت دیارە کە کەریم بەگ باوکیان وەها قارەمانێک و ناودارێکی میللەتی کورد بوبێت. کە هەتا دووا ڕۆژەکانی ژیانی لەملمیلانێ و بەربەرەکانی کردن دابوو بێت بەرامبەر بە داگیر کەران و گەردەلوولی سەرکوت کەرانەی ئەو سەردەمانەی ئینگلیزو ڕژێمە کۆنەپەرستەکانی پێشوو، وەها جەنگاوەرێک هەمیشە ژیانی ناسوودە، ئارام و پڕتام و چێژی کۆشک و تەلاری پاشایانەی بۆ نەڕەخساوە ئەمجا کەسێک وەها ژیانێکی پڕ لە ناسوودەی بۆ خۆی نەرەخسێت لە ژێر پەڵەهەوری ڕووداوە یەک بەدوای یەکەکانی ئەو ڕۆژگارە بێ گومان دەبێت ژیانی ئەندامانی خێزانی وماڵەکانیشی هەمیشە لەژێر لێزمەی بارانی ئازارو ئەشکەنجەکانی ناهەموار و بەردەڵ بەردی ژیان دابووە.



مام وەهاب پیاوێکی قسەخۆش و ڕووبەپێکەنین بووە سەرەتای تەمەنی ژیانی لەچەمچەماڵ و بازیان و ناوچەی شێخ بزێنی گوندی سەرچنار بەسەر بردووە پاشان کە گەورەبووە سەرقاڵی بازرگانی بوود.

# ئەحمەد بەگی کەریم بەگی هەمەوەند

ساڵی ۱۹۱۷ لەبازیان لەدایک بووە، لەتەمەنی ۱۰ ساڵیدا لەسەر دەستی



مامۆستای تایبەتی فێری خوێندەواری بووە تاکو ساڵی ۱۹٦۰ لەبازیان ماوەتەوە لەدواییدا هاتۆتە چەمچەماڵ لەلایەن وەزیری داخلییەی ئەوکاتە کراوە بەسەرۆکی پۆلیسی عەشایەری ئەو ناوچەیەو ماوەیەک چۆتە ناوچەی شێخ بزێنی کە ماڵیشی لە (سەرچناری) شێخ بزێنی بووە لەوکاتەدا چەند ساڵێک لەوێ دەمێنێتەوە لەناوچەکەدا رێزو حورمەتی هەبووەو خاوەن دیوەخان بووە.

لەناوەندی شەستەکاندا سەردانی جەنابی مەلا مستەفای کرد لەبارزان جەنابی بارزانی فەرمووبووی ئێوە ساحێبی شۆڕشن و خۆتان خەباتێکی دوورو درێژتان هەیە لە کوردوستاندا، هیواخوازین کە رێگای باوو باپیرانتان بەرنەدەن چونکە ئەوان لەم رێگایەدا ماندووبوونێکی بێ حەدیان بووە بەرێزو قەدرێکی زۆرەوە جەنابی بارزانی فەرمووبووی ئەو هەمەوەندانە کە لەگوندەکانی خۆیان نەماون ئازادن ئەگەر بگەڕێنەوە جێوڕێی خۆیان بەنووسراوی جەنابیان هەندێ لەو پیاوە ناودارانەی هەمەوەند گەڕانەوە گوندەکانی خۆیان ئەحمەد بەگیش ماڵەکەی بردەوە باینجانی بازیان لەلایەن جەنابی بارزانییەوە پلەی سەرلقی پێ دراو ناوچەی بازیانی پێ سپێردرا.

مامۆستا عەبدولمەجید فەقێ حەسەن دەڵێ: (ئەحمەد بەگ یەکێکە لە سەرۆکەکانی عەشیرەتی هەمەوەند لەقەزای چەمچەماڵ، خاوەنی دەسەڵات و پلەو پایەیەکی بەرزی هەبووە لەناوچەکەو لەساڵی ۱۹۱۷ لە چەمچماڵ لە دایک

## احمد بك بن كريم بك


احمد بك بن كريم بك

من رؤساء عشيرة « الهاوند » في قضاء جمجمال ومن اصحاب الجاه والنفوذ والمنزلة العالية . ولد عام ١٩١٧ م في قصبة جمجمال ، وتلقى مبادىء علومه على أيدي أساتذة خصوصيين . وهو يتولى الآن رئاسة شرطة العشائر في قضاء جمجمال ، ويقوم بصيانة الامن في منطقته بكل همة واخلاص . ومما يسهل مهمته في هذا السبيل ان له تأثيراً شخصياً في تلك الجهات وهيبة في نفوس السكان الذين يقدرون مكانته ويعرفون منزلته الكبيرة ومزاياه السامية .

وله الآن من الانجال ولدان : هما « علي » و « سالار » وهما لا يزالان يحصلان العلم في المدارس الابتدائية .

بووه لەسەردەستی مامۆستای تایبەتی فێری خوێندەواری بووەو ئێستا سەرۆکی پۆلیسی عەشایەرە لە چەمچەماڵ، بەهەموو دڵسۆزییەکەوە پارێزگاری لەبەرقەراربوونی ئاسایش دەکا، هەر لەبەر چەند هۆیەک ئەم کارانەی بۆ ئاسان بووە لەبەر ئەوەی کەسایەتییەکی ناودارو خاوەن ڕێزبووە.

ئێستا دوو کوڕی هەیە بەناوی عەلی و سالار لەقوتابخانەی سەرەتایی دەخوێنن»[١]).

(ئەحمەد بەگ) لە شۆڕشی ئەیلولدا. کاک ڕەشید سندی دەڵێ: (پێش ساڵی ١٩٦٧دا لەشاری سلێمانی ئامر هێزی ڕزگاری بووم. لە سنووری شاری

١- عبدالمجيد فهمي حسن، تاريخ مشاهير الالوية العراقية، صحفي تاريخ الاسر العراقية المشهورة بعراقتة، ورجالاتها وزعمائها، الجزء الاول، ل٣٥٦ مطبعة الزمان- بغداد ١٩٤٦.

سلێمانی دۆستایەتییەکی پتەوم هەبوو لەگەڵ هەمەوەندەکان بەتایبەتی خوالێخۆشبوو (ئەحمەد بەگی کەریم بەگ)ی هەمەوەند.

بیرم دەکەوێتەوە رۆژێک لە دۆڵی سووورداش بەمەبەستی ئەوەی بۆسەیەک بۆ دوژمن دابنێین، بەڵام دوژمن ئاگاداربوو لەدۆڵی بازیانەوە هێزێکی گەورە بۆمان سەرکەوتن کە پشتمان لێ بگرن پێش ئەوەی ئەو هێزە لەبازیانەوە بکەوێتە رێ (ئەحمەد بەگ) سالاری کوڕی نارد بۆلامان بۆ ئەوەی ئاگادارمانبکاتەوە، کاتێکم زانی سالاری کوڕی ئەحمەد بەگ لە ئەسپەکەی دابەزی سلاوی باوکی پێ ڕاگەیاندم و وتی باوکم دەڵێ: هێزێکی گەورە وا سەردەکەون تا پشتتان لێ بگرن، وریابن. بەڕاستی ئەم هەواڵە خەسارەتێکی گیانی زۆری ئێمەی پاراست. پاشان چووین بۆسەکەمان گواستەوە پێش ئەو هێزەی بازیان، کەنزیک بوونەوە تەقە دامەزراو بەپشتیوانیی پێشمەرگە بەجەرگەکان توانیمان سەربکەوین و دوژمن هەڵهات، دوژمن لەم شەڕەدا کوژراو و بریندارێکی زۆری لەپاش بەجێما.

کاک رەشید سندی دەڵێ (لە ساڵی ۱۹٦۷ خوالێ خۆشبوو (ئەحمەد بەگی هەمەوەند) لەگوندی هەڵەدن هات بۆلام، نامەیەکم بۆی نووسی بۆ خوالێ خۆشبوو بارزانی کاتێک دەچێتە لای زۆر ڕێزی لێ دەگرێ و سێ رۆژ لەبارەگای بارزانی میوان دەبێت. خوالێ خۆشبوو بارزانی دوو رەشاش برنەو و بیست تفەنگی جۆراوجۆر بەخەڵات دەداتە (ئەحمەد بەگ) و بەبڕیاری خۆی دەیکاتە سەرلق، ناوچەی بازیانی پێ دەسپێرێ"[١].

(ئەحمەد بەگ) دەگەڕێتەوە ناوچەکە، لەوکاتەی کە سەرلقی (٢)ی هێزی رزگاری بوو لەناو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بەشداریی ئەم شەڕانە دەکات (شەڕی گوندی باینجان، شەڕی گوندی بیبیچەگ، شەڕی گەورەدێی لای بازیان، سووورداش، چیای خاڵخاڵان، داستانی گەورەدێ لای مالوومە لەساڵی

١- کاک رەشید سندی لە بەرواری ١٩٩٨/٨/٨ لە (مصیف صلاح الدین) چاومان بە بەڕێزی کەوت.

١٩٦٩). لەبەرواری ١٩٧٠/١١/٢٠ هەر لەدۆڵی بازیان کـــۆچی دوایی دەکات، لە چەمچەماڵ بە خاکی دەسپێرن.

ئەم کوڕانەی لەپاش بەجێ ماوە (عەلی، سالار، سەردار، دارا، سەروەر).

# نامیق حوسێن ئاغای هەمەوەند

ساڵی ١٩٨٨ کۆچی دوایی کردووە، مام نامیق یەکێک بووە لە وانەی کە لە سەرەتای شۆڕشەوە لەگەڵ کەریم بەگ بووە هەر لە کاتی شەڕی دەربەندی بازیانەوە هەتا شەهید بوونی کەریم بەگ مام نامیق کۆڵی نەداوەو بەشداریی هەموو شەڕەکانی کردووەو یەکێک بووە لەوانەی لە هیچ کاتێکدا پشتی کەریم بەگی بەرنەداوەو سوارەی پشت و هێزی بووە.



مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف دەڵێ نامیق حوسێن ئاغایی هەمەوەند یەکێک بووە لە وانەی شان بەشانی کەریم فەتاح بەگ و سەید محەمەدی جەباری و مەحموود خانی دزڵی خەباتی کردووە لە ڕۆژی ١٩٢٢/٦/١٨دا لە کوشتنی نەفەرە ئینگلیزەکان لە بازیان لەگەڵ کەریم بەگ دا بووە لە دواییدا چوونەتە سەر ئاوی سیروان و لە کفریش زیانێکی قورسیان لە ئینگلیز داوەو پاشان ڕوویان کردۆتە ڕەواندز لەگەڵ هێزی ڕەواندزدا بەشداریی شەڕی ڕانییەیان کردووە"[1].

---

١- عەبدولرەقیب یوسف بانگەوازێک بۆ ڕووناک بیرانی کورد، ل٤٠ .

# نەوەکانی ئەحمەد بەگ لەگەڵ خزمەکانی ١٩٧٥

لە دوای ئەحـمـەد بەگ ژمـارەیەکی بەرچاو لە نەوەی کـەریم بەگ لە کـوڕەزاو خزمی نزیکی لەکۆڕی خەبات و مەردایەتی ماونەتەوە رۆڵی کاریگەریان هەبووە بەرامبەر بە دوژمنانی گەلەکەمان کە ئەم بەڕێزانە بوون کاروباریان گرتە دەست.

١- سالار ئەحمەد کەریم بەگ کوڕەزای کەریم بەگ.
٢- حەمە شەریف تاهیر حەمە ئەمین ئاغا.
٣- کەریم عەبدوڵلا کەریم بەگ کوڕەزای کەریم بەگ.
٤- سەردار ئەحمەد کەریم بەگ کوڕەزای کەریم بەگ.

ئەم بەڕێزانەش کە لەخوارەوە ناویان نووسـراوە پشتگیـرییـان لێ کردوون و لەگەڵیاندا بوون.

١- محەمەد رەحیم ناسراو بە حەمە زێدان.
٢- قادر مەجید سەعید ناسراو بە قادر نەبو شوارب.
٣- عەزیز محەمەد کاکەمەند.
٤- محەمەد حوسێن کانی چناری..
٥- سابیر گەبەیی.
٦- حەمە شەریف ئەحمەد عارەب.
٧- حەمە شەریف ئەحمەد نەسرەددین کەرو لاڵە.

چەندانی دیکە کە ناوەکانیان لەیادم نییە.

شایانی باسـە کە ئەم بەڕێزانە بەوەفـابـوون بۆ ئەحـمـەد بەگ و بنەمـاڵەکەی لە دوای خۆیشی. ئەم قارەمانانە بەشداری شەڕەکانی تەیناڵ و شەڕی باوەمەندان لە

ناوچەی سووورداش و رەبیــــەی باریکە"[1]" لەبازیان و شـەڕی گـەورەی چیـای سپیلکیان کرد لەزنجیرە شاخی پیرەمەگروون"[2]". بەشداری جدی و کاریگەریان هەبووە تا نسکۆی سالّی ١٩٧٥ز.

---

١- لەم شەڕەدا حەمە زێدان بریندار بوو.

٢- لەم هێرشـەدا کاک سـالار ئەحـمـەد بەگ لەگـەڵ حەمـە شـەریف ئەحـمـەد عـارەب هەردووکیان بەسەختی برینداربوون و رەوانەی دەرەوەکران.



ئەمین رەشید ئاغا
سەرەک تیرەی رەمەوەند
نائب بوود لە مەجلسی نواب کەرکووک



ئەفتی محەمەدی مۆزتکە
سەرۆکی تیرەی رەشەوەن
نائیب بووە لەمەجلیس نواب کەرکووک



عارف ئاغای کاکەوللا ئاغای عەزیز
ئاغای خانە لە بەگزادەی هەمەوەند



مەلا ئەبو بەکر کۆیی
زانایەکی ئایینی بەرز بووە لە بەگزادەی
هەمەوەند



ئەحمەد حەمە سالح سەعید سۆفیوەند
ئەم بنەماڵەیە ناسراوە بە بنەماڵەی
(سەعەسوور) لە شاری هەولێر



ئەنوەر ئاغای کوڕی حەمەئەمین ئاغای
کوڕی فەقێ قادر ناودارو خۆشەویستی
هەممەوەندە



حاجی قارەمان فەتاح شەریف سەفرالی



سلێمان محەممەد سلێمان
پیاوێکی بەناوبانگ و ئازابووە



حاجی کاکە عەبدوللا حەیدەر عەزیز



نادر رەشید نادر خەسرەو



مەجید ئاڵەی هەمەوەند



نەجمەددین فەتاح نەسرەددین



رەحیم رەحمان نادر ناسراو بە رەحیم دزێنە



حاجی حەکیم یادگار عەزیز ئاغا



حاجی محەممەد محیەدین حوسێن



ئەحمەد نەسرەددین ئەحمەد ئاغا

العدد ٢١٥ السبت ٣ أيار ١٩٩٧ السنة الخامسة



## وثيقة عثمانية
## تنشر لأول مرة

إعداد/ زيناكو فؤاد
جامعة السليمانية

# عشيرة الهماوند:

تعد عشيرة الهماوند من أهم العشائر الكردية في كردستان العراق التي وقفت ضد سياسة الدولة العثمانية لذلك مارست الدولة العثمانية ضدها الظلم والعدوان والتشريد في كردستان.

حيث نفت أبناء هذه العشيرة إلى طرابلس الغرب بليبيا وإلى أماكن أخرى ضمن حدود الدولة العثمانية . كل ذلك من أجل وضع حد لنشاطات أبنائها وفي الوثيقة الآتية يظهر لنا مدى سخط الدولة ضدهم وتفريق أبناء العشيرة إلى مدن متعددة في آن واحد لكي لا يتحدوا. وفيما يأتي نص الوثيقة:

الباب العالي

المجلس المخصوص

في ضوء البرقية التي رفعها الياور الأكرم ومأمور الإصلاحات المشير إسماعيل حقي والتي وضح فيها أنه كان تم إسكان الهماونديين بواقع ٤٦ أسرة في الموصل و ٣٢ أسرة في ماردين و٤٦ أسرة في هكاري ثم صدر الأمر السلطاني بإسكان هؤلاء مرة أخرى في ولاية الأناضول بسبب مشاكلهم مع الأهالي واقترابهم من الحدود ولغرض توفير التربية لأولادهم من تخصيص مدارس لهم ولغرض إسكانهم بصورة صحيحة فقد تم توزيعهم بالشكل الآتي:

إسكان (١٠٠) أسرة منهم في سيواس و٣٢ أسرة منهم في قونية و ٥٠ أسرة منهم في أضنه وسوق ٥٠ أسرة منهم في ولاية أنقرة . لذا تبلغ الدوائر بهذا الأمر وتقديم الإجراءات المطلوبة في هذا الشأن.

١٢ ذي الحجة ١٢٠٤هـ ١٨٨٧م

التواقيع

| | | |
|---|---|---|
| الصدر الأعظم<br>محمد كامل بن صالح | شيخ الإسلام<br>أحمد أسعد أفندي | رئيس شورى الدولة<br>عارف باشا |
| ناظر الخارجية<br>محمد سعيد | ناظر العدلية<br>أحمد جودت | ناظر المالية<br>محمد زهدي |
| ناظر الأوقاف<br>مصطفى | ناظر التجارة<br>مصطفى زهدي باشا | ناظر المعارف<br>منيف |
| | | مستشار الصدارة<br>العظمى |

ناظر - وزير

# پاشکۆی ژمارە (١)

مەسەلەی (موشیری حەمەی سلێمان) بەهۆی گەورەکردنی لەلایەن خزم و کەسی شێخ مەحمودەوە ببووە هۆکارێکی زەق و گەورە لە تێکشکانی شێخ مەحمود و هۆزە هاوپەیمانەکانی لە شەڕی دەربەندی بازیان، کە دیارە هۆی تێکشکانی کورد لەو شەڕەدا پەیوەندی بە کۆمەڵە هۆکارێکی بنەڕەتی و ڕوون و ئاشکراوە هەیە ئەگەر بەووردی و واقیعیانە دیراسەی هۆکارەکانی کەوتنی شۆڕشی شێخ مەحمود بکەین لەو شەڕە کەزیاتر دەگەڕێتەوە بۆ نابەرامبەری لە ژمارەی چەکدار و چەک و تەقەمەنی و شارەزایی و بەکارهێنانی زانستی نوێ لەشەڕ لەلایەن ئینگلیزەکان و کەمی هێزو کەمی تەقەمەنی و خەرابی و سەرەتایی چەکی کورد هۆی ئەساسی بوو لەو بەرئەنجامە جەرگ بڕە.

هەموو مێژوو نووسە کوردەکانیش کە دێنە سەر بەرئەنجامی شەڕی دەربەندی بازیان ئەوە دووبارە دەکەنەوە کە (موشیر ئاغا) لەڕێگەی پشت شاخەکانەوە ڕێ نیشاندەری ئینگلیزەکان بووە بۆ سەر شێخ مەحمود و ئەگەر ئەو نەبوایە وابەئاسانی ئەو دەربەندە لەگرتن نەدەهات.

جاری ئەو هێزەی شێخ مەحمود کە ژمارەیان (٤٠٠) کەس تێ نەدەپەڕی ئەویش هەر وەکو د. کەمال مەزهەر دەڵێ زۆربەیان لەو هێزە بوون کە لەگەڵ مەحمود خانی دزلی هاتبوون و ناوچەکە شارەزا نەبوون چەکی هێزەکەی شێخ مەحمود لە برنەو ماوزەرو چەقۆو خەنجەر تێنەدەپەڕی لەگەڵ تورەکەیەک نانە ووشکە. لەبەرامبەر ئەوەدا هێزەکەی دوژمن بەسەرکردایەتی جەنراڵ فریزەر کەتایبەت کۆکرابوونەوە بۆ سەرکوت کردنی شۆڕشی کوردستانی باشور پێکهاتبوو لە دوو لیوای پیادەو سوارەی سیخ و گورگە و ئەفغان و لەگەڵ تەقەمەنی زۆرو زەبەندو چەکی قورس و تۆپخانەو بەشی موخابەراتی و بێ تەل و بەشی مەساح.

هەروەکو د. فوئاد حەمە خورشید دەڵێ (هێزی پەلاماردەر ژەنەراڵ فریزەر

ئەوسادەیە نەبوو تاکو پەنابەرێتە بەر هاولاتیەکی ئەو ناوچەیە بۆ پەیداکردنی چەند پیادە رێیەک بۆ هێزی زەبەلاحی).

د. کەمال مەزهەر لەوبارەیەوە دەڵێ (حاڵی حازر هەموو بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئینگلیز وا لەبەردەستدا بەندە ژمارەی زۆری ئەو فایلانەم دیووە کە پەیوەندییان بە شێخ مەحمودەوە هەیە بەڵگەنامەکان ناوی هەموو شتێکیان نوسیووە بەناو شوێن و ئان و سەعاتەوە تیا تۆمار کردووە. هەروەها دەڵێ جا لەو سەدان بەڵگەنامەی ئەو رۆژگارە کە من دیومن ناوی موشیری حەسەی سلێمان بەخراپی نەهاتووە). بەپێچەوانەوە موشیر ئاغا رۆڵی گرنگی بینووە لە رزگارکردنی شێخ مەحمود ویەکەم کەس بووە لەناو بریندار و شەهیدەکان شێخ مەحمودی ناسیووەتەوە بە برینداری و نەیهێشتووە سیخ و ئەنغان بەکسەر بیکوژن و بەسەلامەتی تەسلیمی کردووە.

راستە کاتێ خۆی موشیر ئاغا لەسەر رێزنەگرتنی شێخ مەحمود لە ئەو دڵی لە شێخ دەرەنجێ و لێی تورە دەبێت و دەداتە پاڵ ئینگلیزەکان و پاکانە لەوە ناکرێت کە موشیر ئاغا لەو هەڵویستەی هەڵەبووە بەلام هەر هەڵەو تاوانێک بەقەد قەبارەو ئەندازەی خۆی بنوسرێتەوە. بۆچی کورت هەڵهێنانی هێزی کورد لەچەند سەد کەسێک و خڕکردنەوەیان لەو دەربەندە بۆ شەڕێکی نابەرامبەری بەرەیی کە شەوێک زیاتر خۆی نەگرت بخەینە پاڵ موشیر ئاغا لەکاتێکدا ئەو زنجیرە شاخەی دەوری دەربەندەکەی داوە هێندە بەرزنیە لەهەموو لاوە سوارەو پیادە دەتوانن سەریکەون و هیچ رێگەیەکی ئەوەندە نهێنی نیە ئەگەر رێ نیشاندەر نەبێت کەس پێ نەزانێ ئەمە لەکاتێکدا کە ئینگلیزەکان نەک لەدوای هاتنی هێزو حاکم و دەسەلاتیان بۆ کوردستان بەڵکو بەر لەو مێژووە دیراسەی جوگرافیای کوردستانیان بەووردی کردبوو هەر (مێجەر سۆن) حاکمی سیاسی ئینگلیز لە سلێمانی بەر لە هاتنی سوپای ئینگلیز بۆ ناوچەکە دووجاران بەناوی بازرگانی و بەناوی خوازراوە بەو رێگەدا هاتبوو لەسلێمانی و هەڵەبجە مابۆوە.

رەفیق حلمی کە خۆی ئاگاداری رووداوەکانەو لەنزیکەوە لەگەڵ

ڕووداوەکانی ئەو کاتە ژیاوە بەراشکاوی لە یاداشتەکەیدا ئاماژە بەو هەڵەیەی شێخ مەحمود دەکات کە ئەگەر بهاتایە ئەو شەڕە نابەرامبەرەی نەکردایەو بەشەڕی پارتیزانی و هێزەکەی دابەش بکردایە بۆ هەریەک لە ناوچە عەشایەرییەکان ئەو شۆڕشە کە هەموو کوردستانی باشوری دەگرتەوە هەروەها ئەحمەد خواجەش لە بیرەوەرییەکانیدا بەزەقی باسی بێ سەرو بەری ئەو لیژنەیە دەکات کە بۆ ئامادەکردنی خواردن و تفاق ئامادەکرابوو کە چۆن ساردوسڕو ووڕەی هێزەکەی شێخ مەحموود گیانی ئامادەیییان بەتەواوی هێنابووە خوارێ.

لەکۆتاییدا دەڵێم چەند هۆکارێکی واقیعی و بنەڕەتی ببووە هۆی شکستی هێزی کوردان لەبەرام بەر ئینگلیز لەشەڕی دەربەندی بازیان و ڕۆڵی موشیر ئاغا هێندە لاوەکییە شایانی باس کردن نیەو ئەوەندە زەق کردنەوەو بەوگەورە گرتنەش زیاتر ناحەزانی هەمەوەند دروستیان کرد، چونکە بەنەزەری ئەوان شێخ مەحمود و هێزو سوپاکەی لەشکان نایەت ئەمەیان کردە بیانووی هەڵە سەربازییەکەیان لەجەنگدا و موشیر ئاغایان بەوناستە تاوانبار کرد.

بۆ زیاتر روون کردنەوە لەسەر ئەو بابەتە بڕوانە:

١- د. کەمال مەزهەر، ویژدان و مێژوو.. یا دادگەی موشیری حەمەی سلێمان گۆڤاری ڕەنگین. ژ (١٠٢) ساڵی١٩٩٧.

٢- د. فوئاد حەمە خورشید جوگرافیای سەربازی و موشیری حەمەی سلێمان. گۆڤاری رەنگین. ژ( ١٠٧) ساڵی ١٩٩٧.

٣- ئازاد هەمەوەندی: بۆ جاری سێهەم موشیری حەمەی سلێمان، گۆڤاری ڕەنگین ژ (١٠٩) ساڵی ١٩٩٨.

٤- ڕەفیق حلمی( یاداشت) بەرگی یەکەم، ل١٣٨-١٣٩.

٥- ئەحمەد خواجە ( چیم دی) بەرگی یەکەم.

٦- لواء رکن محمد النقشبندي/ دیسانەوە دەربارەی موشیری حەمەی سلێمان رەنگین. ژمارە ١٠٥ ساڵی ١٩٩٧.


«رەگی بنەچەیی هەمەوەند»
خوادی
رەشید (تیرەی رەشەوەند)
یادگار (بەگزادە)
سەفەر (تیری سەفەرەوەند)
رەمەزان (تیرەی رەمەوەند)
جوامێری یەکەم
وسو
خالە
کوێخا رەسوڵ
چەڵەوی
حەمە
شەریف
ئەحمەد
جوامێر خان
(کە لە ئێران بە دەستی قاجاریەکان شەهید کرا) ١٨٨٦ز
فەتاح بەگ
ئەحمەد ئاغا
عەزیز ئاغا
مەحمود ئاغا
فەقێ قادر
مەلا محمد کوێر
مام سلێمان
رەحیم
کەریم بەگ
حمدأمین ئاغا
حمە ئاغا
سابیر بەگ
عبداللە بەگ
عزیز بەگ
ئەحمد بەگ
وەهاب بەگ
غفور ئاغا
مشیر ئاغا
سلێمان ئاغا
ئەنور ئاغا
سابیر ئاغا
تاهیر ئاغا

# سەرچاوە کوردییەکان

١- د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لەمێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، بەغداد ١٩٨٥.

٢- محەمەد ڕەسوڵ هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم لەندەن ١٩٩١.

٣- ڕەفیق حلمی، یاداشت بەرگەکانی یەکەم و دووەم، ڕۆشنبیری و لاوانی کوردستانی عێراق شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، سلێمانی ١٩٨٨.

٤- ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم، ساڵی ١٩٦٨.

٥- ڕەمزی قەزاز، بزوتنەوەی سیاسی و ڕۆشنبیری کورد، چاپخانەی ژین، سلێمانی ساڵی ١٩٧١.

٦- جەلال تەقی، یاداشتەکانی ئەحمەد تەقی لاپەڕەیەک لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، چاپخانەی (سلمان الاعظمی)، بەغداد ١٩٧٠.

٧- یاداشتەکانی شێخ لەتیف حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمود کەمال نوری مەعروف ساغی کردۆتەوە چاپی یەکەم، هەولێر ١٩٩٥.

٨- مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، دار الحریە للطباعە، ساڵی١٩٨٦.

٩- د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، زمانی ئەدەبی و یەکگرتووی کوردی، چاپخانەی (سلمان الاعظمی)، بەغداد ١٩٧١.

١٠- ئەکرەمی محموودی ساڵحی ڕەشە، شاری سلێمانی، بەرگی دووەم، ساڵی ١٩٨٩.

١١- کاکەی فەلاح، پەندەکانی پیرەمێرد، سلێمانی، چاپخانەی کاکەی فەلاح، بەرگی یەکەم چاپی دووەم.

١٢- پیرەمێرد، دوانزە سوارەی مەریوان، داستانێکی مێژوویی کوردە لەکتێبخانەی نیشتمانیدا لە بەغدا، ژمارە (٤٠٨)ی ساڵی ١٩٨٣ی دراوەتێ، چاپخانەی کاکەی فەلاح سلێمانی شەقامی پیرەمێرد.
١٣- لەتیف بەرزنجی، شێخ مەحمود لە شیعری کوردیدا، هەولێر ١٩٩٠.
١٤- حسێن جاف، هۆزەکانی کورد، بەرگی دووەم، بەغداد ١٩٩٢.
١٥- مەلا عبدالکریم مدریس، کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند، چاپخانەی کۆڕی زانیاری، بەغداد ١٩٨٠.
١٦- عومەر شێخەڵا دەشتەکی، داستانی گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی سەلاحەدین- هەولێر ١٩٧٨.
١٧- شەعبان ڕەمزی، ستران بێژ کاوێز ئاغا، مطبعە اسعد- بغداد ١٩٨٨.
١٨- علاء الدین سجادی، شۆڕشەکانی کورد، بەغداد، چاپخانەی معاریف ساڵی ١٩٥٩.
١٩- ڕەفیق حلمی، یاداشت کوردستانی عێراق شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، بەشی سێیەم، دار الحریە للطباعە- بغداد ١٩٩٢م.
٢٠- د. کەمال مەزهەر، کوردستان لەکاتی شەڕی یەکەمی جیهانی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد ١٩٧٥.
٢١-عەلائەددین سوجادی مێژووی ئەدەبی کوردی بەغداد ١٩٥٢.
٢٢- سەروەر ئەحمەد کەریم چەند لاپەڕەیەکی شاراوە لەمێژووی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند ساڵی ١٩٩٨.
٢٣- حەبیب عەلی میرانی لە یادی شەهیدان و ئەدیبانی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٣دا لە نەجەف لە چاپ دراوە.
٢٤- م.س لازیف کێشەی کورد ١٨٩٦ - ١٩١٧ بەشی یەکەم.
٢٥- عبدالرقیب یوسف بانکەوازێک بۆ ڕووناک بیرانی کورد، ساڵی ١٩٨٥ لە سلێمانی لە چاپخانەی کامەران لە چاپ دراوە.

# سەرچاوە عەرەبیەکان


١- محمد امين زكي بك ، تاريخ السليمانية نقله الى اللغة العربية الملا جميل الملا احمد الروژبياني ، طبع شركة النشر والطباعة العراقية المحدودة ، سنة ١٩٥١ .

٢- عباس العزاوي ، تاريخ العراق بين الاحتلالين ، جزء (٧) ، (٨) ، بغداد ١٩٥٦ .

٣- د . حامد محمود عيسى علي ، المشكلة الكردية في شرق الاوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١ ، جامعة قناة السويس ، مكتبة مدبولي ١٩٩٢ .

٤- عبدالمجيد فهمي حسن ، مشاهير الوية العراقية ، الجزء الثاني ، لواء كركوك ، بغداد ، مطبعة دجلة ١٩٤٧ .

٥- جلال الطالباني ، كردستان والحركة القومية الكردية ، طبعة الثانية ، بيروت ١٩٧١ .

٦- فؤاد جميل ، سنتان في كردستان ، جزء الاول ، مطبعة الزهراء بغداد ، سنة ١٩٧٣ .

٧- د . وليد حمدي ، الكرد والكردستان في وثائق البريطاني ، لندن ١٩٩١ .

٨- وريا جاف ، كركوك ، طبع وزارة الثافة ، اربيل ١٩٩٧ .

٩- توفيق وهبي ، سفرة من دربند بازيان الى ملة تاسلوجة ، مطبعة المعاريف بغداد ١٩٦٥م .

١٠- عبدالمنعم غلامي ، ثورتنا في شمال العراق سنة ١٩١٩-١٩٢٠م ، مطبعة شفيق بغداد ، جزء الاول ، سنة ١٩٦٦ .

١١- د . عبدالله محمد علي ، كردستان في عهد الدولة العثمانية من منتصف القرن التاسع عشر الي بدء الحرب العالمية الاولى الرسالة غير منشورة .

١٢- لونكريك ، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث ، ت/ جعفر خياط ، بغداد ١٩٥٨ .

١٣- م .س .لازيف ، المسألة الكردية ، ت/ د . كاويس قفتان ، مطبعة الجاحظ ١٩٨٩ .

١٤- ادموندز ، كورد ، ترك ، عرب ، مطبعة التايمس ، بغداد ١٩٧١ .

١٥- د . فؤاد حمه خورشيد ، عشائر كردية الجنوبية ، مطبعة الحوادث ، بغداد ١٩٧٩ .

١٦- باسيل نيكتين ، الاكراد ، ت/ مطبعة دار الروائع ، لبنان ١٩٦٧ .

١٧- ميجرسون ، رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان ، ترجمة فؤاد جميل ، جزء الاول ، مطبعة الجمهورية ، بغداد سنة , ١٩٧٠
١٨- علي سيدو كَوْراني من عمان الى عمادية جولة في كوردستان الجنوبية سنة ١٩٣٩ مصر .

